٢٠٢٣



# خاپەرۆکی یادەوەرییەکان

حازم عەلی کوتک

یادداشت و بیرەوەری

ناوی کتێب: خاپەرۆکی یادەوەرییەکان
نووسەر: حازم عەلی کوتک
بابەت: یاداشت و یادەوەری
تایپ: هەندرێن شێخ ڕاغب
پێداچوونەوەو ڕێکخستن: ئارارات ئەحمەد
قەبارە: ١٤-٢١
چاپخانە: چوارچرا
چاپی یەکەم: ساڵی ٢٠٢٣
نۆبەتی چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی(؟) ساڵی (٢٠٢٣) پێدراوە.

# نێوەرۆک

## پێشەکەشە بە دایکم...

ئەو ژنەی، تا ئەو کاتەی سەری نایەوە، ئاواتەخواز بوو هەموو کچ و کوڕەکانی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. بەڵام بەداخەوە، گۆڕیشمان لە تەک یەکترییەوە نەبوو!

## سپاس و پێزانینم بۆ...

هەموو ئەو دۆستانەی کە بە هەرشێوەیەک لە شێوەکان دەستباریان لەگەڵ گرتووم لە تەواوکردنی ئەم کتێبەم، چ لە ڕووی پێدانی زانیاری، چ ئەگەر بە تایپکردنی پەرەگرافێک ماندووم کردبن، وەک: هەندرێن شێخ ڕاغب، دانا جەمال، بەکر ئاڵەیی، ئارام عەلی. هەروەها ئارارات ئەحمەد کە پێداچوونەوە و ڕێکخستنی بۆ کتێبەکە کرد.

## ڕوونكردنەوەیەكی پێویست

خاپەرۆك، پاشەرۆك و پاشەبەرە... هەموو ئەو ناوانە، دەكرێ بەكاربێنین بۆ باقیماندە، یان پاشماوەی بەرهەمێكی ساغكراوەی دانەوێڵەی وەك: گەنم، جۆ، برینج، قەزوان، ترش... بۆیە منیش هاتووم ئەو یادەوەریانەی وەك خاپەرۆك لە دوای چاپ و بڵاوكردنەوەی كتێبی (٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا- ٢٠٢٠) لێم بەجێمابوون، كۆیان بكەمەوە و بە جۆرێك مێشكی خۆم بگووشم و ئەو ڕووداوانەی لە زەینمدا تۆمارن، بیانچۆڕێنمە سەر دووتوێی ئەو كتێبەی لەبەردستت دایە و چۆڕەبڕیان بكەم.

لە دوای ئەوەی دەستم لە بنی جێخونێ گێڕا و ئەسكوێم لە بنی مەنجەڵی زەینم وەردا، هەر ئەوەندەم لێ هەڵكڕاند و ئەو خاپەرۆكەم بە دەستەوە هات، كە بە چاكم زانی ئەویش وەك كتێبی یەكەمم (٥٧ ساڵ)ەكە، مەجلیسی ئازیزانم ڕۆشن بكاتەوە.

لە كۆكردنەوەی ئەو خاپەرۆكەدا، هەوڵمداوە ئەوەی شیاو و لەبار بێ، نەیبوێرم و بیهێنمە حوزووری ئێوە، جگە لە چەند ڕاز و نهێنییەكی زۆر گرنگ و هەستیار، كە تا كو ئێستا بەرگوێی هیچكەس نەكەوتوون، لە سینەمدا قوفڵ دراون، نووكی قەڵەم لێفەی هەتیوداپۆشیی لەسەر هەڵنەداونەتەوە، ناچارم بۆ هەتایە بە سەرمۆری بیانهێڵمەوە و لەگەڵ خۆم بیانبەمە ژێر گڵ و دەستی كەسیان نەگاتێ، چونكە، هیچ سوودێك بە تۆی خوێنەر و هیچكەسێكی دیكە و، بەرژەوەندیی گشتی ناگەیەنێ.

وە مەبەستیشم لە یاداشتكردنی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانە، ئەوە

نییە چیلکە لە مێژوویەکی شەرمەزار و شەرمئاوەرەوە وەربدەم، یان دەرخۆنە لەسەر ئەو زێرابە هێڵنجهێنە هەڵبدەمەوە، کە ڕووی هیچ مەجلیسێکی نییە، بەڵکو ئامانجم لە نوسینیان ئەوەیە دەمەوێ مێژوویەک ترۆ بکەم کە لەسەر درۆ و ناپاکی بنیادنراوە.

بە پێچەوانەی ئەوانەی کە لەپێناوی سەبەتەی نانی چاوشۆڕی، نووسینەکانیان کردۆتە سەرچاوەی بژێوی و خۆشگوزەرانی خۆیان و نانێکی پیس دەرخواردی منداڵەکانیان دەدەن! بۆ بەرژەوەندی دەسەلاتداران، مێژووی ڕووداوەکان بەراوەژوو دەکەنەوەو ئارایشتێکی ساختەکارانەیان دەکەن.

خوێنەری زرنگ و پیتۆڵی کورد! تۆیش ئازادیت کە چۆنم لێوەردەگریت!

***حازم عەلی کوتک***

***ڕانیە- شوباتی ٢٠٢٣***

## پێشەكی

خاپەرۆكی ڕووداو و یادەوەرییە بەجێماوەكان، لەمێژساڵە ختووكەی ڕووحم دەدەن، بۆ ئەوەی چیدیكە لێرەو لەوێ بەپرشوبڵاوی نەكەون، هەڵیانگرمەوەو دە خورجێنێك، كەشكۆڵێكیان ئاخنم.

هەتاوەكو ڕۆژگار كۆنتر دەبێت، ئەو خاپەرۆكە بێنازانە پرسیارگەلێكی نوێ لە هزرمدا دەڕوێنن. ئاخر، یادەوەریی مرۆڤەكان هەرگیز كۆن نابن و كاڵ نابنەوە! ئەو خاپەرۆكانەش، ساڵەهای ساڵە لە پەرێزی زەینمدا كەوتوون و چاوەڕێمن هەڵیانگرمەوە. ئەو گوڵەگەنمە بەجێماوانە، لە پیریدا جوانتر دەبینم، ڕێك بە چەشنی شەراب، هەتاوەكو كۆنتر دەبن، بەهادارتر دەبن لەلام.

خاپەرۆكی یادەوەرییە نابالق و بەمرادنەگەیووەكان، لە مەزرای خەون و خولیاو هەستی خاوێنی منداڵانەمەوە فرچكیان گرتووەو، كامڵبووەكان، لەوانەن بەجۆرێك وەكو زەروو بەدیواری زەینمەوە نوساون لێم بوونەتە قیری كەوای سپیو تەوقی عەزازیل[1]، وەكو كابووس بە كۆڵی خەیاڵمەوە نایەنە خوار و لە یەخەم نابنەوە، بۆیە پەنام بردەبەر نوسینەوەیان، بۆ ئەوەی لە ئەستۆی خۆمیان داڕنم و بە ئەستۆی مێژوویەكی شەرمەزاریانەوە هەڵبواسم.

ئەوانەی زەمەنی بەرائەتو منداڵی، وەك دانەی مرواریو یاقووتو كریستاڵی ڕەونەقدار، هەمیشە دەدرەوشێنەوە، ڕووناكی دەدەنە سەر سەدەفی دڵ و، وەك مەرهەمێك ئارامی دەبەخشنە سەر زامەكانی

---

١- عەزازیل: یەك لە ناوەكانی شەیتان.

ئەو ژیانە پێچاوپێچو ئاڵۆزو شێواوەم. هەندێکیشیان وەک گرفە و نێڵی ئاگرو برووسکەی ژانێک، بەنێو دەمارەکانی مرۆڤدا ڕۆدەچن، جەزرەبەی ڕۆحم دەدەن. بۆ ئەو یادە تفتو تاڵانە، زۆرجار خۆزگەم دەخواست وەکو لاوکی (مازی[1] چنیێ)ی (برایم حسن بامەڕنی[2]) تورەگەکەم بنی کون بوایەو یادە تاڵەکان وەک مازییەکان، یەک یەکو دوو دوو و سێ سێ لە تورەگەی یادەوەریم کەوتبونایە خوارێ.

بەقەدەر برشتی زەینی خۆمو بارتەقای تێڕوانینەکانم بۆ ڕووداوەکان بەو توانستە کەمەی لە ڕووی ئەدەبییەوە هەمە، هەوڵ دەدەم هەموو شیانی خۆم بخەمەکار بۆ ئەوەی شتێکتان بۆ بنووسم، شایانی تێڕامانو لێوردبوونەوەی تیژبینی چاوی بەڕێزتان بێت. ئامانجیش لە نووسینەوە و خوێندنەوەی مێژوو، قورتاربوونە لە چەنگی ڕابردوو، ئەو میراتەی باب و باپیران بۆیان جێهێشتوین، میراتێکی بکوژە، دەبێ خۆمان ڕاپسکێنین بۆ دەرچوون لەو زمهەریرەی تێیکەوتوین.

مرۆڤی برنجیو گەلێکی زیندوو ئەوەیە لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتنی شارستانیەتی مۆدێرن لە دنیا دانەماڵێو نەبێتە پێخوست.

---

١- مازی: مازوو.

٢- لاوکی مازی چنێی برایم حەسەنی بامەڕنی: لاوکێکە باس لە خۆشەویستیی کچیکی مازووچن و خۆشەویستەکەی دەکات، کە بە هۆی گەمە و دەستبازی، هۆشی لە مازووچنین نەماوە و نەیتوانیووە وەک مازووچنەکانی دیکە، مازوو بچنێ و کۆبکاتەوە. وەختێک دەبینێ ئێوارە داهاتووە و هیچ مازووی نەچنیووە، نازانێ چبکات، بۆیە پەنا دەباتە بەر درۆکردن و لە ماڵێ دەڵێ: بنی توورەکەکەم کون بووە و هەرچی مازووی چنیوومە، یەک یەک و دوو دوو لێم کەوتوون. برایم حەسەن، لاوکبێژێکی سنووری بادینان بووە، لە ساڵانی حەفتاکان گوێگر و هەواداری زۆر بووە و ئەو لاوکەی ئەوکاتە گوتووە.

هیوادارم خوێنەری بیندرێژو بە سەلیقەو وردەکار، لۆژیکیانە ڕاڤەی بابەتەکان بکاتو بیداتە بەر تیشکو نەشتەری هەڵسەنگاندنو ڕەخنەی بابەتیانە.

گرنگ نیە مرۆڤ لەژێر کاریگەریی چ هزرو میتۆدێکی فکریدایە، بەڵکو ئەوەی پێویستە لە ماک و بنچینەدا ڕەگەزو پێوەری مەرجەکانی هەڵسەنگاندنێکی مونسیفانەو نرخاندنێکی بەبڕشت لەو کاتەدا بێت کە ویژدانو مروەت لە دەریایەکی ئارام و ئاسوودەی دەروونیدا، لەنگەری گرتبێت، نەوەک خوانەخواستە مرۆڤ کەوتبێتە ژێر هەژموونی مجێزی تاکلایەنانەی خۆیو بەس.

گیانی من خوێنەری خۆشەویستم!

کاتێک بەنێو دەشت و دۆڵ و هەوراز و نشێو و تولەڕێکانی ئەم کتێبەدا ڕێدەکەی، لەسەر ڕێی خۆت هەندێک وشەو دەستەواژە و ئیدیۆمی وات دێنەڕێ، ڕەنگە یەکەمجار بێت چاوت تێیانهەڵەنگوتبێ یان گوێبیستی بووبیت، ڕاستی، نەمویستووە زاراوەی ناوچەیەکی دیاریکراو بەسەر ناوچەکانی دیکەدا زاڵ بکەمو بیسەپێنم، مەبەست لە نوسینیان تەنیا ڕزگارکردنیانە لە دەستی فەرامۆشکردنو فەوتانی یەکجارەکی. پێشم وانییە بە نوسینی چەند پەرەگرافێک شق القمرم[1] کردووە! لێ ئەگەر توانیبێتم چەند وشەیەکی ڕەسەنی کەونارای کوردیم لە ئاویلکەو ئاوزینگان[2] ڕزگارکردبێتو گیانم بەبەرداکردبنەوە، ئەوا خوناوو ئاونگی ئاسودەیی و ئارامی دەڕژێنێتە

---

١- شق القمر: شەققو لقەمەر، لەتکردنی مانگ. گوایا پێغەمبەری ئیسلام بە پەنجەی، مانگی شەق (لەت) کردووە.

٢- ئاویلکە و ئاوزینگ: کاتی گیاندان، سەرەمەرگ.

سەر مێرخوزاری[1] ویژدانم.

هیوادارم کتێبی (خاپەرۆکی یادەوەرییەکان)، ڕووی نێو کتێبخانەی کوردی هەبێت و لایەقی ئەوە بێت خشتێکی ئەو دیوارە بێت و بۆشاییەکی لێ پڕ بکاتەوە.

**حازم عەلی کوتک**

**ڕانیە- شوباتی ٢٠٢٣**

١- مێرخوزار: مێرغوزار، مێرگوزار، مێرگی بە گیا و سەوزایی و کانی و ئاو.

## فوغان بۆ مەینەتیەکان

خـــوێنەری قەدرگــران، ســـوپاس کە کــاتی گرانبەهـــای خــۆت بە خوێنـــدنەوەو بە چنیـــنەوەی ئەم خـــاپەرۆکە دەبەخشـــیت! یەک لە پایەکانی وشیاریی هەرمرۆڤێک خوێندنەوەیە، منیش بەڵێنت پێدەدەم هەمــوو شــیانم بــخەمە کــار، بەدەســتێکی بەدەســتنوێژ و قەڵەمێکــی بســـمیلکراو، هۆکارەکـــانی ئەتککردنـــی نیشـــتمانێک بنووســـمەوە گوڵەگەنمەکان هەڵبگرمەوە، شـەن و کەوکردنی کۆی ڕووداوەکانیش، بۆ بەڕێزتان بەجێدێڵم.

نوسینی ئەم ڕووپەڕانە، ئاوڕدانەوەیەکی ئەمەکدارانەیە لە کولتوری گەلەکەمــانو گێــڕانەوەی مێــژووی لێوانلێــو لە کارەســاتو کەوتــنو هەستانەوەیە. هەروەهـا ژیانی سـادەو پاکژی ڕابردوومـان، کۆڵەگەی بەزینـــدوومانەوەی ناســـنامەی هەرگەلێـــک، زمـــانو کولتـــوور و چانــدەکەیەتی. بــۆیە ئەرکــی سەرشــانی هەموومــانە وەک بیلبــیلەی چاومان پارێزگاری لێبکەین. بەش بەحاڵی خۆم، هەموو هەوڵو بڕستی خۆم بخەمە کار، ئەوەی لە ژیانم دیوومەو گوێبیستی بووم، هیچی لێ وەپــاش نەدەم، لەکاتێکــدا هەمــوو تەمەنــم بــۆ نوســینەوەیان زۆر بەتاســەو ئــارەزوو بــووم، بــۆیە بەڵێنتــان پێــدەدەم کە کــۆڵ نەدەم تــا ڕەوسەتان[1] بۆ سوور دەکەم، چەندەم تاقەت پێیدا بشکێ، ڕستەکان زێڕەوشان[2] دەکەم.

داخەکەم بــۆ مــن درەنــگ بــوو، دوێنــێ دەســتیان لە ڕاوەدونــانم هەڵگــرت! چــی بــکەم هەر ئەوەنــدەم لەدەســت دێ و هەر ئەوەنــدەش پێیــڕادەگەم، کــات زۆر بەخێرایــی دەڕواو چەنــد دەکەم فریــا نــاکەوم

---

١- ڕەوسە: خەرمانی پاککراو. کاتێک کا و گەنم لێک جیا دەرێتەوە، گەنمەکە پێیدەگوترێ ڕەوسە.
٢- زێڕەوشان: زێرکفت، زێراو، ئاوزێر، کیف زێڕ.

کەلافەی ڕیسی مافوری ٦٦ ساڵەی تەمەنم هەڵبوێژنم بێئەوەی داوێکی ڕایەڵەکەی بقرتێنم بەکوترە کوتر لەسەر تاقچکەی یادەوەریەکانی، وەکو ئەرشیف بۆ بەڕێزتان دانێم.

من دەمێکە یادەوەری ئەو ڕوداوانەم لەکوڵی خەیاڵم بۆ شەتەک داون، ڕۆژ نەبووە بۆ بێخاوەنی ئەو چیرۆکە کەونارانە لەبەرخۆم نەکورکێمەوە[1]، لەلای من هێندە پیرۆزن بۆیە دەمەوێ لەسەر باڵی پەریان پارێزگارییان لێبکەم! هەموو نیاز و مەبەستێکیشم لەو گێڕانەوانە ئەوەیە گەر بتوانم، ژیانی شیرینی گوندی بەوێنەی شیلەی هەنگوینو گەزۆتان دەرخوارد بدەم. چاک دەزانم دۆلابو چەرخی گەردوونیش لەدوای ئێمە هەر هاڕەی دێ وەک شەپۆلی ڕووبارەکان دهەرکی[2] و هەدا ناداو داناسەکنێ.

وەرزەکان بێ پسانەوە دێن، هەورەکان خۆیان هەڵدەکوتن بەپەلە و بەهەرەداوان هەڵدەکشێن بەرەو کوێستان، قازو قورینگ و مراوی شۆڕدەبنەوە بەرەو ئاقاری گەرمەسێر، لەدوای ئێمە هیچ کارێک پەکی ناکەوێ، گەردوون هەروەک باڵتەی جەنجەڕ[3] دەمانهاڕێو جێماندێڵێ. کەممان هەیە سەر دەربێنا لەو چەرخو خولو گەمەیە، هۆکارەکەی ئەقڵی کورتی بە پارسەنگی خۆ بە زۆرزانی ئێمەیە، پێموایە مرۆڤ سەرسەختترین بوونەوەری سەرزەوییە کە دەتوانێت بەرگەی ئەو هەموو تێکئاڵقانو تەوژمە فکریانە بگرێت وەکو تەونی جاڵجاڵۆکە خۆی لە هزرو بیرکردنەوەمان دەهاڵێنێ! بۆیە دەبێت خۆمان ڕزگار بکەین لە هزری کڵۆمکراوی ئایدۆلۆژیای بەرتەسک و، لێی

---

١- نەکورکێمەوە (کورکانەوە): گریانی لەبەرەخۆ. گریانی بێدەنگ.

٢- دهەرکی: ڕەوان. جاری. ڕۆیشتن بێ وەستان.

٣- باڵتەی جەنجەڕ: ئەو تەورانەن کە بە جەنجەڕەوە بەستراون و قرشەی گەنم و جۆ لەسەر جۆخین ورد دەکەن.

دووربکەوینەوە کە خۆی لە ڕۆحو هزرو هەڵسوکەوتمان ئاڵاندووە ناهێڵێ لە دەرەوەی خۆمان کەسی دیکە ببینین! هەروەها ئەقڵیەتی چەقبەستوو دۆگمای خێڵەکیش تێپەڕێنین، مرۆڤ دەبێت سەرنجی لەسەر ئامانجە پیرۆزەکانی خۆی وەکو یاری یوگا دانەکەلێ و سەرچیغ نەچێ.

زۆرجار وابووە، لە جەنگەی ئازاردانێکدا کە لە زەمانەی دەبینین، وا دەزانین هەر لە ئەزەلەوە نووسراوە، دەبێ ئێمە چونکە کوردین ئاوا بژین! بەزەییم بەو نەوەی دوای خۆمان دێتەوە، ئەو هەموو فەرزو سوننەتەی کە لەسەر ئێمە بوو بیکەین، بە کێ قەڵـلا دەکرێتەوە! بەرلەوەی ئەو ژیانە لەدار بکەمەوەو فەنابوونم هەڵوەرێتە نێو یادەوەریەکانی ئێوە، هەوڵدەدەم یادو هزری خۆم بگوشم هەتا دوادلۆپی بچۆڕێنمەوە سەر ئەو تابلۆیەی کە بڕیارە نیشانتان بدەم، پریسکەی تۆمارەکانی هزرم خاڵی بکەم.

بەنیازی ئەوەی مێژووی کولتوری کەونارای گەلەکەمان سوود بەنەوەی دواڕۆژ بگەیەنێ، هەوڵدەدەم بە دەمو ڕاوێژێکی خۆش بۆتانی بگێڕمەوە، من دڵنیام ئەزموونی پێشینان زاناییمان پێدەبەخشن بۆ خزمەتی ئایندە، هیوادارم بکەوێتە بەردیدی خوێنەرانو نوسەرانێک، لەو کەسانەی کورتان بۆ کێچ دروست دەکەن!

من دڵنیام لە ئایندە خوێندەواری لە ئێمە باخۆشتر دێنە مەیدان، بەوردی لەو کولتوور و چاند و ئەو مێژووەمان دەکۆڵنەوەو ژیرانە کەنەی لێدەکەن. خوێندەواری قەڵەمڕەنگین ڕووپەڕی کتێبانی پێ دەنەخشێنن، هونەرمەندان فیلمی بەچێژی لێ بەرهەم دێنن، ئەکادیمێستەکان شیتەڵێکی بەرپرسیارانە بۆ کۆی ڕووداوەکان و ئەگێنداو باکگراوندی پاڵنەری پشتی ڕووداوەکان، دەکەن.

ئەوە ئەرکـــی هەموومـــانە، هەوڵبـــدەین لەو مەنـــگەنەو فەلاقەی داگیرکەرانو دوژمنانی فەرهەنگو زمانی کوردی کە کۆمەڵگایان پێ چوارمێخە کردووە، خۆ ڕاپسکێننو ڕادەست نەبین، خاوەنداری لە پیرۆزیەکانی گەلەکەمان بکەین. من دەزانم لە نووسینەکانم زۆرم وشەو دەستەواژەی کەوناری گوندنشینان بەکارهێناوە، ڕۆچوومەتە نێو ژیانی بسمیلکراو و بەدەستنوێژی جوتیاران. لە ماک و بنچینەدا هۆکارەکەی ئەوە بێت خۆم لەنێو جەرگەی ژینگەیەکی جوتیاری چاوم هەڵێناوەو هەراش بووم. لێتان ناشارمەوە، ئێستاش کاتێک لەفکران ڕادەچم، لەگەڵ حیلەی ئەسپو حرمەی ماینو کۆرژنی جوانەئەسپ بە هۆش خۆم دێمەوە! قەت ناتوانم لە حزووری ئەو زەمەنە ئاڵتوونییەو بەڵێنی مرۆڤە مەزنەکان، هەمیشە بۆی لە ڕکووع نەبم! من دەزانم بەو چەند دێڕەی من دەینوسم، ناتوانم چیرۆکو پەندو بەسەرهاتی نزیکەی سەدەیەکی پڕ لە کێشمەکێشی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو نەتەوەییو جیۆپۆلەتیکی ناوچەیەکی دیاریکراوی نیشتمانم بنووسمەوە، هەوڵدەدەم بارتەقای ئەو شەرەخوێندەوارییە چەپرەکەی هەمە، بە نۆبەی خۆم، ئەو وشەو دەستەواژە ڕەسەنانەی پەراگەندەو ئاوگەلە[1] بوون، یان لەلایەن وشەو دەستەواژەی بیانییەوە جێگایان پێ لەق کراوە، وەک کوردگوتەنی ماڵ لە ماخۆی حەرام بێت، خەریکە پێخوست دەکرێن. دەبێ هەموومان چاوەو[2] ڕۆخەی[3] خەرمانی فەرهەنگی کوردی بدەینەوە. داخەکەم، بە گەنجی شانسی ئەوەم نەبوو کتێبێک بگرم

---

١- ئاوگەلە: بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە لە ڕان و مێگەلی خۆی دادەبڕێ و ڕەگەڵ مێگەلێکی دیکە دەکەوێ.

٢- چاوە: نیووی نێوەوەی خەرمان لە کاتی گێرەکردندا.

٣- ڕۆخە: نیووی دەرەوەی خەرمان لە کاتی گێرەکردندا.

بەدەستەوە یان دوو دێڕ نووسراو لە تێنوسێکدا بنووسم. بەهۆی ڕووداوی نالەبارو ڕێگای سەختی پڕ خەرەندی ناهەموار، ژیانم مەلەکردن ڕووبەڕووی نێلەی شەپۆلانو، چڕنووکگرتن لە هەلەموتە سەختەکانو، هەنگاوهەڵێنان بە پێچەوانەی زریانو وەیشوومەو تێکوەشانەوە بوو.

زۆرجار دیتم حەشاماتی بەستەزمان لەنێو لرفەی شەپۆلەکان دەیانڕوانیە برینی گەرمو لەدەستدانی ئازیزانیان، دەمدی ئاهو نزولەی پیرەژنو پیرەپیاوان بە چاوی پڕ لە ئەسرینی کەنەفتەوە چاو بە مۆلەق نەزەریان دەبڕییە ئاسمانێ، دەستی قەڵشیوو و لەرزۆکیان لەبەر خودای خۆیان پاندەکردەوە بۆ ئەوەی هەقیان بۆ بکات و ئەو ئازارو بارە گرانەیان لەسەر سووک بکات.

بە دوو چاوی خۆم دەمبینی دێوەزمەی زوڵمو ستەم، دوولینگانی لەسەر ئەستۆی بێنەوایان داهێناوە، لەوکاتەدا شەپۆلی بەرەنگاریو تۆڵەئەستاندن لە ناخماندا مەوجی دەدا، دەبوو بە بوورکانی گرپژێنی تووڕەییو ڕق! لەوەتای من بەبیرم دێ، لەژێر قورسایی بێدادی، دایم نرکەو ناڵەمانە! خوێناویان پێهەڵێناوین، بۆیە منیش وەکو فەرزێکی پێنج ئەرکان بەجێبێنم، هەر بۆ ئەوەی ئۆباڵم سووک بێت لەسەر شان و، هەر نەبێت ئەزعەفولئیمان، نەبمە پاڵپشتی ئەوانەی وەک گورگی کەپەنک بەشان، ناویان لەخۆیان ناوە شوان! ڕەنگە هەندێک کەس لەوانەی کە بە ئاقڵ دەیانناسم، لەڕاستیدا هیچ لە دەردی دڵ نازانن، تەوسو توانجم تێبگرن، کە من چۆن قسەی وا دەکەم لەگەڵ ئارەزوو و بەرژەوەندی کەسیی ئەوان یەکتر ناگرێو لەیەکتر هەڵدەبەزنەوە، چەندم پێخۆشە تێمبگەن کە من خۆمم، هەرگیز لە دەستی ئەوان نیم! ئەمن دەمێکە بوویمە خۆم، بە چاوی سەری خۆم دەڕۆم، هەربۆیەشە لەچاو ئەوان، ئاوا پەرێز و کێڵگەی وەردوشۆم پاکژە!

مافی خۆتانە بپرسن یادەکانت بۆ هەموویان سوورو ئاڵن وەکو جۆگەی خوڕی خوێناو!؟ باوەڕ بکەن هەر هەموویم لە خۆشەویستی ئێوەیە، پیاڵە پیاڵەم لەنێوکوپەی دڵم بۆتان هەڵێنجاوە.

لە سێبەری دەسەڵاتی هاوزمانم ۳۰ سی ساڵە حەزو ئاواتمان لە خاکی وشکی بێڕۆحدا، بە خەرەندو زەندۆڵەکانی چارەڕەشیدا دەبەنەخوار. زامەکانی نیشتمانم لە ناخماندا هەتا دێت قوڵتر و بەسوێتر دەبن. وڵات ئێستا بەستەڵەکی نەزانییە، بەخشینەوەی بڕوانامەی بێ باگراوندی زانستی بەراورد بەئاستی خوێندنی وڵاتان، لەژێر هێڵی هەژارییە. ئیفلیجکردنی پەروەردە و خوێندن، دەردو کوانی زۆر بەژانی داخی دڵن، لە قوڵایی ناخمدا جێگا دەگرن، تۆخودا وەرن هەر بۆئەوەی لەژێر پەردەی بیرکۆڵیدا ماتو سەرگەردان نەمێنین، با ڕێرەوی باڵادەستی داهێنانی ئەو فۆرمو کولتوورە بگۆڕین کە سیخناخە لە گەوجاندن و کۆیلەکردن و کڕنۆش بردن. بە هەموو وجودمەوە، بە بینینی خوێندەوارێکی کوردیزان، حەزێک لە گیانم دەگەڕێ و گەزگەز باڵا دەکەم، ئارامییەک دەڕژێتە سەدەفی دڵمەوە.

بۆ ئەوانەی هەر بەپاکی ماونەتەوەو لە دادپەروەری و یەکسانی لەگەڵ هەتاودا یەکسانن، بەچاوی خۆتان دەبینن ناپاکەکان، خودای پاکی هەموو ئاسمانەکان دەخەنە ژێر پرسیارو لێزمەی گومان! لەو کەسانە نزیک مەبە، نەبادا پاکی تۆ وەکو چەترێک بەکاربێنن بۆ داپۆشینی ناپاکیەکانی خۆیان، ئەگەر توانیت بە زمانی جەستە پێی بڵێ: خۆشیم لە ئەتوارت نایە!

ئێستا ئێمە سەرنشینی کەشتییەکین، لە نێوەڕاستی دەریایەو پەکی کەوتووە، لە هەموو لا بای گەردەلول دەوری داوە، چارۆگەکانی ڕادەوەشێنێ و دێنێ و دەبا، نزیکە تێکیبشکێنێت، کاپتنی خەواڵوو

باوێشک دەدا! من تێناگەم، کاپتن هەر لە ئەزەلەوە کاڵفام و نابەڵەد بوو یاخود ئەقڵی لەدەستداوە!؟

ئەو ئاجوج‌و باجوجانەی حوکمڕانی، ڕۆژ نیە چەند هێلکەیەکی نامۆ بە کولتوور و خاکمان نەترووکێنن! ڕۆژ نیە بەشێک لەو خاکەی هەزاران قوربانیمان بۆدا، وەکو دیارییەکی بێبەها نەیدەنە دەست داگیرکەران و نەیدۆڕێنن! لەجیاتی خشت، کەللەسەرمان خستە سەریەک، نەبووە پەسارگەو چواردیوار بۆ هەژاران! مرۆڤ دەبێت هەمیشە لە هەوڵدا بێت لە جوغزی ئەو گێژەڵووکەو گێژەنە سەر دەربیا، بەدوای دەریچەدا بگەڕێ، نوێژ بۆ تیریژی ڕووناکی قیبلەی ڕزگاربوون دابەستێ! لەجیاتی ئەوەی بەدیار شکۆی شکاوی مرۆڤەکانەوە دەست لە ئەژنۆ دابنیشێ، هەوڵ بدا شکۆیان بۆ بگێڕێتەوە، لەوەتای من بەبیرم دێ میرغەزەب لەدوای میرغەزەب یەک بە ئەویدیکەم دەسپێرێ! ئەو ژیانەی ساتەوەختێک بە ڕوومانندا زەردەخەنەیەکی نەهاتێ، ناشزانین چەپکەردی گەردوون لە دوارۆژ بەکوێماندا دەداو چ پەندێکمان بەسەردێنێ! ئەو ئامانجە پیرۆزانەی نەغدینەی ژیانی[1] خۆمانمان پێبەخشی‌و ئەوەی ئێستاش نەیگەیشتینێ، ئازادی‌و دادپەروەری بوو لێمان بوو بە دیدار حەسرەت.

گیانەکەم... ئەو کتێبەی لەبەردەستتە، گێڕانەوەی ڕووداوگەلێکە لە کوورەی ڕۆژگارێکی ئەنگوستەچاو جۆشداوە و بە ئارەقە و خوێن و فرمێسک سەقا و دەمەزەرد کراوە، بۆیە لاتان سەیر نەبێت ئەو ڕووپەڕانەش گڕ بگرن، کە دەڕوانمە کەسوکاری شەهیدەکان، شەرمی بە زیندوومانەوەم بەرۆکی ویژدانم دەگرێ!

ئاخر ئەوەتا، دەسەڵاتی هەتیوچەکەی هاوزمانم، پەراسووی

---

١- نەغدینەی ژیان: ئاماژەیە بە گیان، کە گەورەترین و شیرینترین سەروەتی مرۆڤە.

شەهیدانیان کردە شیشی کۆنکریتی باڵەخانەکانیان!

مـن نـامەوێ تـابلۆی پانتـاییەکی غەمگینـی پـڕ لە شکسـتو شەرمەزاریتان نیشان بدەم، یان گەشتێکی عەزابی دۆزەختـان پێبکەم! لەسەرمانە بێ دوودڵی، ئەو کوێرەڕێیە بگۆڕین ئێمەی گەیاندۆتە ئێرە! وەرن بـا غوسـڵی بەحیزبیبـوون بەحەوت ئـاو لە خۆمـان دەرکەیـن! هەرچەنـدە ئەگەر بشـمەوێ، نـازانم ئەو مێـژووە شـەرماوەرە، وەک پشیلە لە کێندەرێ تاقەت بکەمو بشارمەوە، کە ڕووی مەجلیسانی نیە!

لەدوای کـردنەوەی بـوخچەیەک گوناهـ و هەگـبەیەک تـاوانو ڕێ ڕۆیشـتن بەنێـو تـونێلێکی تنوکدا، نـامەوێ وەکـو بلـوێر نـوزەم بـێو بکـــڕوزێمەوە، بەڵام نیـــازم لە دەستنیشـــانکردنی هەڵەو پەڵەکـــان، هەنگـاوێکە بـۆ چارەسـەر. پـێم وایە مرۆڤـی بـێ هیـواو ئامـانج لە ئەزەلەوە مردووە و مرۆڤێکی شکستە باوە!

ئەوڕۆژە دێـت تیرێـژی ڕوونـاکی کلاوڕۆژنەکـان دڕ بە تاریکـایی دەدەن، ماڵەکان ڕۆشن دەبنەوە، کۆدی دەستبەندو سندمی زانستەکان دەکـــرێنەوە. دڵنیـــام لە چەرخـــی گەردوون بەرەو پێشـــکەوتنی مرۆڤایەتیو شارسـتانێتی مـۆدێرن، هـیچ ئاسـتەنگێک نایوەستێنێ. من یەقینـم پەیـداکردووە دیموکراسـیو یەکسـانیو پێکەوەژیـان دەبێـتە هەوێنـی ئەزمـوونێکی شـیرین لەنێـو ئـۆڵ[1] و ئەتنیـک و ڕەگەزی مرۆڤەکـان. ئەو خورافیاتـانەی لەگەڵ ئەقڵـی پێشـکەوتنی کـۆمەڵایەتی سـەردەمی خۆیـدا نـاگونجێنو بەرانگـژی یەکتـر دەبـن، دانە دانە هەڵـدەوەرن. لەدوای ئـێمە بەچـاوی خۆتـان دەبیـنن نێرگەلەخانەکـان دەبنە یانەی ڕۆشنبیری و، تەزبیح فرۆشیەکان دەبنە کتێبفرۆشی. دڵـم سـەرڕێژی هیـوایە بە دواڕۆژێکـی کریسـتاڵی پڕشـنگدار بـۆ نەوەکـانی

---

١- ئۆڵ: دین، ئایین.

دوای ئـێمە، ئاسـمانمان پڕدەبێـت لە ورشـەی ئەسـتێرەی وشـەی ڕەسـەن‌و ڕێگـا نـادەن ڕۆژگـار زانسـتیان لەدەسـت برفێنـێ. لەدێرزەمانەوە پیاوانی ئاینی لە نەتەوەكانی عەرەب و تورك و فارس، دینەكانیـان، بەتـایبەتی دینـی ئیسـلام، لەخزمەتـی نەتەوەكانیـان بەكارهێناوە و بوون بە شت! كاتی ئەوە هاتووە ئێمەی كوردیش لە خەوی غەفڵەت بەئاگا بێینەوە، پیاوانی ئاینی گەلەكەمان بە مەلا و قەشەو شێخی برا ئێزیدیەكان، هەموو تواناكان خڕ بكەنەوە سەریەك، بـۆ ئەوەی چیتـر نەدۆڕێـین و پێغەمـبەران چیتـر لە چـاوەڕوانی جێبەجێكردنی پەیامەكانیان نەهێڵینەوە، مینبەری پەرستگەكان و دین بۆ خزمەتی گەلەكەمان بەكاربێنین.

## چۆن سوننەت کرام!

چاکم لە بیرە، ماڵمان لە گوندی گردلانکە بوو، تەمەنم چوار ساڵ زیاتر دەبوو، تازە دایکم لە نەخۆشی سیل چاک ببۆوەو گەڕابۆوە لای باوکم. بەڵام من، چونکە لە شیرەخۆرەییەوە، داپیرەم (عەیشێ) بەخێوی کردبووم، ڕۆژ تا ئێوارە ئەنگوچکم بەر نەدەداو بەدواییەوە بووم.

هاوین بوو داپیرم عەیشێ، کوندەیەکی نێریانی[1] پڕئاو کرد لەسەر بیرێ، بۆ ئەوەی بیباتەوە لەسەر کوندەڵانی[2] دابنێت، تا بۆ ڕۆژی دوایی، ئاوەکە شەوی[3] بێت. هەرچەندە بەهۆی خاراندنی کوندەکە بە جەفت[4]، ئاوەکەی زەرد دەبوو، بەڵام لەگەڵی ڕاهاتبووین. داوام کرد داپیرم عەیشێ لەسەر کوندەکە لەپشتێم بکات، ئەویش نەیدەتوانی، چونکە منیش هەراش ببووم. گوتی: با کوندەکە ببەمەوە بۆ ماڵێ بۆ سەر کوندەڵان، دێمەوە لە قیلمقاسێت[5] دەکەم، دەتبەمەوە، گوتم: نابێ! گوتی با لەپێشدا تۆ ببەمەوە دوای بۆ کوندەکەی دێمەوە، گوتم: نابێ!

دیارە منیش خاڵی لاوازی داپیرم عەیشێم دۆزیبۆوە، ئەویش بریتی بوو لە گریان و مانگرتن و لاق لە عەردیەوەژەنین.

بەڵام مانگرتنی من جیاوازبوو، زۆر جار هێندەم پاشپانی لە عەردی

---

١- کوندەی نێریانی: ئەو کوندەیەی لە پێستی بزنە نێری خۆشە دەکرێ و ئامادە دەکرێ، بۆ ئاوتێکردن و زۆر شتی دیکەش بەکاردێت.

٢- کوندەڵان: شوێنێک بوو لە ماڵ، تایبەت بوو بە لێدانانی دیزە و گۆزە و کوندەی ئاو و دۆ و...

٣- شەوی: ئاوی شەوی، ئەو ئاوەی لە دیزە یان گۆزە یان کوندەدا، ڕۆژێک پێشتر لە کانی و بیر دەهێنرا و دادەنرا ئەو شەوە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بۆ ڕۆژی دوایی سارد بێت.

٤- جەفت: جەوت، کڵاوی بەڕوو.

٥- قیلمقاس: قەڵاندۆشک، کاتێک منداڵ دوولینگان بەسەر ملی کەسێکی گەورەدا دێنێ.

دەدا دەمکردە خۆڵەپۆت، هەتا داخوازیەکەم بەدەستدەهێنا، ئەو کات مانگرتنەکەم دەشکاند!

هەر ئەوەندەم زانی، مامم حسێن گەیشتە سەرم، بەجلی بەقوڕەوە، دوو زللەی کۆییانی[1] لە بنانگوێی دام، هەڵاتم بۆ ماڵێ.

لە یادمە، دایکم پاساوی بۆ ئەو ڕۆژەی مامم دەهێنایەوە، دەیگوت: مامت زۆر ماندوو بوو، لە سوغرەو بێگارو قوڕەکاری ئاغاکان بوو. کە بۆ نانی نیوەڕۆیە هاتبۆوە، دایکم گوتی: مامت خەوەکوتکەی[2] دەبردەوە، بالێفم لۆ دانا گوتم کاکە، حسێن! تۆزێک بخەوە! گوتی: بەدیعە دەترسم قسەیەکم پێبڵێن و منیش قبووڵی ناکەم، با دووبارە لێرەش تووشی بارکردن نەبینەوە.

ئەو ڕۆژە هیچی باشم بۆ نەدەهات، لای ئێوارە دوو کەسێ پانتۆڕ لەپێ و کڵاوسووری بەگوڵینگان، بەجانتای دەستیانەوە هاتنە گوندی. ئەو منداڵانەی لە ئێمە هەراشتر بوون و سوننەت کرابوون، گوتیان ئەوە کیربڕن. ئەوەی سوونەت نەکرابوو کێچ کەوتە کەوڵی، دەبوایە بۆ خۆشاردنەوە خەمێک لە خۆی بخوات! بەڵام ئێستاش نازانم مامم حسێن، چۆن من و مەولوودی گرت، بۆ ئەوەی لە دەستی بەرەڵا نەبین، یەکدەنگ گوتیان بیانخەنە ژێر سەوەشیری[3]، تا نۆبەیان دێت.

ئەو کات ئێمە هەراش بووین لە ژێر سەوەشیری جێگامان نەدەبۆوەو گومانی ئەوەشیان دەکرد هەڵبێین. هەرچی دەهات لە ژن و پیاو، بێ ئەوەی کەس پرسی پێبکات، ڕای خۆی لەسەر

---

١- زللەی کۆییانی: ئاماژەیە بە زللەی بەهێز و بەئازار. زۆر روون نییە، بەڵام پێدەچێ زللەی کۆییان بەهێزو بە ئازار بووبێ.

٢- خەوەکوتکە: کەسێک کە بە دانیشتنەوە تاو نا تاوە خەو دەیباتەوەو بەئاگا دێتەوە.

٣- سەوەشیر: ئەو سەبەتەیە بوو کە شیری دۆشراو یان هەوێنکراویان دەخستە بن بۆ ئەوەی پشیلە یان هەر گیانلەبەرێکی دیکە دەمی تێنەخات و پیسی نەکات.

بەنــدکردنمان دەردەبــڕی! یەک دەیگــوت: گوریســـی بێــنن گــرێ بەرانانیـان[1] لێبـدەن! یەک دەیگـوت: لە تەویـلەی وڵاخـان بەگوریسـی جەلەیان[2] بکەن! یەک دەیگوت: لە سەرگیندان و قشپلدانیان[3] بئاخنن.

پێ نەدەچوو ئەو ڕەوشە سوننەتکردنی دوو منداڵ بێت، ئەوەندەی هەستت دەکرد دوو جوانەگای جووتی، یان ئەسپ دەخەسێندرێت! چــونکە باســی بەرزەفتکــردن و گــوریس و فەلاقە لەگــۆڕێ بــوو! بەتایبەتی پلکەئاسک، کە زۆری چارەی منی نەدەویست، بە هۆکاری ئەوەی لەگەڵ مەعرووفـی نەوەی، زۆر شـەرمان دەکـرد، مەعـرووف بابی نەمابوو، دەیانگوت هەتیمە نابێت کەس لێیبدات!

ئـای! ئەوکـات وام بیردەکردەوە، خۆزگەم دەخواست منیش هەتیم ببم و وەک مەعرووفی، لە گوندی ببمە ماسی بێ کێرد!

پلەئاسـک هەمیشـە دەسـتی مەعرووفـی بەدەسـتەوە بـوو پەلکێشـی دەکـرد، بـۆ گلەیـی و بە لێدانـدانی مـن. دەهــاتە مــاڵی ئێمە. هەرچەنـد مەعـرووف هاروهــاج بـوو، کەس لە گونـدی لە مەعـروف بەدفەڕتـر نەبوو. بەڵام پلکەئاسک هەمیشە دەیگوت: مەعرووفەی من زمانی دە زاریدا نیەو بێ سەروزمانە! زۆر جار ئەگەر پلکەئاسک بۆ قەرزکردنی شەکرو چاش[4] هاتبایە ماڵی ئێمە، من باریکەم دەدایە[1] و لای دەرکەم

---

١- گرێ بەرانی: گرێیەکە لەو پەتە دەدرێ کە لە ملی بەران دەخرێ بۆ دەستبێنی شەو. ئەو گرێیە نە شلتر دەبێ و نە توونتر دەبێ، یەک ئەندازە دەوەستێ.

٢- جەلە: تێکخستن یان پێکەوەگرێدانی چەن وڵاخێک بەهۆی ڕێشمەکانیان.

٣- سەرگین: تەپاڵە، ڕیخی ماڵات کاتێک وشک دەبێتەوە.

قشپلدان: شوێنی داکردن یان عەمبارکردنی قشپل بە مەبەستی سووتەمەنی.

٤- قەرزکردنی شەکروچا: لە ڕۆژگاری کۆندا و تا حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستیش، گوندنشینان لە ڕووی بژێو و گوزەرانەوە کەمدەرامەت بوون، کەم ماڵ هەبووە زاد و زەخیرەی تەواوی ساڵێی هەبووبێ. شەکرو چاش بەو شێوەیە، زۆر کەم بووە. زۆر جار خەڵک شەکرو چایان لێبڕاوە لە دەرودراوسێ بە قەرز وەریانگرتووە و دواتر کە کڕیویانە، بۆیان

دەگرت نەبادا بەلێدانم بدات، شوێنی هەڵاتنم دیاری دەكرد بەكوێدا هەڵێم و خۆم بزر بكەم، بەحەزەرەوە سەرنجی دەمی پلكەئاسكم دەدا.

مام حسێن گوتی: لێگەڕێن چارەیان دەكەم! چاڵەگەنمێكی گەورە لە بەردەركی حەساری بوو، گەنمی تێدا نەمابوو، قوڵاییەكەی بەژن و نیوێك دەبوو، هەردووكمانی شۆڕكردەوە نێو چاڵەكە، كاتێك تەپەم لە بنی چاڵێوەهێنا، بزمارێكی سەرپانی جەنجەڕی لە بنی پێم چەقی، هێندە چووبووە بنی پێم، بە هیچ بۆم دەرنەدەهات، هاوارم دەكرد، دەیانگوت درۆدەكات دەیەوێت خۆی دەرباز بكات، باوەڕی پێ مەكەن! ئەحمەد بەرەڵا بێت بە هەموو خەڵكی گوندی ناگیرێتەوە! تەماشاكەن مەولوود چونكە نیازی هەڵاتنی نیە، نە هاوار دەكاو نە دەگریەت!

هێندەم نزگرە دابوو دەنگم نوسابوو، كاتێك ئێمەیان بردە بەردەستی كیربڕی، ئەو كاتە بزمارەكەیان لە پێم دەرهێنا. لەدوایی سوننەتیان كردم، ژانی سوننەتەكەم و ژانی پێم، یەك لە یەك بە ئازارتر بوو، دوو كەونەكراسی بابمانیان لە بەركردین، دامێنیان لە عەردی دەخشا! سوننەتچیەكان، دوو سێ شەكرۆكەی وردی بە ڕازییانەیان داینێ، كە پێیاندەگوت گوومشك، لە گەڵ سەرو شەكرۆكەی دیكە بەقەدەر پەنجەیەك دەبوو، ڕەنگاوڕەنگ كرابوو، پێیاندەگوت كیری قازی.

ئەو هەموو منداڵە سوننەتنەكراوە، لە حەساری ئێمە خڕكرابۆوە زیڕەیان دەچۆ بەری عاسمانێ. كچە هاوتەمەنەكانیشمان لەگەڵ ئێمە دەگریان، پێم وابێ لە خۆیان دەترسان! بەڵام لە هەمووی سەرنجڕاكێشتر، شوانێكیان لە بەرمەڕی هێنایەوە، كە بالق ببوو،

---

برنوونەتەوە.

١- باریكەم نەبایە:

شـەیتانی پێکەنـی بـوو، بەڵام کاڵفـام بـوو، بـۆیە سـوننەت نەکرابـوو، ســوننەتچیەکان گوتیــان تــا بەری نەتاشــن ســوننەتی نــاکەین. براگەورەکەی چـوو تاقمەتراشی بـاوکی بـۆ هێنـاو پووخـت بەری بـۆ تاشـی. لە کـاتی سـوننەتکردن، کـڵاو و جەمەدانـی لە تەنیشـت خـۆی دانابوو، بە دوو سێ زەلامان بەرزەفتیان کردبوو، دەتگوت گـاجووتی دەخەســێنن، دەیهاڕانــد! ئەو گونــدەی بە ژن و پیــاوەوە هێنــابووە سەرخۆی. لەجیاتی شەکرۆکە جگەرەیەکیان بۆ داگیرساندبوو دایانە دەستی.

تـرس و هێشـی سـوونەتکردنەکە هێنـدە زۆر بـوو، بـاوەڕم پێبکەن دواتر کە گەورە بووم، ترسی دائیرەی ئەمنی بەدناوی بەعس، ترسی سوننەتچیەکانی لەبیر بردمەوە!

## لە چاوەڕوانی سبەینەیەكدا

هاوینی ١٩٦٠، ڕۆژێک باوکم هەرێی[1] پێدام، سبەینێ دەمباتە شاری. هەمـوو ئـاوات و ئـارەزووم، لە هـاتنی ئەو سـبەینێیەدا نقـووم ببـوو. سـبەینە، بـۆم ببـوو بە دونیـایەک خەون و خەیـاڵی ڕەنگـاڵەیی. چەنـد بەتاسـەو ئـارەزوو بـووم، لە بۆتەی ئەو سبەینییەدا بتوێمەوە! سبەینە بۆم ببووە گۆمـاوی گـردلانکە، منیش وەک جوچکە مـراوی بەسـەریدا بخولێمەوە. ئەو ڕۆژە تـاکو ئێوارە بەرامـبەری خۆرئـاوابوون، هۆشـم هەر لای زەردەپەڕبوو.

ڕێژنە پرسیارێک لە دایکم: دایە کەی دەبێتە سبەینە؟ دایە بۆ سبەینە نایە؟!

ئەویش دەیگوت: کوڕم چاوت بنوقێنی هەڵیبهێنی، سبەینەیە!

وەکو یاری یۆگـا بکەم، ئەو کردەیەم چەنـدینجار دووبـارە کردەوە، بێ فایدەبوو، خۆر دەتگوت: سندمکراوە، یان بە ئاسـمانەوە نووسـاوە، تەشریفی نەدەهاتە خوارێ!

لە چـاوەڕوانیەکی تاقەتپڕوکێنـدا، خـۆر ئـاوابوو، سـوورایی ئاسـوگی دوای زەردەپەڕیـش ئـاوابوو. کاتێـک دونیـا لە تاریکـایی وەرپێچـرا، پاساریەکان لە کونی خۆیان خزان، تا بۆقەکان دەیانقیڕاند، ئومێدم بە هـاتنی سـبەینە زیـاتر دەبـوو. ئێـوارە چـام نەخـواردەوە، نەبـادا میـز لەبنەخۆم بکەم!

لەسـەر سـەکۆی، بە دیـار ئەسـتێرەکان و ڕێـی کاکێشـانەوە چـاو بە مۆلەق ڕاکشام. مـانگی دەسـتکرد دەهـاتن و دەڕۆیشـتن، دەمگـوت: تۆ بڵێی بچنەشاری و لەگەڵ ئێمە هاوسەفەربن!

بـابم گـوتی: بـۆ ئەوەی دەتـبەم بـۆ شـاری، وێـنەت بگـرم، تـاوەکو

---

١- هەرێ: ئەرێ، قەول، بەڵێن. گفتێکی ئەرێنی کە بە کەسێک بدرێ.

هەویەی نفوست بۆ دەربهێنین و لە مەکتەبێ ناوت بنوسین.

ماڵمان، لە گوندی گردلانکەبوو، بۆ گەیشتن بە شارێگەی هەولێر – کەرکووک، بە پیادە، یەک کاتژمێر بوو. بەرلەوەی بەرێبکەوین، دایکم گوتی: شەکر و دەرمانچاو دوو قاڵب سابوونی کۆرێ[1] و کیسە خەنەکمان بۆ بهێنن.

بەرێکەوتین. کزەبایەک، وەک بای بسکان، وەک بای سەبای سالحان، خۆی لە دەم و چاومان دەخشاند. نزیکی جادەی قیر بووین. باوکم، تا ئۆتۆمۆبیلێک لە کەرکووکەوە بەرەو هەولێر دێت، لایدا بۆ نێو پەرێزێک، بۆ گەڕان بە دوای لانە کەروێشک. تاژیەکانیش بەدوامانداهاتبوون بۆ ئەوێ، هێندەی پێنەچوو، پەستی[2] مەولوود بزنی، لە بستووی لای (سێقوچان) و (ئۆمەراوا)ی، شۆڕبۆوە، باوکم دەستی لێراگرت، ئەویش دەمێک بوو لە قیری لای دابوو تا بۆی ڕاوەستا، ئێمەش بەنێو دڕکەزەردەو پووش و پەڵاشی قەراغ جادەکەی، قەرە بە قەرەی پەستی، غارمان دەدا. تەبای ئێمە، تاژیەکانیش غاریان دەدا، تا بەسواربوونی پەستی شاد بووین. تاژیەکان، تاوەکو ڕاستی (قەلاوە)ی، لەگەڵ پەستی غاریان دەدا، تا باوکم لە پەنجەرەی پەستییەوە، هەرای کردنێ و گەڕانەوە.

شوفێرەکە، دێمکە[3] ئاوێکی بە ئاوێنەی پەستی هەڵواسیبوو، شاگرد (سەکن)ەکە گوتی: تینووتان نیە؟ بابم گوتی: بەڵێ تینوومانە. ئەمنیش خۆش خۆش دەستم لە ڕانی باوکم دەدا، دەمگوت: ئەمنیش، ئەمنیش!

---

١- سابوونی کۆرێ: سابوونی کوڵێ. جۆرێک سابوون بوو. ڕەنگی مەیلەو خەنەیی بوو. تایبەت بوو بە جلشۆرین.

٢- پەستی: جۆرە ئۆتۆمبێلێکی گەورەی نەفەر هەڵگر بوو کە بۆدییەکەی لە تەختە دروستکرابوو.

٣- دێمکە: جەوەندە، لە ماددەی خێوەت سازدەکرا. لاکێشەیی بوو. دەمێکی بچووکی هەبوو بە دارێکی لوولەکی وەک پیم دادەخرا. ئاوی تێدەکرا. درەوان بۆ بەرپەرێز. شوان بۆ بەر مەڕ و گاوان بۆ گاران لەگەڵ خۆی دەبرد.

دێمکەئاویـان بە دەمـی وەنـام، لەبەر جـوڵەو تاسـەی پەسـتی، تـا قوومەئـاوێکم دەچـووە زاریەوە دوو قـوومم بەسـەر سینگیدا دەڕژا، هەتا نێوکم تەڕ تەڕ ببوو.

لە خانەی پشتەوەی پەستی، بەرانێک و گۆلکێکیان سوارکردبوو، بۆ مەیـدانی هەولێـرێ. چەنـد جـاری بەران دەپشـمی، چڵمـی لە لـووتی دەردەپەڕی، دەموچـاوی یەک دوو کەسـی سـواق دەدا، لیکـاوی گـۆلکەکەش لەوێ ڕابوەسـتێ، کاتێـک لـووتی لە شـانی پیاوەکـان دەسووی! بەشەقەشەق و جیرەجیرێ پەستی گەیشتینە هەولێرێ.

جێگەی(بـازاڕی نیشـتیمان)ی ئێسـتا، گۆڕەسـتانێکی زۆر گەورەو بەسام بوو، گۆڕی خواپێداوەکان، قەفەزی ڕەنگاوڕەنگی لەسـەربوو. لە قەڵاتـێڕا، شـار نەگەیشـتبووە (شـێراتۆن) و (نیقـابە)ی، کە جـۆگە ئاوی پێدا دەڕۆیشت، لەودوایانەدا بەو شوێنەیان دەگوت فلکەی ئاوی کەسک و سۆر، نافوورەکانی ڕەنگاوڕەنگ بوو.

یەکەمجار بوو، بازاڕی شاری ببینم، بۆنی شاریم زۆر پێخۆش بوو، بەجۆرێک قوشـقی بووبووم، سـەیری هەرچواردەوری خۆم دەکرد. بابم نەیدەهێشت، بە کامی دڵی، سـەیری شـاری بکەم، بەدوای خۆیدا پەلکێشـی دەکردم، دەسـتی توونـد گرتبووم نەبـادا ون بـم! بەڵام مـن سـەیری بەرپێـی خـۆم نەدەکـرد، هێنـدەی لەوبەرلەوبەری شـەقامەکە بڕوانم! کە ئۆتۆمۆبێلێک دەهات، لە دڵی خۆمدا دەمگوت یاڕەسولەڵڵا! دەبێ پـانم نەکـاتەوە! زۆر بەپرتـاو لە جـادەی دەپەڕینەوە، جارجـار سەرسـمێکم دەداو سـاتمەم دەکـرد، دەهـات سـەرانگرێ بـم و بـابم دەیگرتمەوە، هەر لە دەستپێکی قەیسەری، سەفارچیەکان پێیان لە نێو مەنـجەڵ و تەشـتی سفر بـوو بۆ سـپیکردنەوە، قونیـان بـادەداو وەک سـەما بـکەن، گۆرانیـان لەگەڵ دەگـوت، دەنگـی چەکوچکـاری لەسـەر سـندان بەرێـتم لێـدەدرا، مەنـجەڵ و تەشـتەکانیان ڕاسـتدەکردەوە،

ئاگریـــان بە هەمبـــانەدەف جـــۆش دەدا، لەو نێـــوە ببـــووە جەنگـــی مەغلووبەی!

هەنـدێک دوکـانی خـومچی لێبـوو، هەڵە نەبـم هەموویـان کـوردی بنجوولەکە بوون، پارچەی جاویان لە خمی دەدا. کوتاڵی ژنان، وەک ئێستا ڕەنگاوڕەنگ و جوان نەبوو، جاوی چاوپانیان[1] لە خومی دەدا، ڕەنگێکی شینی زۆر تۆخ بوو، بەو شوێنە دەگوترا خومخانە، بەزۆری بۆ دەرپێ و بەرامپیلی[2] ژنان بەکاردەهات.

بۆیە گەر ژنێک، بە پیاوێک ڕازی نەبوایە شووی پێبکات، دەیگوت: "بەخوای دەرپێی پێ لە خمی نادەم!".

چووینە دوکانی مام شەریفی (شەریفی عیسمەتێ)، لە نێوەڕاستی قەیسەری دوکانی کوتاڵی هەبوو. خالیدی کوڕی، بەرگدرووی جلی پیاوان بوو، لە بەردوکانی باوکی مەکینەی خەیاتی دانابوو، بابم کورتەک و شاروارێکی مرادخانی، قوماشی فەتاح پاشای بەڕادان دا. دەیگـوت: "ئەو کـورتەک و شـەروارەی وە کەس نـادەم بەئامـانەت!" ئەوکات کورتەکوشەروار و پێڵاو و پشتێند و جامانە، دەخوازران بۆ سەفەر و بووکگواستنەوەو پرسە و...، دوای چەند ڕۆژ بۆ خاوەنەکەیان دەهێناوە.

پیـاوێکی ڕیشسـپی، کـزو لاواز، لەبەر سـەختی بـاری ژیـان پشـتی کـووڕ ببـوو، سـینیەکی بەدەسـتەوەبوو، عەڕیـج[3] و گەزۆو لەوزینـەی لەسـەر بوو بۆ فرۆشتن. ئەو پیاوە، بۆ بانگکردنی کڕیاڕ، شێوازی تایبەتی هەبوو کە دەیگوت: "یا کەریم! ئەڵلا کەریم"

---

١- جاوی چاوپان: جۆرێک بوو لە کوتاڵ وەک خام.

٢- بەرامپیل: بەرهەڵبێنە. پارچە خام یان کوتاڵێکی سپی بوو. ژنان لە کاتی نیش یانماڵینی گەوڕ و تەویلە بە سینگی خۆیانەوە گرێ دەدا.

٣- عەڕیج: حەلوایەکی جیڕی ڕەنگ سپی بوو.

مام شەریف پیاوێکی زۆر میهرەبان بوو، لەگەڵ گێڕانەوەی هەر بیرەوەرییەک دەگریا. دوو فلووسی بۆ بە لەوزینەو شرووب دام. باوکم گوتی: "با بڕۆین!" دەستی توند گرتبووم، لەنێو قەیسەری بەرەو پارێزگای ئێستا، لە چایخانەی مەچکۆ ڕەتبووین، بە پێش دوکانی (قەیسەر[1])ی ئارەقفرۆش، بەرەو چاپخانەی گیوی موکریانی، کە لە کۆتایی شەستەکان چاپخانەکەی لەوێ بوو، هەڵوێستەم دەکرد، دەنگی دەزگای چاپ، هەمیشە چرپ و چاپی بوو، دەتگوت شەڕەشمشێرە لە ژووریَ!

جێگەی مزگەوتەکەی بەرامبەری پارێزگا، زەوییەکی چۆڵی خاکی بوو، ئاوڕشێنیان کردبوو. لەبەرسێبەری دیوارێکی بڵیند، هەندێک سێپێکیان دانابوو، لەگەڵ چەند کورسیەکی دار، سێپێکەکان باولێکی بچوکیان بە پەڕۆیەکی ڕەشیان لەسەربوو، وێنەیان پێدەگرت، پێیاندەگوت: وێنەی شەمسی، لەسەر کورسی دایاننام، گوتیان: "نابێ بجوڵێی!" کابرا سەری دەخستە نێو پەڕۆڕەشەکە، دەیگوت: "چاوت نەتروکێنی!"، ئەمنیش لەوزینەو شرووبم خواردبوو، هەموو دەمولەوسی خۆم بە شیرینی کردبوو، مێشی ئەو نێوە لەسەروچاوم ئالآبوو. کابراش بەکاوەخۆ، نەیدەزانی من لە چ بارودۆخێکدام، هەر دەیگوت: "نەجوڵێی!" دەتگوت چاوشیلکانێم لەگەڵ دەکات! سەری لە پەڕۆڕەشەکە دەرهێنا، خوا ڕەحمی کرد گوتی تەواو! لەگەڵ بابم چاوەڕوان بووین، پارچەکاغەزێکی لەنێو پەڕۆڕەشەکە دەرهێناو خستیە سەتڵەئاوێک و دوای ماوەیەک دەستپێداهێنان، بە مەقەست وێنەکانی بڕی، سەیرم کرد، سەد سوێندت دەخوارد ئەمنم! زۆرم پێ سەیر بوو، خوایە ئەو کاغەزە چەند لە من دەچێت!

---

١- قەیسەر پیاوێکی مەسیحیی خەڵکی عەینکاوە بوو، لەو گوزەرەدا دوکانی مەیفرۆشی دانابوو.

ماڵی باپیرم سۆفی شێخە، بابی دایکم، لەو شوێنەی وێنەمان لێگرت زۆر نزیک بوو، چووین بۆ ئەوێ، جامێک بووزاویان[1] بۆ کردین، من حەزم لە دانیشتن نەبوو، دەچووم لە دەرکە سەیری کۆڵانێ بکەم، بزانم لە شاری چ باسە! پوورم، کە لە دایکم گەورەتر بوو، بەهۆی بیرکۆڵی شووی نەکردبوو، ڕایدەکێشامەوە بۆ ژوورێ، دیگوت: "یان دەتدزن یان لە چاوت دەبەن! ئەمن لەلای کەس نەمگوتووە بەدیعەی خوشکم کوڕی هەیە، گوتوومە بەس کچی هەیە نەبادا لە چاو بچن!"

ئاخر منداڵی شاری هەموو لە ئێمە جوانتر و خاوێنترن، کێ هەیە حەسوودی بەو هەموو چڵمەی سەرقوڵ و ئەو سەرە جەوی جەوی[2] ئێمە ببات! لەپکەیەکی شینیان لەگەڵ موتفڕکی غەوسی بەغدایە لە شانی دوریبووم، پوورم ئایەتەلکورسیەکی غەڵەت و پەڵەتی لە گەڵ دوو فووی بەسەردا شۆڕکردمەوە، باشبوو لەدوای نوێژی عەسری بەسەلامەتی گەڕاینەوە گوندێ!

---

١- بوزاو: بەفراو، سەهۆڵاو.

٢- جەوی جەوی: هەڵپاچینی سەر و قژی منداڵ و پیاو بە شێوەیەکی نارێک.

## باپیرم تایەر هەللاج

حاجی تایەری هەللاج[1]، دەستەپیاوێکی چوارشانەی تێکسڕماوی ڕەشئەسمەر بوو. مووی باسک و مەچەکی بە گروازە[2] و ڕەش بوو. سەڵتەو کەوا و کەراسی بە ئەنگوچکی لەبەردەکرد. هەموو جارێ دەیگوت ئێمە لە بنەچەدا لە گوندی (عەلی قولی)ی تەپەی لای داقووق پەریووینەتە گوندەکانی دەشتی دزەیایەتی هەولێر. منداڵ بووم، زۆرجار گوێم لێدەبوو دوای نوێژکردن دەستی لەبەرخودای خۆی پان دەکردەوە و دەپاڕایەوە: "خودای بزۆرگ، خۆم و کوڕەکانم لە بەڵای ناگەهان بپارێزی!" من، وەک منداڵێکی دەشتەکی، ئەوکات فارسیم نەدەزانی تاوەکو بزانم بزۆرگ بە مانای گەورە دێت. ئەویش دەرخەری ئەوە بوو ئێمە لە (هۆزی لەک)ی ئێرانین.

تایەر هەللاج پیاوێکی لەخواترس و لاشەڕ بوو. هەموو جارێ بە مامەکانم و بابمی دەگووت: "ڕۆڵە توخودا با چاوتان بێتەدەر، بەلام دەنگتان نێتە دەر!" عەیشە پیرەی داپیرم هەموو جارێ دەیگوت: "تایەر گێرەی قونجرکانی لەسەر زگی بکەی، توورە نابێت، هێندە بارقۆل[3] و لاشەرە، لێ ئەگەر توورە بوو و دەستی وەشاند، زۆر دەستڕەشە، دەستی خۆی نەوەشێنێ ئارام نابێتەوە!" یەک لەو گەواهیانەی کە بۆخۆم گوێم لێی دەبوو، لەیادمە ئەو کاتەی یاسین حاجی تایەری کوڕی گچکەی، لە لایەن پێشمەرگەکانی پارتییەوە شەهید کرا، لە دوای هەمو نوێژێک دەپاڕایەوە: "خودایە بکوژی یاسینی کورم چۆن نادیارە،

---

١- تایەر هەللاج: لەدایکبووی ساڵی ١٩٠٥ بوو ساڵی ١٩٧٤ کۆچی دوایی کرد. یەکێک بوو لە پێشەنگی جووتیارانی دەشتی هەولێر لە دژی سیستمی دەرەبەگایەتی.

٢- گروازە: لوول و گرژن.

٣- بارقۆل: نەفەسدرێژ و هێمن، لێبووردە.

ئاوا بە نادیاری بمێنێتەوە! بکوژ ئاشکرا نەبێت کێیە، حسین و علی کوڕم و نەوەکانم نەزانن و نەیناسن!" کەم مرۆڤم دیووە ئاوا کولافە[1] بێت بۆ جگەرگۆشەکانی. هالاوی هەناسەی، ئاگری لێدەردەچوو، بە جۆرێک، دەمگوت ئاهی دەروونی پڕ گڕی، هەموو دنیا دەسووتێنێ! وەنەبێت ئەو ئاهـ و نزوولەی لە بێدەسەلاتی و دەستوپێسپیاتی بووێت، عایشە پیرەی داپیرم هەمو جارێ بۆی دەگێڕاینەوە: تایەر هەلـلاج بەرلەوەی بچێتە حەجێ، لە تۆغیانی هەرەتی گەنجیدا بووە، ڕۆژێک دەچێتە ئاقاری[2] سەری دەغری[3] بدات، لەو دەشتە چۆلە، وسوی شەقرچی خزمەتکاری ئاغای، لێڕاست دێ[4]، بە سواری ئەسپێکی بۆرەی خارخاری لەسەر بیستوچوار بزماری، ئەسپی جۆخۆر لە مەغرووریـــان لە هەوران ڕادەمێنـــێ، هەر فـــڕمەی کونەکەپـــووە زۆرنابیەکەی هاتووە. لە کاتێک هەڵدەکوتێتە سەر تایەر هەللاجی و دەیداتە بەر سینگە ئەسپان، چەند قامچییەکی لە نێوشانی دەسرەوێنێ، جنێوی ناشیرینی پێدەدات، هەرچەندی لەبەری دەپاریتەوە و دەڵێ لەسەرچی ئەو سووکایەتییەم پێدەکەی؟ من بە هیچ خراپی خۆمم شک نـــایە. وســـو دەڵـــێ هەی گەواد قـــاوەخۆری وەک تـــۆ وای لێهـــات شەقرچیانەی گەنمی پار، ئاوا کەمی بۆ من دابنێی؟ تایەر هەلـلاج دەڵێ باری هەنجەت بار ناکرێ و پاڕانەوە لە پیاوی نامەرد بێسوودە! دوو خڕکەبەردی لە سینگوورک و پەراسووی دەدات، لە ئەسپی دەکەوێتە خوارێ، بێمروەتانە دەکەوێتەسەری و وسو دەڵێ تایەر هەلـلاج! ئەمن کردم ئەتۆ نەیکەی، خاوەن ماڵ و منداڵم، مەمکوژە!

---

١- کولافە: بەپەرۆش و کوڵاو بۆ کەسێکی خۆشەویست.

٢- ئاقار: مەزرا، عەرد و زەویی کشتوکاڵ و شینایی.

٣- دەغر: دەغڵ، گەنم و جۆ و...

٤- لێڕاست دێ: لە ڕاستڕا دێ، بەرەو ڕووی دێ.

بەهەرحاڵ، لە ئەسپەکەی سواردەکات و چونکە خۆی ڕاناگریَ، بە پشتێنەکەی لەسەر خانەی زینی دەیبەستیَ، هەی هەی لە ئەسپەکەی دەکات بەرەو گوندی. تایەر هەڵلاج دەچێتەوە ماڵیَ بیردەکاتەوە خۆ ئاغا بزانیَ لە گوندی دەریدەکات و دوو سیَ شەویش فەلاقەی دەکات، دەزانیَ وسو لە نێو ژن و کچی گوندی، زۆری شایی بەخۆیە و وای خۆی پیشانداوە و کەس ناتوانی چاو لە چاوی بکات!

تایەر هەڵلاج بە عایشە پیرەی خێزانی دەڵیَ: "هەرچی زووە برۆ لە سەر بیری ئاویَ لە نێو ژن و کچی گوندی بڵیَ وسوی خزمەتکاری ئاغای، لە ئاقاری زۆری لە تایەری مێردم داوە، لە ماڵیَ کەوتۆتە نێوجێی. بۆخۆشی بە شەلەشەل و کوورەکوورە خۆی دەگەێنێتە دیوەخانی ئاغای، خۆی بە ئەرزیَدا دەدات. ئاغا دەڵیَ ها تایەر هەڵلاح بۆ وات بەسەرهاتووە؟ ئەویش دەڵیَ ئاغا چیت لێبشارمەوە وسوی شەقرچی هاتووە لە ئاقاری هەموو ئازای بەدەنی شکاندووم! ئەگەر تەمێی نەکەی لە گوندەکەت باردەکەم، بیَ سووچ و گوناهـ چ خوابەردارە وسو ئاوامان لێبکات؟ ئاغاش سمێرەخنجەی دیتیَ کە خزمەتکارەکەی ئاوا ئازایە، بە لەخۆباییبوونەوە دەڵیَ تەمبێی دەکەم! وسوش دەبیستێتەوە لە گوندی بڵاوبۆتەوە وسو زۆری لە تایەر هەڵلاجی داوە و ژنانی ئاوایی یەک بۆ یەکتری باس دەکەن، ئەویش بێدەنگەی لێدەکات.

تایەر هەڵلاجی باپیرم، یەک برادەری خۆی ڕادەسپێری بچێتە لای وسوی، بزانیَ حالی چۆنە. کە دەچیَ، دەبینیَ وسوی لە هیزەی دەگرن، جێیَ ساغی نەماوە هەمووی شین و مۆر بۆتەوە. دەڵێن باشە خۆ ئەتۆ لە تایەر هەڵلاجت داوە، ئەی ئەتۆ بۆ وا لە پێستیدا ورد کراوی و دەڵێی وەبەر جەنجەڕی کەوتووی! وسوش دەڵیَ ئەمن لە ئەسپی بەربوومەوە و پێم لە ڕکێفیَ عاسیَ مابوو بە دوای خۆیدا ڕایکێشام. خەڵک دەڵێن بۆچی هێندەت لە تایەر هەڵلاجی داوە؟

وسوش دەڵێ بەسەری ئاغای هەر بیبینم لە ئاقاری، چینێکی خۆش دارکاری دەکەم!

## سوێند خواردن

کاتی سوێندخواردنێکی دیکەیە وەکو ساڵی ١٩٥٣... دایکم وای بۆ گێڕامەوە:

بابت گوتی: بانگم مەکەن با تێرخەو بم، بەشی دوو ڕۆژ جووتم کردوە! ئاخر ئەو ڕۆژە باوکم، جێگەی یەک قەزناغ[١] گەنمی بە هەوجاڕ کێڵابوو، بۆیە دەیگوت: ئەمشەو لەجیاتی دوو شەو دەخەوم!

لە خەوێکی هێندە قووڵدابوو، هەر بە دەم خەوەوە بەدەنگێکی بەرز هۆی دەدایەوە[٢]، لەگەڵ جووتە هێسترەکەی دەدوا، دەیگوت: "هۆۆۆ وەرە دایکم، خەتێ بگرن!" هێند شەکەت بوو، لەگەڵ ئەو هۆۆۆدانەوانەش خەبەری نەدەبوەوە!

لەبیرمە، هەموو جارێ باوکم دەیگوت: دەبێ مرۆ بە ئارەقەی نێوچەوانو ڕەنجی شان و پیلی خۆی منداڵەکانی گەورە بکات، پارووی حەڵاڵیان لە دەم بنێ.

دایکم دەیگوت: "ڕۆڵە بێدەنگ بن، بابتان تێرخەوبێت!"

یەک تەپاڵتە[٣] جلوجۆڕی بەدەستەوە بوو، لەو دەلاقەی لای دیوەخانی ماڵی ئاغای دەپەستا، بۆ ئەوەی باوکم لەگەڵ لەرانەوەو زرینگەی دەنگی ئاونی قاوەکوتانی قاوەچی دیوانی ئاغا، خەبەری نەبێتەوە.

---

١- قەزناغ: قەزناخ. قزناخ. قسناغ: چوار ڕبەیە. ڕبەش هەشت کیلۆیە.

٢- هۆی دەدایەوە: دەنگدانی گاجووت یان ئێستر لە کاتی گەڕانەوە لە سەرەسەدەی جووتکردن.

٣- تەپاڵتە: گرمۆڵەیەک لە پەڕۆوپاتاڵی بێکەڵک کە دەئاخنرێتە کونێک یان شوێنێکەوە.

ئەو زرینگانەی دەنگی ئاونی قاوەچی، ئاماژە بوو بۆ بانگهێشتی کرمانجە قاوەخۆرەکان، بۆ گەرمکردنی مەجلیسی دیوانی ئاغاکان! بەڵام بەپێچەوانەی ڕۆژانی بەرێ، لەگەڵ زرینگانەوەی ئاونیش، کەسێک ناچێ بۆ دیوەخان، تەنها چەند گۆردەیەک[1] نەبێت!

لەوساڵەدا، بەپێشەنگی (حاجی سمایلی سوراحی) و (کوێخا عەلی) و (حاجی تاهیر) و چەند جوتیارێکی جەربەزە، سوێندیان خوارد بۆ یەکتری، دەستیان لەسەردەستی یەکتر دانا، بە یەک دەنگ ئەو گاتا و سروودتەیان کرد بە ئارمی ژیانیان: (خێرمان خێرو، شەڕمان شەڕ!) بە یەک دەنگ بە ئاغا بڵێین: نەخێر، بۆ سەرانەو سوخرەو بێگارو چەوسانەوەو پلەبەندی مرۆڤەکان، بەڵێ بۆ یەکسانی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی!

ئێستا لەدوای ٦٧ شەست و حەوت ساڵ، چەندمان پێویست بە حاجی سمایل سوراحیێکی ئەوسەردەمە هەیە، بۆ ئەوەی پێشەنگمان بێت، فێری ئەو گاتاو سرووتانەمان بکات، دەستمان بخاتە سەردەستی یەکتر، سوێندمان پێبخوات، بە یەک دەنگ لە دژی پلەبەندی مرۆڤەکان و نادادپەروەری و چەوسانەوەی چینایەتی ئەو سەردەمە، بە یەک دەنگ بڵێین: (خێرمان خێرو، شەڕمان شەڕ!).

حاجی لەکوێی؟! هەردوو دەستت لەبن گوێت نێی، ئەو حەیرانە مەعنەوییە بۆ خەڵکی زەحمەتکێش و مافخوراوی مەملەکەتی گەنم و هەتاو بڵێیتەوە! کە بەر لە شەست و حەوت ساڵ، لە ١-١-١٩٥٤ لەسەر پردی (میرزارۆستەم) لە کاتی دوورخرانەوەت بۆ ڕانیە، بۆ بەرزکردنەوەی وڕەی جوتیارە دوورخراوەکان چڕیبووت.

هۆۆۆۆ، هۆۆۆ!... پیاوە بەوەجەکەی نیشتیمانە ئەتککراوەکەم!

---

١- گۆرنە: بە ئاماژەی سووکایەتی بە نۆکەری ئاغاکان دەگوترا.

حاجی... تۆ بڵێی لە جێگای تۆ کەسێک نەبێ، هەردوو دەستی لە بناگوێی نێ، ئەو حەیرانە سەرچیاییە پڕ مەعنەویەتە بۆ ئەو نەوەی ئێستاکانە بڵێتەوە!

## مردنی فەرهاد

زستانێکی ساردو سەقەم، وەرزی شەختەیەو داروبەردی لێک بەستووە، چلوورە بە گوێسوانەی خانووەکانەوە وەک کریستاڵ دەدرەوشێتەوە. بەیانیەکی زووەو تازە لێوی گەرمی گزنگی خۆر، کولمی چلوورەی گوێسوانەکان ڕادەمووسی، ئەوانیش لەشەرمان دەتوێنەوەو دڵۆپە دڵۆپە ئارەقی شەرمیان لێدەتکێ! پشیەلەکان قونئاگردان جێناهێڵن، لیسەکان[1] پڕبوون لە گمەی کۆتری مەست، خرمەخرمی شکانی شەختە ئاماژەیە بۆ هاتنی کەسێک! خانووەکانی گوندی، هەر هەموویان لە قوڕ دروستکراون، دیوارەکان خشتەی قوڕ و، سەربانەکانیش هەر قوڕە. خانوەکان دوو جۆرن، یەکەمیان پێیاندەگوترێ شەبەکی، کە پێکهاتووە لە دوو ژوور، دیوارەکانیان بڵندن، سەربانەکانیان وەک پشتی کیسەڵ کووڕن، بۆ ئەوەی لە کاتی باران ئاو ڕانەگرێ. جۆری دووەم پێیاندەگوترێ جزیری، بانەکانیان وەک ژمارە هەشتی کوردی بە هەردوو لادا ئاو دادێلی. لەدوای چەند ساڵ جۆرێکی دیکەیان خانوو دروستکرد کە پێیاندەگوت شارستانی، بانەکەی تەختو ڕاست بوو، بۆ خەوتنی وەرزی هاوین بەکاردەهات لوساوکەی تەنەکەیان پێوە دەخست بۆ ئاوەڕۆی سەربانی.

نەوت و داری قەڵاشکەری[2] لەو دەشتە پانو بەرینەی هەولێر نییە،

---

١- لیس: هێلانەی کۆتر.

٢- داری قەڵاشکەری: ئەو دارانە بوون کە خەڵکی گوندی لە چیا دەیانهێنان. بە بیور دەیانقەڵاشتن

تەنها قشپڵو سەرگینو پەرۆشە[1] و کای پاشماوەی پێخوستی مەڕو مالآت هەیە بۆ خۆگەرمکردنەوە، ئاگردان سێ کوچکەبەردی لە دەوری دانراوە کە پێیدەڵێن کوچاگر[2]. هەندێک ماڵ سۆبەی قشپلیان دادەنا کە لوولەی دووکەڵکێشی نەبوو، دووکەڵەکەی هەمووی لە ژوورێ پەنگاوەی دەدایەوە، وەک ڕێوی قانگ بدەی! چاو چاوی نەدەبینی لە چڕەدووکەڵ بنمیچی خانوەکان وەک قیر ڕەش هەڵگەڕابوون، دەتگوت بە ڕەنگی ڕەشی قەترانی بۆیە کرایە، تەنانەت کێشکەکانیش[3] ڕەش ببوون و وەک ڕیشۆڵەیان لێهاتبوو. دەماغو خەونو خولیای هەموو هەستەوەری ناسکی گوندیەکان ئەوەبوو، کە لەو زستانە ڕزگاریان بێت، بە هاتنی وەرزی بەهار، پڕشنگ و ڕەونەقێکی تازە بداتەوە بە چرای ئومێدیان. دیاربوو پیرەژنو پیرەپیاوەکان ورەو ئومێدیان دەدایە بەر دانیشتوان دەیانگوت هێندەمان نەماوە کوریک[4]و حاجیلە دەشتی دزەیایەتی بڕازێنێتەوە، دەستمان بە تۆرکەو کەنگرو کاردوو و پیفۆکو قێزبەلەو دوومبەلانو گیاوگوڵی بەهارێ ڕابگات، لەدوای هەموو زەیقەتو تەنگانەیەک فەرەحنایش هەیە!

کوردنشینانی ئەو ناوچەیە، لە هەرگەلێکی ناوچەکە زیاتر ڕیشاڵی مێژوویيان هەیە، لە ماکو بنەڕەتدا خاوەنی خاکو نەژادو کولتوورو زمانو هونەرو سیماو جلوبەرگی خۆیانن، مێژووی کولتووری کەونارای گەلەکەمان لێوانلێوە لە بەها جوانەکانی مرۆڤبوونو

---

و. وەک سووتەمەنی بۆ زستان هەڵیاندەگرتن.

١- پەرۆشە: تۆپەڵە ڕەگو ڕیشالی گیایەکە دوای وشکبوون لە دەشتی هەولێر وەک سووتەمەنی بەکاردێت.

٢- کوچاگر: کوچک ئاگر، کوچکی بەر ئاوری.

٣- کێشکە: چۆلەکە، چوێلەکە.

٤- کوریک: گولیلک، گوڵاڵەی دەشت و دەر.

بەرائەت.

هەمـوو منـدالآنی ئـاوایی، لە پەنـای دیـواری هـۆڵی مەڕان خۆمـان داوەتە بەرهەتاو، بۆ ئەوەی تۆزێک گەرم ببینەوە، ئاخر شەقەشـەقی ددانمان دێت لە سەرمان هەردەلەرزین[1]، هەندێکمان شـەوی ڕابردوو زۆرمان میز لە بنە خۆمان کردییە، جلی زیادیشمان نیە جلمان لێ بگـۆڕن، هەر بابـایە لە بەرهەتـاو خـۆی وشـک بکـاتەوە، هەنـدێک لە منداڵان هەتاوەکو چێشتەنگاوێ هەر هەڵمیان لێهەڵدەستێ!

ڕەوە ڕیشـۆڵە لەسـەر زبڵـی پاشـماوەی بەرپێـی ورسـاتی[2] لەسـەر گـوفەکی گونـدی گەواڵەی دەکـات، یاسـین دەچێـتە پارێزیـان لەگەڵ یەکەم تەققەی تـاپڕی، چەند ڕیشـۆڵەیەک بەجێمـان، کۆتر لە شـەققەی باڵیانـدا، منـداڵەکان غـار دەدەن بـۆ ڕیشـۆڵە کـۆکردنەوە، بـلە نـاهێڵێ کەس ڕیشـۆڵە بـۆ خـۆی بەرێو لە منـداڵەکانی دەسـتێنێتەوە، یاسـینی مامی دەڵێ لێیانبگەڕێ با هەر منداڵەی ڕیشۆڵەیەک بۆ خۆی بەرێ.

منـداڵانی ئـاوایی دەیانویسـت تـاو و بـان گەرم بێـت و وەک هەر ڕۆژێکــی بەرێ، یــاریی هەلووکــانێ، قاشــوانێ[3]، تەتۆکــانێ[4]، حوشـترۆکانێ[5]، قاقایـانێ[6]، تەڕو وشـک، جـۆلانە، شـێروخەت، حولـل بولـل تەکـانە[7]، پشـتەڕەقە، گوێفڕکـانێ و قوڕقـوڕۆکە[8]، عنـدرعۆپ[9]و

---

١- هەردەلەرزین: هەڵدەلەرزین.

٢- ورسات: حەیوانی وردە. وڵسات.

٣- قاشوانێ: يارییەکی فۆلکلۆری کوردییە. قاشۆ دارێکی لە شێوەی گۆچانە پێی لە گۆی دەدەن.

٤- تەتۆکانێ: ئەو پارچە ژێرپیاڵە فەخفوورییەی منداڵ یاری پێ دەکەن.

٥- حوشترۆکانێ: کاتێک منداڵ سواری پشتی یەکتر دەبن.

٦- قاقایانێ: چەند بەردێک یاری پێ دەکەن و هەڵی دەدەن و دەیگرنەوە.

٧- حولل بولل تەکانە: حەللوور بللوور تەکامە.

٨- قوڕقوڕۆکە: یاریکردن بە قوڕ بۆ دروستکردنی بوکڵە.

٩- عندرعۆپ: حەندرحۆپ. حیندرحۆ. جۆرێکە لە یاریی منداڵان.

یاریەکانی دیکە بکەین.

ڕۆژی پێشتری، بنپیاڵەیەکمان شکابوو، دایکم دایمی بۆ تەتۆکانی، منیش هەمووویم وەک فلسی، ورد کردبوو لە گیرفانم کردبوو بۆ تەتۆکانیو شێروخەت.

حەمەگێلی گاوان، گارانی گوندی کۆکردەوەو قورەپێچی[1] کردن بۆ دەو ڕووباری[2] تورگەی نانەکەی بە گۆمکی گۆپاڵەکەیدا کردبوو لەسەر شانی دانابوو، پلکەناسک بەو دەنگە زیقەی خۆی بانگی کرد: "کوڕە حەمەگێل دایکەزەردی من بەجێ مەهێڵە!" مەبەستی چێرە زەردەکەی بوو، حەمەگێل گوتی: "ئەو دایکەزەردەی تۆ، چێرە یان ئاغاژنە؟! هەموو ڕۆژێ لە خەودا دەمێنێ و پاش هەموو مانگای ئاوایی خانمانە دێتە نێو گارانێ، ڕۆژ نیە لەسەر جۆخیناندا بەدووایدا نەگەڕێمەوە!"

عەلی، جلی لە تاژیە چوارپەل بە خەنە و مل بە قەرێتەکانی[3] کردەوە، دەستیان بە ڕاوێچکەو ڕاوەدونانی یەکتر کرد، سەرێکی مەیدانیان، جێ جۆخینان بوو، سەرەکەی دیکە دەهاتنەوە سەر لەودەی کای[4]. عەلی سوێندی دەخوارد دەیگوت: "بە فەخری عالەم! تاژیەڕووتە ببێتە ١٢ مانگی، بە هیشکەتی[5] مامزی دەکوژی!" تایەر هەڵلاج دیتی سەر لەودەی کایەکەیان هەڵدرهەڵدر کردیە، بەردێکی ڕێ ئاڵاندنێ و گوتی: "وشتە وشتە!" ئەو لەودەکایەیان نەهێشت هێندەی هەڵدرهەڵدری بکەن! باران بباری کایەکە هەمووی تەڕ دەبێ،

---

١- قورەپێچ: کۆمەڵ و تۆپکردنی ماڵات و ڕاناىیان بۆ لایەک.

٢- دەو ڕووباری: دەم ڕووباری، سەرچۆمی.

٣- قەرێتە: قەڵێتە، قەلادە، ملەوانە. ئەو قایشەی لە ملی تاژی دەکرێت.

٤- لەودە کا: لۆدە کا، کای قەڵاپەچنە و لەسەریەک.

٥- بە هیشکەتی: بەوشکەتی، بە وشکی، بە نیشکی.

ئەوکات چی بدەینە ئەو مەڕو ماڵاتەی؟

لەناکاو لە ماڵی ئێمە بووە دادو فیغانو لەخۆدان و پرچڕنینەوە، گوێم لە دەنگی دایکم لەعلی بوو دەیگوت: "وەیڕۆ! ڕۆڵە ڕۆ! فەرهاد ڕۆ! جەرگت سوتاندم!" زیڕەو قیژەی دایکم لەعلی، لە قوڵایی ڕۆحمدا دەنگێکی ناشاز بوو، هەمیشە ئەو چرکەساتە لە بولێڵی یادەوەرییە منداڵیەکانم زایەڵەی دێتو لە یادەوەریم نابێتەوە. فەرهادی برام ۳ ساڵ لە من بچوکتر بوو، تەمەنی ۳ ساڵ بوو، دایکمان جیابوو، باوکم دوو ژنی هەبوو. دوو سێ ڕۆژ بوو فەرهاد هەوکی ئاوسابوو، (لەوزە)ی هەستابوو، دکتۆر نەبوو چارەسەری بکات، بۆیە گیانی سپارد.

بەهەشتاوی یەکپێ ڕامکرد بۆ ماڵەوە، چونکە پێڵاوەکەم لاستیک بوو چەندجار پینەکرابوو، قەیتانی پێوە نەبوو لە پێم بەجێماو بەپێخواسی غارمدا. ئەنگوستی گەورەی پێم لە بەردێکی هەڵقوچاو نینۆکم هەڵقەناو سبەرانگرێ بووم، هەستامەوە، خۆم گەیاندە ماڵەوە، داپیرم هەندێک خۆڵەمێشی ئاگردانی بە خوێنەکە داکرد، بە دەم پەڕۆک لێپێچانەوە داپیرم دەیگوت: "چاوم کوێربێ! ئەو تفارە[1] پێڵاوی بە پێوە نەماوە، لەمێژە بە بەنی، ئەندازەی پێیم گرتووە پێیاندەڵێم ئەگەر یەکتان چوونە شاری، پێڵاوێکی بۆ بکڕن، بەڵام زەلام قسەی ژنانیان لە کن قاویت[2] و ڕەشەبایە[3]و لەو گوێیان دێو لەو گوێیان دەردەچێ!

مەلا وەیسی، بە گازپلایزێک گوێی نێرەکەرە شینەکەی گرتبوو بای

---

١- تفار: تفر، تفل، منداڵ.

٢- قاویت: قاوت، پۆخین، بۆدراو، نان یان قەرەخەرمانی هاڕراو وەک ئارد.

٣- قاویت و ڕەشەبا: دوو شتی پیکەوەنەگونجاون، چونکە خواردنی قاوت لە وەختی ڕەشەبادا زۆر زەحمەتە، لەبەرئەوەی تۆزە، با دەیبات.

دەدا، دەیگوت: "ڕۆژ نیە بە ددانی مێخزنجیری هەڵنەکێشێ و زەڕەکی نەکات، دەبێ هەموو ڕۆژێ منداڵەورتکەی ئاوایی بەدوادا بێخم هەتا دەیگرمەوە، ئاخر پاشی مانگێکی دیکە قەرسیلی دەوری ئاوایی شین دەبێت، دەبێ هەر سەلامی لە خەڵکی وەربگرمەوە کە بۆ گازاندەی دێنەلام لەدەست نێرەکەرێ شین!"

لە بەختێ نێرەکەرەشینێ، کاتێک بە مامۆستا وەیسیان گوت فەرهادی عەلی مردییە، دەستی لە پلایزی شل کرد و گوێی کەرەکەی بەرداو تووکی کەرەکەی لە خۆی تەکاند، بەتوڕەیی گوتی: "خوات بە قوربانی مردنی ئەو تفارەی بکات، ئەگەر نا بەرمنەدەدای هەتا قازی بەغدایێ بانگی دەدا!"

بەر لە هەرشت، مامۆستا بۆ خەڵکی ئاوایی دوا: "بە قورئانی قەدیم کە لەسەر ڕانی چەپەم داناوە خزمینە جەحەندەم حەوت دەرگای هەیە، هەرکەسێک حەوت منداڵی نابالقی بمرێ، هەر حەوت دەرگایەکەی دەگرن. لە ڕۆژی حەشرێ نایەڵن دایکو باوکیان بچنە جەهەندەمێ و ئێسکیان بە ئاگری دۆزەخ ناسووتێ!" باوکم، لە بەرەی دوو ژنان حەوت منداڵی نابالقی مردبوو، لێ تا ئێستا کەسێک لەولایڕا نەهاتەوە لێی بپرسم هەوارو بارگە و بنەی دایک و باوکم لە کوێیە!؟ پرسیاری حاڵیان بکەم بۆ پشتڕاستکردنەوەی فەرموودەکەی مامۆستای!

پیاوێکی بالابەرزی ڕەقەڵە تەنها ئێسکو پێست مابوو، چەندین نوشتەو کشتەکو پەڕۆی سەوزی متفەڕکی سەرچاک و پیرانی بە کڵاوەکەیەوە هەڵواسرابوو، کڵاوەکەیان بە دەردی داری سەرچاکان بردبوو، لەگەڵ هەرهەنگاوێکی، نرکە و ناڵەیەکی لێوەدەهات، ئەگەر لێوەی نزیک بای، بە ئاسانی گوێت لە خرەخرِی سینگی دەبوو کاتێک هەناسەی دەدا. دانیشت، سایلی خەڵکی ئاوایی فاتیحەیەکی خوێند،

دەستی بە ڕیشی داهێناو شوکرانەبژێری خوای گەورەی کرد، هەموویان لێی بوون بە تەبیبو لوقمان، یەک دەیگوت کاکە تۆ بۆ سماقاو ناخۆی؟ یەکی دیکە دەیگوت بۆ لەلای شێخ کاکەی نوشتووی ناکەی؟ یەک دەیگوت بۆ خۆت لە هیزەی ڕۆنی ناگری و... دەروێش محمد بە سرتە بەوەی تەنیشتی دەڵێ و نایەڵی حەمەنەخۆش گوێی لێبێ، دەڵێ: "بە شێخ نورەدینی بریفکان! هەرکەسێک زوقمی بەربەیان لێبدات جارێکی دیکە نانی کەرت ناکاتو فەراقی ڕەشی لێدەبڕێ!" حەمەنەخۆشیش زوقمی بەربەیان لێیداوە خودا ڕەحمی پێبکات ئەو پیاوە ڕابردییە! حەمەنەخۆش چەند ساڵێک بوو بەدەست نەخۆشی سیلەوە دەینالاند، هەر بەو هۆیەشەوە بوو ناویان نابوو حەمەنەخۆش.

لەوسەری مەجریسێ، خەلیفە سولێمان، کە ئەو گوند ئەو گوندی دەکرد بەهۆی بەقاڵی، گوتی: "بۆ ناچیە گوندی باقرتەی، قادر بەغدایی لەگەڵ خۆت ببەی بۆ بەغدایێ، لەوێ چارەی نەخۆشیەکەت دەکەن، دەرێن لە بەغدایێ تەبیبو لوقمانی باشی لێیەو خۆشت دەخیلی مەرقەدی حەزرەتی غەوسی گەیلانی بکە!" عەولا گڵفرۆش، ئەویش گڵەسەری ژنانی دەفرۆشت بۆ پرچ نەرمکردنەوە، گوتی: "ئێستا کەس قادر بەغدایی وەکو چاوساغ و شارەزا لەگەڵ خۆی ناباتە بەغدایێ، کەس هاموشۆی ناکات، دەڵێن مەلای ئاوەدانی فتوای داوە قادر بەغدایی گومڕابووە دیارە ئەنگۆ بێخەبەرن!"

قادر بەغدایی، ڕۆژێک بە چاوساغی یەکێک دەباتە بەغدا، کاتی گەڕانەوە، لە گوندی سوێند دەخوا: "بە چاوی خۆم شتێکم دیتووە دەرێی حیفریتە هێندەی خانویەکی گەورەیە، هیندەی سێ قەمەرەی

٥٧[1] لەسەریەک دانێی، گەورەیە. تەبارەی گەنمی دەداتە پێشەخۆی، هەندی ٢٠ سەپانان لەگەڵ خۆی دەدووریّ و گەنم و جۆت لۆ لە فەردەی دەکات! مزگێنی! لە یەخەی داس‌و قەیناغ[2]و قەرانگ‌و گیشەو تێلەکێش‌و گەلاوێژو شەغرەو گێرەو جەنجەرو شەنەبای دەبنەوە! گەنمی سۆر لەلایەکی دێتە خواریّ، قەسەڵ و کاش لەلایەکی، پێیدەڵێن دەرڕاسە."

مەلای گوندی گوێی لەو قسانەی قادر بەغدایی بووە، سوێندی خواردییە: "بە قورئانی قەدیم! ئەوە عیلمی شەیتانییەو هەرچی ئەو درۆو دەلەسانە بکات، گومڕایەو هەرچی هاموشۆی بکات گومڕا دەبیّ‌و چاوی بە بەهەشتیّ ناکەویّ‌و بە بیّ‌ئیمانی دەمری!"

بۆیە ئێستا کەس وەکو چاوساغ‌و شارەزای شاری بەغدایی، قادری لەگەڵ خۆیان نابەن. خەڵک بیّ چاوساغ ماونەتەوە و قادریش کەس سەراسووی ناکا لەترسی گومڕابوون! لەدوای دوو ساڵ، کە دەڕاسە هاتە ناوچەکە، خۆیان هاوێشتەوە ماریّ قادر بەغدایی!

گەلێکی نەخوێندەوارو بێدەرەتان‌و گیرۆدەی چەوسانەوەیەکی چینایەتی بێڕەحمانەو کڵۆمکراوی خورافیات، وەک باربەر لەژێر باری نەزانیدا، هەرگیز لەژێر سێبەری ئەو دنیایە بە خاترجەمی دانەنیشت، هەروەکو ئەو وشکەسۆفیانەی لەسەر خۆڵ مەلە دەکەن‌و خەبەریان لە دەریا نییە!

مەلا وەیسی بە شەلەشەل، جووتی بە دوو کەران دەکرد، لە قەڵشەکانی نێو لەپی دەستی، ئایەتەکانی ڕەنجکێشانت دەخوێندەوە! ئاینی نەکردبووە ئامرازێک بۆ خۆ بە خەڵک ژیاندن، هەمیشە

---

١- قەمەرەی ٥٧: جۆرێک قەمەرەی مۆدیل ساڵی ١٩٥٧ بوو.

٢- قەیناغ: پەنجەوانەی ئاسنین کە درەوان لە کاتی دروێنەدا دەیکاتە چوار پەنجەی دەستی چەپیەوە.

لایەنگیری جوتیارە هەژارەکان بوو، دۆستی کۆمەنیستەکان بوو، ڕووی لە عەلی کرد گوتی: "ئەو ڕۆژە لە مەیدانی قاشوانیو کەلایانی، بۆچی لەگەڵ کوڕی ئاغای بە دەمەقاڵە هاتنو بەرانگژی[1] یەکتر بوون؟" عەلیش گوتی: "مامۆستا بە قورئانی لەسەر ڕانی چەپت داناوە، من گوناهم نەبوو، لە یارییەکە من بردمەوە ئاغەکۆر کەلا بەردەکەی منی هەڵگرتو هەتا دەستی تێدایە، تێیهەڵدا، ئەمنیش کەلایەکەی ئەوم تێهەڵدا، ئاغا دەستی بۆ قرتەی دەمانچەی بردو جنێوی پێدامو گەفی لێکردم، گوتی لە ژنان کەمتر بم ئەگەر ئەو دڕکەت لە بن پێی دەرنەینم، با لەنێو دوو نانی گەرم بێت هەتا ڕۆژی خۆی. ئەمنیش گوتم هەموو ڕۆژێ من بەتەنیا لەو ئاقارەیمە لەبەر مەڕیو لە جۆتی، ئەوکات ئەگەر هاتی ساغی دەکەینەوە کێ بەرخە و کێ بەرانە!" مەلا گوتی: "لاتان یەقین بێت خودا لەگەڵ زاڵمی نیە، پێغەمبەر دەفەرموێ هەرچی زوڵم قەبوڵ بکات لە ئۆمەتی من نییەو لە ڕۆژی حەشرێ شەفاعەتی بۆ ناکەم!"

ئەگەر چەوسانەوەو زوڵمی ئاغاکان نەبوایە، مرۆڤەکانی ئەوان سەردەمان کاژی لەخۆبایبوونو بەرگی تورەییان لەبەرخۆیان داکەندبوو. ساتەکانی ژیانی ئەوان سەردەمان، ئازیزنو جلیووەی پیرۆزنو شایانی ئەوەن ستایش بکرێن. هەموو ساتەکانو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان وەک ڕستە مرواریو یاقووت بەیەکەوە بەستراون، وەک ئاوێنەی بەرامبەر هەموو لایەنەکانی ژیانی ئەوان سەردەمان، لە حەرەمی پاکیو سادەییو بەرائەت، نیشان دەدات.

ترۆپکی تەمەنی خۆم ون کردووە، هەموو تابلۆکانی پیریم لێدەبێتە دیواری منداڵیم، ڕستەی یاقووتو گەوهەری بیرەوەری و یارییەکانی

---

[1]- بەرانگژ: بەگژداچوونەوە، لەڕووەوەستانەوە، ڕووبەڕووبوونەوەی یەکتری، تەحەدا.

منداڵیم کەوتە ژێر دارو پەردووی زەمەنێکی مەلعوونەوە.

نەشئەی ژیانیان لەنێو لەپمان ڕفاند، خەونە ڕەنگاڵەییەکانم، حیکایەتەکانی داپیرم، بەسەر ئەو تاریکاییە بێشوناسەدا پەژمووردە بوون. شەوان بە حیکایەتەکانی داپیرم : بزنۆکەو مەڕۆکە، ڕێی هات و نەهات، خوشکی حەوت برایان، ئەحمەدو محەمەدو کڵاوی سەخرەجندی[1]، کوڕەکەچەڵ و ... هەرچەند دەکەم وەک جاران خەو نامباتەوە!

کاتێک مرۆڤ هەست دەکات بە کولتوور و خاکو مێژووی کەونارای گەلەکەیەوە بەستراوەتەوە، ئەوکات هەست بە ژیان دەکات! گرێدانی زاراوەی کەونارای گوندنشینانی بەرێو ئێستاکە، هەریەکەو جیهانبینی تایبەت بە زەمەنی خۆی هەیە، سوودێکی یەکجار زۆر بە ئایندەی زمانی کوردی دەگەیەنێ.

کاتێک مرۆڤ، کە دەبینێت دەتوانێ سەرچاوەی ئاسەوارێک بێت، ئەوکاتە هەست دەکات بوونێکی ڕاستەقینەی هەیە لەنێو حەشیمەتی مرۆڤایەتی. لە زۆر قۆناغدا نوسین دەبێتە دیکۆمێنتو پەیام و لەسەروەستانی مێژوویی‌و شایەتیدانی سەردەمی خۆی، ڕووداوگەلێک ناکرێ فەرامۆش بکرێ، چونکە میراتی ئەدەبی ئەو سەرزەمینەیە. ناکرێ بەهاو قورسایی ئەو ژیانە پاکژو بسمیلکراوەی باپیرانمان بە کەم تەماشا بکەین، ئەو نوسینانە گەشتێکن بە خەڵوەتو کوێستانی زەینەوە، بۆ زەخیرەکردنی ئەزموونەکان، بۆ ئەوە نیە ئاینده لە ڕابردوودا بتوێنینەوە، بەڵکو دەبێت ڕابردوو بخەینە خزمەتی داهاتوو، مەبەستم ئەوە نییە مرۆڤ هەمیشە لە ڕابردوودا بمێنێتەوە، لێ دەبێت وانەی لێوە فێر بێت.

---

١- کڵاوی سەخرەجندی: کڵاوێکی خەیاڵییە لە ئەفسانە کۆنەکاندا بوونی هەبووە. گوایا بە لەسەرکردنی، کەسەکە ون دەبێت و کەس نایبینێت.

هەرگەلێک پێی وابێت دوێنێی باشتر بووە لە ئێستا و هەوڵبدات ئەمڕۆو سبەینێ بباتەوە دوێنێ، بەدڵنیاییەوە ئەو گەلە لە بەرەوپێشچونی شارستانیەتو مۆدێرنە چەقی بەستووەو لە پێشکەوتنو ژیانێکی سەردەمیانە بەرخوردار نەبووە، بە ئەرکی مرۆڤانەی خۆی ڕا نەبووە لە ئافراندن، لەژێر کاریگەری ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکی و بیری کورتمانەوە پەی بەو نهێنیە نابەین کە ئێمە بۆ لەسەر ئەو زەویە دەژینو بەهرەی بوونمان بۆ مرۆڤایەتیو داهێنان و ژینگەو ئایندەیەکی گەشتر، چییە؟!

ئێمە هێشتا چەندان فەرسەخ[1] لە داناییو خۆناسینو حیکمەتەکانی ژیانو مردن دوورین، بەداخەوە هیچ هەوڵێکیش نابینرێ بۆ ئاژوانی کۆمەڵگا بە ئاراستەی ئەو داناییە.

## زیندانیکردنی باپیرم

سەرم سوڕما لە حەیرەتی ئەو بەربەیانە ناوەختە، کازیوەی ئەو بەربەیانە، لە بەیانی پارساڵ ناچێت. ڕێگای شکاندنی قەڵای ئەو بێدەنگیە زۆر سەختە. بەرلەوەی کابانی چەلەنگ، ئارام، ئارام، کاتی دۆشین مانگاکەی بلاوێنێتەوە، لەوکاتەدا سەگ و گورگ لێک جیا دەکرێتەوە[2]. کەڵەباب، لە دەریچەی کولانەکەی سەردەردێنێ و بانگێ دەدات، تا ئەو بێدەنگییەی نێو حەسارێ، چڵک نەکات.

بەرلەوەی یەکەم تیشکی زێڕینی خۆر، سەربانی خانوەکانی گوند

---

١- فەرسەخ: فرسخ. پێوانەیەکی کۆن و میللی بووە، ماوەکەی لەنێوان چوار بۆ شەش کیلۆمەترە، ڕەسەنی وشەکە فارسییە و لە (پەرسەنگ)ـەوە هاتووە.

٢- لەو کاتەدا سەگ و گورگ لێک جیا دەکرێتەوە: دونیا ڕووناکبوونی بەربەیانە، بە ڕادەیەک کە سەگ و گورگ لێک جیا دەکرێنەوە.

ڕابمووسێ و شێتانە لە ئامێزیان کات، کۆتر لە لیسی بن ساپیتەی خانوەکان دۆژ داماون و ناگمێنن، لە ناخەوە زکر و تەهلیلەیەک دەکەن، دەڵێی هاوارێکی بێدەنگ بۆ دەوروبەر دەدرکێنن.

بۆ منێکی، کە هێشتا تاڵی و سویری ئەو زەمانەم نەچەشتبوو، بەنێوخۆمدا دەتوامەوە، هەر وەکو ئەو پەشیمانەی لەنێو بیرەوەریی تاوانەکانی خۆیدا نقومبوو. ئاخر من تاسەی ئەو مرۆڤە دەکەم، کە بەیانیان، لچکی سەڵتەو کەوایەکەی لە بەرپشتێنیرادەکرد. کلکەئەنگوچکی کراسەکەی، لە زەند و باسکی توونددەکرد، یەکەم ئەنگوتکەهەویری بۆ گۆلکەسوورەکەی دەبرد. کوڕش! کوڕش! بانگی جاشکە (حوڕە)ی دەکرد، هەندێک کووزر و بنجۆخینی لە پێش دەکرد. دەچووە سەیری پارانەوەی نێگای چاوی بێسۆمای ئەو سەگە پیر و کەنەفتەی کە وەک ڕێزگرتن و وەفایەک لە پاسەوانی چەند ساڵەی، بە (دێوە) بانگمان دەکرد، دوو سەپکی[1] جۆی لەبۆ دەبرد.

جلی لە تاژییان دادەکەند، ئالیکی ماینەکەی دەداو تۆزێک قەشاویشی[2] دەکرد. چەند تاژی چوارپەل بەخەنە، لە هەوێزێ[3] کلکەسووتەو مەشق و ڕاوێچکەیان دەکرد. باعەباعی مەڕ و بەرخ کاتی هاوێر، کاریلەم لە ئامێز دەکرد، قەت لەبیرم ناچێتەوە، دیمەنی ئەو تابلۆ برۆنزیانەیان لێکردمە سەراب!

لەو ڕۆژەوە، لە بەرامبەری ئەوانەی سروودی باڵندەکان و گوڵەگەنمی قەندەهاری و ئاو و گیاوگوڵیان سندم و بەرزەفت کرد، بووم بە بورکانی گرپژێنی توورەیی و ڕق، لەو ڕۆژەوە بەرەنگاریی لەدایک بوو، تەسلیمبوون مرد، لە نێوچاوانی کازیوەی ئەم ڕۆژەوە،

---

١- سەپک: سەوڵە، خەپلە. کولێرەیەکە ئەستوورترە لە کولێرەی ئاسایی و تایبەتە بە سەگ و تاژی.
٢- قەشاویش: ڕنەک، ئەڕنەک، ئامێرێکی دەستییە بۆ خوراندنی جەستەی وڵاخ.
٣- هەوێز: مۆڵگەی مەڕ.

بەکوڵ دەگریم، پێکەنینم بیرچۆتەوە.

یەکەم ئەلف و بێ و وانە بوو، لە گەورەکانی خۆم فێربووم، لەسەر مافم بێدەنگ نەبم، بۆ زاڵم نەچەمێمەوە!

ساڵی ١٩٦٠، ماڵمان لە گوندی گردلانکە بوو، باپیرم تۆمەتبار کرابوو، گوایە هەستاوە بەڕوخاندنی خانووی ئاغاکان. دیارە جوتیارێکی وەک باپیرم، لە ئاست زانیاری باری یاسایی، کۆڵەوار بوو، بەڵام ئاغاکان شارەزا بوون، بۆ تۆمەتبارکردنی، چەند چڵکاوخۆرێکی بێویژدانیان، وەک شاهید لەسەر پەیداکردبوو. بەوانە دەگوترا (چەلاوخۆر) یان (گۆردە) دروست وەک کۆیلەکانی ئەمڕۆژگارەی ئێستای دەستەڵات و حیزبەکان. باپیرم بۆیە حوکم درابوو.

ئەوکات تەمەنم شەش ساڵ دەبوو، داپیرەم عەیشێ منی بەخێوکردبوو، بۆیە لە دوای نەدەبوومەوە، تەنانەت شەوانیش ئەنگوچکی کراسەکەم بەرنەدەدا، نەبادا بۆ شوێنێک جێمبهێڵێت.! شەهید حسێنی مامم و داپیرەم بڕیاریان دابوو، بچن بۆ بەندیخانەی موسڵ، بۆ دیدەنی باپیرم حاجی تاهیر. داپیرم و مامم بە دایکمیان گوتبوو، سبەینێ ئەحمەدیش لەگەڵ خۆمان دەبەین.

دایکم لە دوو سێ کەسی پرسی: ئەمڕۆ چوارشەم نیە؟ دیارە دڵی بە کەسێک ئاوی نەدەخواردەوە، دەیویست دڵنیا بێت کە چوارشەم نیە. منیش واقم وڕمابوو، خوایە دەبێ ئەگەر چوارشەم نەبێت، دایکم چ کارێکی گرنگ ئەنجام بدات! نەمزانی دەیەوێت کراسەکەم بشوات و منیش پشیلەشۆر بکات! ئەوکات چوارشەممان کەس نەدەبوو خۆی بشوات و جلی بشوات، چونکە وەک نەریتێک، ئەوەی باری دەروونی تێکدەچوو، دەیانگوت بە چوارشەممان کۆری کردیە، یان ئاوی کوڵیووی بێ بیسم الله، بەسەر زەویدا ڕشتووە! جنۆکە و مەلایکەتی

بەکوڵ دەگریم، پێکەنینم بیرچۆتەوە.

یەکەم ئەلف و بێ و وانە بوو، لە گەورەکانی خۆم فێربووم، لەسەر مافم بێدەنگ نەبم، بۆ زاڵم نەچەمێمەوە!

ساڵی ١٩٦٠، ماڵمان لە گوندی گردلانکە بوو، باپیرم تۆمەتبار کرابوو، گوایە هەستاوە بەڕوخاندنی خانووی ئاغاکان. دیارە جوتیارێکی وەک باپیرم، لە ئاست زانیاری باری یاسایی، کۆڵەوار بوو، بەڵام ئاغاکان شارەزا بوون، بۆ تۆمەتبارکردنی، چەند چڵکاوخۆرێکی بێویژدانیان، وەک شاهید لەسەر پەیداکردبوو. بەوانە دەگوترا (چەلاوخۆر) یان (گۆردە) دروست وەک کۆیلەکانی ئەمڕۆژگارەی ئێستای دەستەڵات و حیزبەکان. باپیرم بۆیە حوکم درابوو.

ئەوکات تەمەنم شەش ساڵ دەبوو، داپیرەم عەیشێ منی بەخێوکردبوو، بۆیە لە دوای نەدەبوومەوە، تەنانەت شەوانیش ئەنگوچکی کراسەکەم بەرنەدەدا، نەبادا بۆ شوێنێک جێمبهێڵێت.! شەهید حسێنی مامم و داپیرەم بڕیاریان دابوو، بچن بۆ بەندیخانەی موسڵ، بۆ دیدەنی باپیرم حاجی تاهیر. داپیرم و مامم بە دایکمیان گوتبوو، سبەینێ ئەحمەدیش لەگەڵ خۆمان دەبەین.

دایکم لە دوو سێ کەسی پرسی: ئەمڕۆ چوارشەم نیە؟ دیارە دڵی بە کەسێک ئاوی نەدەخواردەوە، دەیویست دڵنیا بێت کە چوارشەم نیە. منیش واقم وڕمابوو، خوایە دەبێ ئەگەر چوارشەم نەبێت، دایکم چ کارێکی گرنگ ئەنجام بدات! نەمزانی دەیەوێت کراسەکەم بشوات و منیش پشیلەشۆر بکات! ئەوکات چوارشەممان کەس نەدەبوو خۆی بشوات و جلی بشوات، چونکە وەک نەریتێک، ئەوەی باری دەروونی تێکدەچوو، دەیانگوت بە چوارشەممان کۆری کردیە، یان ئاوی کوڵیووی بێ بیسم الله، بەسەر زەویدا ڕشتووە! جنۆکە و مەلایکەتی

سووتاندووە، لە غەیبەوە دەستیان لێوەشاندووە!

دایکم کە دڵنیا بوو، چوارشەم نیە، مەنجەڵێکی ئاوی لەسەر ئاگردانی دەکوڵاند، کراسەکەی لەبەرداڕنیم، دەیگوت: تەماشا! کراسی بوویتە مەدۆنە[1] ناشەڵێت بیشۆم! کراسەکەی شۆردو هەڵیخست تا زوو وشک بێتەوە، چونکە کراسی دیکەم نەبوو. لە سەرشۆرکێ دانام، جامە ئاوێکی بەسەریداکردم، وامزانی پێستی سەرم داماڵا هێندە گەرم بوو، زیڕاندم: دایە گەرمە!

کۆڵەمستێکی لە تریقەی[2] پشتێ دام گوتی: گەرم نەبێت ئەو چڵکەت لێ ناکاتەوە، هەفتەی ئەولاش خۆت شاردەوە نەتهێشت بتشۆم! دەستێک سابوونی قاپانی[3] لێدام، گوتی: لەبەر ئەو هەتاوەی دابنیشە لەسەر ئەو پارچە حەسیرەی، تا کراسەکەت وشک دەبێتەوە. منیش لەفکران ڕاچووبووم دۆژ دامابووم، هەتا دەهات زیاتر دڵنیا دەبووم، کە بەیانی دەمبەن بۆلای بابە حاجی.

مام حسێن بەیانی گوتی: برۆ لە دووریانێ لە دەرەوەی گوندی، چاوەڕێ بکە با مەولودی ئامۆزات نەتبینێت، هەفتەی دادێ مەولودی دەبەین. لە دووریانێ خەریکی خڕنووک خواردنێ بووم هەتا ئەوان گەیشتن.

بۆ گەیشتن بە شاڕێگای هەولێر - کەکوک، دەبوایە کاتژمێرێک بە پێیان بڕۆین، ئێمەش هەیپێمان لێکرد بۆ جادەی قیر، تۆزێکمان مابوو بگەینێ، پەستێک هات، مامم جەمەدانی لێڕاوەشاند، خوا ڕوحمی کرد، شوفێرەکە ئێمەی بینی، بە نەرمەغار گەیشتێ، پەستیش ڕایگرت و سواربووین، خەڵکێکی زۆری سوار کردبوو، لە ڕاست گوندی

---

١- مەدۆنە: جلوبەرگێک کە بە نارەقەی جەستە سپی بووبێت.

٢- تریقە: تیرەغەی پشت. تیرەی پشت.

٣- سابوونی قاپان: سابوونی هەوران. سابوونی تایبەت بە شۆردنی قاپ و قاچاخ.

گردەڕەشەی، ئۆتۆمۆبیلەکە بەنزینی تەواوبوو، بەلآم شوفێرەکە زۆر چوختی و سەرسەری بوو، سۆندەو دۆلکەی بەنزینی لە پێی خۆی بەستبوو، پالیدابۆوە. ئەوکات ئۆتۆمۆبیل کەم بوو، درەنگ درەنگ دەردەکەوتن، مام حسێن بەپەلەبوو بۆ چوونە موسڵ، کاتێک ئوتۆمۆبیلێک دەهات شوفێرەکە زۆر بێ ئەدەبانە پێی بەرزدەکردەوە بە ئاماژەی داواکردنی بەنزین. ئەوان سەردەمان شوفێر سام و هەیبەتی هەبوو، پێیان سەیر بوو کەسێک دەتوانێت بەتەنیا ئەو ئۆتۆمۆبیلە لێدەخوڕێت و لەژێر فەرمانی ئەودایە، کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد، قسە لە قسەی شوفێر بکات، ئەو هەموو سەرنشینە کەس نوتەقی نەدەکرد. مامم دووەمجار بوو، پێیگوت: کاکە هەستە پێوە دەست لە ئۆتۆمبیل ڕابگرە، چۆن کەسێک یارمەتیت دەدات ئەتۆ بەو بێڕێزیە بەرخورد دەکەیت؟ ئەوجار بۆ ئێمە درەنگیشە، دەچین بۆ بەندیخانەی موسڵ ملاقات نامێنێت. شوفێرەکە جڕتێکی سەرسەریانەی بۆ مام حسێن کێشا، مامم پیاوێکی ڕەشئەسمەری تێکسڕماو و چوارشانە، زۆر سەنگین بوو، بەهەوەنتە تووڕە نەدەبوو، خۆی لە شوفێرەکە نزیک کردەوە، داپیرم گوتی: نەکەی حسێن! مامم ویستی دۆلکەکە لە قاچی شوفێرەکە بکاتەوە و بەڕێزەوە دەست لە شوفێرەکان ڕابگرێت. شوفێرەکە لەقەیەکی لە مامم دا، مامیشم لاقی گرت و بەدوای خۆیدا ڕایکێشا بۆ سەر قیرەکە، دووجاری بە قیرەکەدادا، دوو کۆڵەمەستی بەهێزی لە خالیکەی[1] دا، بەلآم گوێم لە جنێوێکی مامم نەبوو. شوفێر بوو بە پۆڕی خوراو! داپیرم هاواری کرد گوتی: بەسە کافرباب کوشتت، هێشتا بابت هەروا لە سجنە! مامم گوتی: بۆ حەوت پشتی تەمبێی دەکەم چۆن ڕێزی خەڵک بگرێت! شوفێر هاواری دەکرد شاهید بن پەراسووی شکاندووم شکایەتی لێدەکەم!

---

١- خالیکە: بەتاڵایی کەلەکە.

ئـەو خەڵکـە، دار قەڕەشـت بـەرد قەرەشـت[1] ئـەرقوومیان نەکـرد[2]، نـە بـەچاک نـە خـەراپ ئەلفازیان نەگـەڕا. مـامم دەسـتی منـی گـرت و گـوتی: بـا بـڕۆین! بـەرەو لای گونـدی گەڕاینـەوە. خەڵکەکـە وایـانزانی دەڕۆینەوە ماڵەوە، ئۆتۆمبێلێک هات و بۆی ڕاگرتین و سواربووین بۆ هەولێر، بەلای خەڵکەکەدا ڕەت بووین بێ هەڵوێستانە دۆژ دامابوون، پوشکەیان لە عەردی وەردەدا، هەروەک ئێستا خەڵک کە لەسەر مـافی خۆیان نایەنەدەنگ!

کاتێک گەیشتینە بەندینخانەی موسڵ، بەندیەکان، هەموویان یەکجۆر جلـی وەک گونیـەیان لەبـەر بـوو، زنجیـر لـە هـەردووک پێیـەکانیان بەسترابوو، منیش لە داپیرم دەپرسی، بابە حاجی بۆ گونیەی لەبەرەو زنجیری لـە پێیـە؟ داپیـرم وەک ناڕازیبوونێک بـۆ ئـەو شـەڕەی مـامم، گـوتی: نـازانم، دەڵێـی ئاوقـاتی[3] و ئەتـۆش لـەو ڕەچەڵـەک و توخمـەی، گەورەبی ئەو زنجیر و گونیە بە تۆوەش دەبینم!

لـەو ڕۆژەوە یـاخیبوون و بـەرەنگاری زوڵـم و سـتەم و بێدادی لـە ناخمـدا مووتەربـە بـوو، تـاکو ئێسـتا وەک خەسـڵەتێکی ئـەزەلی لـە ویژدانم ڕەگوڕیشەی داکوتاوە! لەو ڕۆژەوە هەرێم بە بابە حاجی دا:

گەر لەو ڕێگەیە هەڵوەرم،
یان وەکو تۆ پێ بە زنجیر، گونیەی سپی بکەمە بەرم،
بۆ گەیشتن بە دادپەروەری و یەکسانی،
هەرزانە لام دانێم سەرم!

---

١- قەرەشت: قەڵشت. کینایەیە بەوەی کە دار و بەرد وەدەنگ هاتن. بەڵام زاریان لێک نەبۆتەوە قسەیەک بکەن.

٢- ئەرقومیان نەکرد: نوتقیان نەکرد. قسەیەکیان لە زاری نەهاتە دەر.

٣- ئاوقات: مەحامی. پارێزەر.

## هیچ لەباردا نەبوو

هـاوینی١٩٦١، ماڵمـان لـە گونـدی گردلانکـە بـوو، ڕۆسـتەمە گـۆجی جامبازو پیاوێکی دیکە، لە گوندی پەیدا بوون. باپیرم حاجی تاهیر، لـە بەرسـێبەرێ لـەسـەر لبادێـک دانیشـتبوو، شـەربە ئاوێـک و جـامێکی فافۆنی لە پێش بوو. جامبازەکان ئەسپێکی کەوێتی قاپڕەشیان پێبـوو، هەرکە چاویـان بـە شـەربەی ئاوەکـە کـەوت، هێندەیان ئـاو خـواردەوە دەتگوت تەریفە[1] بوینە لە تینوان، هەناسەیان هاتەوەبەرێ گوتیان: مام حاجی بۆ ئەو ئەسپەمان لێناکڕی؟ باپیرم زۆری حەز لـە ولاخـی بـاش بـوو، بـانگی مـامم حوسـێنی کـرد گـوتی: حوسـێن بزانـە ئـەو ئەسـپە چۆنـە؟ مـامم لـە دەورەی سـوڕا بـە چـاوی کڕیـاری تێیڕامـا، زاری ئەسـپەکەی لێککـردەوە تەماشـای ددانـەکـانی کـرد، گـوتی: شـیلەی[2] فڕێـداوە، تـازە بـەرازەی[3] دەرکردییـە. واتـا تەمـەنی چـوار بـەهارەو هەڕەتیەتی.

دیـاربوو بـاپیرم نرخەکـەی پـێ هـەرزان بـوو، ئەسـپەکەیان لێکـڕین. جامبـاز پارەیـان وەرگـرت و لێیانـدا ڕۆیشـتن. بـاپیرم گـوتی: کـوڕم حوسـێن بـا بـزانین ئـەو ئەسـپە بـۆ چ کارێـک باشـە؟ بنمـل و نیـر و بارێنەیان هاوێشتە سەر ملی، ئەسپی تـاین چـەنگی لـە ئاسـمانێ دەدا، قـەبوڵی نـەدەکرد، واتـا جـووت و جەنجـەڕی ناکـات. بـاپیرم گـوتی کێشە نییە، عارەبانەی بێنن بزانین بۆ عارەبانەی چۆنە؟ هێندەی لـەخۆ هەڵداو هەڵپەڕی، مژانەی عارەبانەکەی شکاند. هی عارەبانەش نەبوو!

باپیرم گوتی: زینـی لێبکـەن ئەگـەر بـۆ سـواری بـاش بێـت، دەیکـەینـە

---

١- تەریفە: تیێوتییەکی بێنەنداز.

٢- شیلە: ددانی شیریی ولاخ.

٣- بەرازە: ددانێکە کە دوای چوار ساڵ تەمەنی ولاخ دەردەکەوێت.

ئەسپی سواری بۆ ڕاوێ. زینیان لێكرد گوتیان ئەحمەد یان مەولودی سوار دەكەین و دەیبەستین. مامم گوتی ئەوانە منداڵن نەبادا یەكیان بكوژێ، با یاسینی سوار بكەین. مامم یاسینیان سوار كرد، ئەسپی تایین هەستاوە سەر پاشوان، وەک گای خوداری، لەخۆی هەڵدەدا. هەڵات بۆ سەر جۆخینان. ئەسپ، مامم یاسینی هەڵگرت، لە ناكاو مامم یاسین خۆی فڕێدایە سەر قرشەی جۆخینێ، باش بوو بە سەلامەتی دەرچوو، جەڵەوی ئەسپی گرتەوە و هێنایەوە، پەتک و سنگێک لەوێ بوو ئەسپی چەمووشیان لێبەستایەوە. باپیرم بە فیكەفیک چووە لای، دەیویست بیلاوێنێتەوەو قەشاویشی بكات، كاتێک گەیشتەلای ئەسپەكە، ئەسپ چەنگەبازی[1] باپیرم بوو، خەریكبوو بە چەپۆک بیكوژێ. باپیرم، ئەگەر دەستی بوەشاندبایە، زۆر دەسترەش بوو، نازانم داركراوە[2] یان سەرمژانكەبوو بە دەستیەوە، ڕایوەشاندە سەری ئەسپەكە، ئێسكی پشتی چاوی شكاند، نێوچاوانی بەخوێنداهات. باپیرم گوتی: دایكی ساحێبی ئەوەلێت ئاوا لێبكەم، نەیزانیووە بتعاملێنی! ئەتو هی جۆت و جەنجەڕی نەبی، هی عارەبانەی نەبی، هی زین و سواری نەبی، پێم نالێی هی چ كارێكی؟ بەس هی خواردن و لەوەڕانێی؟!

گوتی: كوڕم هەتا زەڕێكی نەكردووە، چەندی زووتر لە یەخەی خۆتانی بكەنەوە زیاترتان قازانجە!

بنۆڕنێ، لەگەڵ ئەو حكومەتە سی بەهارییەی خۆمان چەند وێک دەچن! حكومەتیش هی پەروەردەی نییە، ولات پڕ بوو لە نەخوێندەوار و بڕوانامەی ساختە. هی تەندروستی نییە، ئەوەی سەددامی دكتاتۆریش دروستی كردبوو وێرانیان كرد. هی دادپەروەری نیە،

---

١- چەنگەباز: بەرانگژ، بەگژداچوونەوە.

٢- داركراوە: داركلاوە، كەلاوە.

دادگاکانی خستە ژێر پرسیار و پڕی کرد لە دادوەری جاسووس. هی ئیدارەدانی هاوولاتیان نییە، دەبینین حاڵی خەلک چۆنە! هی خزمەتگوزاری نییە، هی دەست و تفەنگی نییە، لە شەنگالی و لە کەرکووکی چۆن قوچاندیان! ناوی پێشمەرگەیان سووک و ڕیسوا کرد. هی... هی... هی هیچ نین. وەرن مەردی خوای بن دەستبارەکم لەگەڵ بگرن، ئەو بەناو حکومەتە، هەتا ڕۆژێک زووتر لەیەخەی خۆمان بکەینەوە زیاترمان قازانجە! هەتا وەک ئەسپەکەی باپیرم حاجی، زەرێکی گەورەتری نەکردووە!

## هێسترە قولە لە کاتی ئالیک پێنەدانی

ماڵمان لە گوندی گردلانکە بوو، باپیرم حاجی تاهیر چوار کوڕی هەبوو، کوڕی گەورەی ناوی حەسەن بوو، مردبوو، من نەمدیبوو. واتە مامم حسێن و باوکم و شەهد یاسین مابوون. مامۆژنم گوستان، چونکە بەتەمەن لە هەموو بووکەکانی ماڵی باپیرم گەورەتر بوو، وەک گوناهی کردبێت کە بە هۆکاری گەورەیی تەمەنییەوە، مامم حسێن بە کامی دڵ هاوسەرگیری نەکردووە. بۆیە من هەستم دەکرد لە هەموان زیاتر کاری پێدەکرێ و دەڕەتێندرێ. بەرامپیلەکەی، لەکاتی کارکردندا هەمیشە منداڵێکی تێدابوو بە پشتیەوە. زۆرجار لە سێبەری کوندەرانی نێوەندی حەساری، جگەرەیەکی قامیشی پێدەکرد، بەڵام کە بانگیان دەکرد بەناچاری جگەرەکەی بە نیوەچڵی دەکوژاندەوە، دەچۆوە سەر کارەکەی. دەستەکانی، بە هۆکاری کارکردن گەورە ببوون، قەڵشەکانی نێو لەپ و پەنجەکانی، بە دەستی ژن نەدەچوو ئەوەندەی بە دەستی پیاوێکی زەحمەتکێش دەچوو! سۆمای چاوە کەنەفتەکانی ماندووبوونێکی بێئامان نیشان دەدا. لە کارکردندا، لەپێش هەموان و،

بۆ نانخواردن و پشوودانیش هەمیشە لەدوای دوایی بوو!

با لەباسەکەم لانەدەم. ولاغمان زۆر بوو، ئەسپەکەوێت و ماینەشێ بۆ سواری لەکاتی ڕاوکردن و سەفەر، هێسترەڕەش بۆ عارەبانەو قرشە کێشانەوە، نێرەکەرە دێزە بۆ دۆراب[1]، هێسترە قولە، بۆ جەنجەڕو جووت. بەو هێسترە دەگوترێ قولە، کە ڕەنگی لە بەینی سوور و زەرد بێت، ئەو ڕەنگە لە ئەسپ و ماین پێیدەگوترێ شێ.

لەو کاتەی دەبوایە وڵاغەکان ئالیکیان پێبدرێ، تەنها هێسترەقولە دەیکرد بە زۆڕە زۆڕ و، لەسەر ئالیکی خۆی بێدەنگ نەدەبوو، بۆیە داپیرم عەیشێ هەتا دەنگی تێدابوو هاواری دەکرد: کچێ گوستان! زوو ئالیکی بگەینە هێسترەقولەی، ئەگەرنا ئەو گوندەمان بەسەر وەردەکا! هێسترەقولە لەسەر ئالیکی خۆی بێدەنگ نابێ! کاتێک مامۆژنم گوستان، ئالیکی بۆ دەبردنە تەویلەی، من و شەهید حاجی ئامۆزام کە هاوتەمەن بووین، ڕامان دەکرد بەدووایدا، پێش هەموویان ئالیکی هێسترەقولەی دەدا، ئێمەش لەنێو قەرسەقول و زبڵی بەرپێی وڵاغەکان، لە خۆمان هەڵدەدا و چەپڵەمان لێدەدا دەمانگوت بژی هێسترەقولە! مامۆژنم لێمان تووڕە دەبوو، دەمانپرسی بۆ لەپێش هەموان ئالیکی هێسترەقولەی دەدەی؟ دەیگوت: بچنە دەرێ! بەو گچکەییەی دەرێی ئاوقاتن ئەو پرسیارانە دەکەن، گەورە بن لە هێسترەقولەی بێحەیاتر دەبن!

---

[1] - دۆراب: ڕاکێشانی دۆلکەی ئاوی ئاعوور بە وڵاخ.

## شەوتا

چەند ڕۆژێک بوو، ڕۆستەم لە کاتی زەردەپەڕی ئێواران بۆ ڕاوە بارانبڕە[1] دیار نەبوو. لە هاویشتنی دارلاستیک، زۆر کارامەو دەستڕاست بوو، زۆر جار هەر لە هەوا دەیئەنگاوتن و دەیهێنانە خوارەوە. بارانبڕە، باڵندەیەکی ڕەشە، لە پەڕەسێلکەی گەورەترو هەراشترە، لاقی زۆر کورتە، لە ئاسمان بکەوێتە سەرزەوی ناتوانێ بفڕێتەوە. تەنها لە کونی دیوارە بەرزەکان دێتە دەرەوە، ناتوانن لەسەر زەوی هیچ خواردنێک بخۆن، تەنها لە هەوا ئەو مێروولە بە باڵانە و پەپولە و هاوشێوەکانیان دەخۆن. منداڵانی ئاوایی، یەک لەوی دیکەمان دەپرسی: بۆ چەند ڕۆژێکە ڕۆستەم دیارنییە؟ برا بچوکەکەی گوتی: ئەوە لە هەفتەیەک ڕابردووەوە کەوتۆتە ناو جێگاو، نەخۆشە، دەڵێن ڕەنگە گرانەتای بێت. لەوکاتەی ئێمە چوینە لای، هەرکەسەو هەر لە گۆترە بە مەزەندەی خۆی، نەخۆشیەکەی دەستنیشان دەکرد. نەنکی دەیگوت: لەوەتای سەفارچی[2] هاتبوونە گوندی بۆ سپیکردنەوەی هیرباری سفر، وەک مەنجەڵ و تەشت و سێنی و قاپو لەگەنی خەڵکی ئاوایی، ئەو کوڕیژگە کەوتیتە نێو نوێنی. مامۆژنی دەیگوت: لاڵ بم بۆت ڕۆستەم، بە خوای دەردە پیسەکەیەتی بەمەرەدی جوانەمەرگی برام دەچی! دایکی دەیگوت: ڕۆڵە یاخوا چاوی داکت کۆرەبی بەخوای ئەو کوڕەم لەو ڕۆژەی بارانە سەربەکراوە و تەزرەکە باری، لەگەڵ گرمەی گەواڵە و بروسکان وای

---

١- بارانبڕە: باڵندەیەکی وەکو پەڕەسێلکەیە بە ڕەنگی ڕەشتەنها لە قەدی دیوار و کەندەڵان هێلانە دەکات. ناتوانێ لەسەر زەوی بفڕێ و تەنها لە شوێنی بڵندەوە ۆی فڕێ دەدا و باڵەکانی لە یەکتر جیا دەکاتەوە. بکەوێتە سەر زەوی ئیدی ناتوانێ بفڕێتەوە.

٢- سەفارچی، سفرچی، مزگەر، مسگەر. ئەوانەی کە مەنجەڵ و تەشتی مسیان سپی دەکردنەوە.

بەسەرهات، دەبێ مزی بەسەردا بتوێنمەوە بزانم لەچی ترساوە!

باوکی لەو قسەی زۆر توڕە بوو کە گوتیان لە بروسکو گرمەی گەواڵەی ترساوە، بۆیە گوتی: حەیفو مخابن نەوەی ئۆمەرەچۆپەی بترسێ! دەگێڕنەوە ئۆمەر لە هەڕەتی گەنجی لە شەوارەی منداڵێکی تازە لەدایکبوو، خەنجەری دەبانی هەڵکێشاوەو لەسەر ملی شەوەی داناوە، هەر زوو داوای دەرزی لێفانو سوژنی کردووەو لە یەخەی شەوەی داوە، مسەخەری کردبوو بۆ خۆی تەنها ئەو دەیتوانی ببینێ، چونکە کڵاوی سەخرەجندی لەسەر بووە!

ڕۆژی دوایی باوکم چووبووە گوندی شێراوەی بۆ لای چەخماخسازی چەک چاککردنەوە، باقەنەزمەی[1] تفەنگەکەی بۆ چاک بکاتەوەو بزانێ ئاخۆ ئەو تفەنگە لوولەکوش[2] کراوە یان نا! هەروا جغارە خۆرێک دەبوو گەیشتبۆوە ماڵێ، گەنجێکی هاوسێمان هات گوتی: وەستا عەلی، ئەمشەو بانگڕادەدێرین بۆ ڕۆستەمی، دەڵێن گرانەتایەتی، ئەتۆش دەبێت دەرمانی شیفای نەخۆشیەکەی بۆ دیاری بکەی!

ئاخر دەبوایە ئەوەی دەرمانەکە دیاری دەکات، دوو ژنی هەبێت. پێیان دەگوت ماخۆی چوار چاو، بەو پێیە بابم ماخۆی چوارچاو بوو. بە زۆریش فڕوجێکی ڕەشی بێ نیشان دیاری دەکرا وەک دەرمانو شیفای گرانەتا. ئەو ماڵەی نەخۆشەکەیان هەبوو، خێزانێکی قەوغەو زۆر بوون، پیشەیان ئاژەڵداری بوو، خاوەنی مێگەلەمەڕێکی زۆر بوون. بەڵام دڵیان نەدەهات مەڕێک سەربڕنو گۆشتەکەی بخۆن. لە دوای نوێژی خەوتنان سەگەکەمان کە ناوی قەلە بوو، دەحەپیو

---

١- باقەنەزمە: میلی تفەنگ.

٢- لوولەکوش: کاتێک لوولەی تفەنگ، بەهۆی تەقەپێکردن و بەکارهێنانی زۆرەوە، فەراح دەبوو، چەخماسازەکانی چەک، دەرکی لوولەکانیان دەگوشی و تەنگیان دەکردنەوە.

سەگوەڕێکی توند بوو، هێرشی دەبرد، دیاربوو هەنگامەو غەڵبەغەڵب لەپێش ماڵی ئێمە پەیدابوو، هاواریان دەکرد: (شەوتا، شەوتا، بەشەو دەگری تا، بەڕۆژ بەردەدا، ماخۆی چوارچاو! چ دەرمان دەدا؟). بابیشم کە ماخۆی چوارچاو بوو گوتی: (جەرگو هەناوی کاوڕێکی قەڵەو!) سێجار ئەو بانگەوازەیان لێکرد، باوکم هەر گوتی کاوڕ! چونکە دەیزانی ئەو ژنو منداڵانەی ئەو ماڵەمەڕدارە چەند تامەزرۆی گۆشتن! خەڵکی گوندی دەیانگوت وەستا عەلی ئەو کارەی بە حەجێکی هەبوو، یاخوا دەستەکانت خۆشبێ ئەو ماڵو منداڵانەت تێرگۆشت کرد!

## قالە

ڕووداوگەلێک کتومت بە ئەقڵ و لۆژیک و ئەندێشەی سەردەمی خۆی، دەیاننوسمەوە. ڕەنگە لەگەڵ چەمکو تێگەیشتنی سەردەمی ئێستاو گۆڕانکارییە خێراکانی، بەرانگژی یەکتربن، لەگەڵ سەردەمی تەکنۆلۆژیا هاوتەریب نەبێ، مەبەست لە تۆمارکردنیان هەوڵدانێکە بۆ بە دیکۆمێنت کردنی ڕووداوەکان و دابونەریت و کولتووری سەردەمانێک، لەژێر کاریگەری نەرێنییەکانی ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکیو دەرەبەگایەتی کۆمەڵگا چ ژیانێکی سەختی بەڕێ دەکرد، لەگەڵ شیرینیو چێژی سادەییەکەی ژیانی ئەوکات...

هاوینێکی هێندە گەرمە دنیا بۆنسۆی لێدێ، ئەو دەشتە پانو بەرینەی هەولێر، هەتا چاو بڕدەکات وەک هالاوی گڕی ئاگر هەڵدەچێت، وەک تراویلکە (سەراب) مێرووڵەی دەکات! گوندەکە، شەش ڕێگای دەهاتەوەسەر، هەر ڕێگایەکی بەناوی ئەو گوندەوە بوو

کە لێوەی دەهات بۆ ئاواییەکە. لەجێی جۆخینان چەند قۆمەتە[1] کاو کوزرو بنجۆخینی لێ بەجێمابوو، تەماشای پشتی هەرپیاوێکی ئاواییت دەکرد، لە ئارەقەی سپی، سپی بووە، دەڵێی دۆو ماستاوت بە پشتیدا کردووە! بۆتە مەدۆنە، ئەوەی لە هەموو خەڵکی ئاوایی حەساوەتر بوو، سەگەکانیان بوون، لەژێر چکەی دڵۆپە ئاوەکانی کوندەڵانی وەردەکەوتن.

ئەو ڕۆژانەی بای هوڕەی دەهات، نەماندەتوانی کۆترە تەقڵەبازەکان هەڵبفڕێنین، چونکە پەراگەندە دەبونو بایەکە لەگەڵ خۆی لوولی دەدانو دەیبردن، ناچار دەچووینە گژ عەلەشیشەکان و فیتوومان بۆ لێدەدانو دەمانگوت عەلەشیش گاڕان هات، ئەوانیش قلوقلویان دەکردو خۆیان فش دەکردەوە. ئەو ڕۆژانەی خۆڵباران و دنیا تۆزو غوبار بوایە، دایکم دەیگوت: ئاخۆ لەکوێ جەنگ ڕوویدابێت، ئاوا دنیا لە خۆڵێدا غەرق بووە، چاو چاوی نابینێ!

بابم بۆ ئەوەی لەو جۆرە ڕۆژانە نەچێتە دەرەوە، دەیگوت تۆزێک چاوم گەرم دەکەم، لێمگەڕێن با تۆزێک ببۆرژێم[2]، بەو شێوەیە گورگەخەوێکی دەکرد، چونکە تازە لەسەر قەبران گەڕابۆوە. لەگەڵ گەردی بەیانی، لە قەبرستانی گوندی خەریکی گۆڕهەڵکەندن بوون، بۆ مەلایەک کە مردبوو. گۆڕهەڵکەندن لەو گوندەی، وەک ئەوە وابوو فەرهاد کێوی بێستوون بکۆڵێ، هێندە ڕەق بوو، بۆیە دایکم دێمکەئاوێکی دایەدەستم گوتی: بڕۆ بۆ باوکتو ئەو پیاوانەی بەرە، خەریکی گۆڕهەڵکەندنن، ئەوا منیش چاوم لێتە. کاتێک دێمکەئاوەکەم دایەدەست باوکم، خۆڵیان بەسەر تەرمەکەدا دەکرد، ئەوەی تاوەکو ئێستا لەلام ئاسایی نەبوو، لەجیاتی دوو کێل سێ کێلیان بۆ ئەو

---

١- قۆمەت: کۆمەڵە قەسەڵ.

٢- بۆرژان: سەرخەو، نیوەخەولێکەوتن، لەنێوان خەو و بەئاگاییدا.

مەلایە چەقاند، منیش لە باوكم پرسی: باوكە ئەوە بۆ هەموو گۆڕەكان دوو كێلیان هەیە ئەو گۆڕە لەنێوەڕاستی هەر دوو كێلەكە كێلێكی دیكەشی هەیە؟ باوكم گوتی: ئاخر ئەوە مەلای دوازدە عیلمە، دەبێ سێ كێلی هەبێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆڕی خەڵكی جیا بكرێتەوە.

هەر لەپاش نوێژی عەسرێ، بەنیازی شیولێنان بۆ ماڵی مردووەكە، لە هەموو ماڵەكانی ئاوایی ئاگردانەكان دوكەڵیان لێهەڵدەستا بەرەو ئاسمان كۆڵەگەی دەبەست، سێ ڕۆژ ئەو شیولێنانە بەردەوام دەبوو، هەركەسەو بەگوێرەی توانای خۆی شیویان بۆ مزگەوت دەبرد بۆ پیاوەكان. وە هەروەها بۆ ژنانیشیان دەبرد، بەو شیوە دەگوترا (شیوەغەریبە[1])، ژنانی ئاوایی هەریەكەو سینیە شیوێكی لەسەر دەستی بوو، بەرەو ماڵی مردووەكە. باهوڕەكە پەڕۆكی سەر شیوەكەی دەڕفاند، ژنانی ئاوایی دەیانگوت: ئەو باهوڕەیە غەزەبی خودایە لێمان دەگیرێ، بەهۆی مردنی ئەو عالیمە گەورەیە، ئاخر قورئانی هەموو لە سینگیدا بووە، خۆزگەم بەخۆی كە ئێستا لەنێوەندی بەهەشتێیە!

قالە، تەمەنی دوازدە ساڵان دەبوو، تۆزێك لە ئێمە باخۆشترو هەراشتر بوو، هەمیشە بەردەقانی ڕاست و چەپ لەملی حەمایل دەكردو دارلاستیكی بە ملییەوە بوو. گیرفانەكانی، یەكیان پڕ لە بەردی دارلاستیكو ئەوەی دیكەیان بەردی بەردەقانی بوو. تازە چاوێكی برازای حەمەنەخۆشی كوێر كردبوو كە كچێكی عازەب بوو. بە دارلاستیكەكەی، حاجی لەقلەقێكی لەسەر جوجكان كوشتبوو. بەو كارانەی ناوی دەركردبوو. لە ئاوایی وا ناسرابوو كاتێك پەڕەسێلكەیەك، بارانبڕەیەك بە مردوویی بدۆزرابوایەوە خەڵك

---

[1] - شیوەغەریبە: ئەو شیو یان چێشتەی بۆ ماڵی خاوەنمردوو سازدەكرێ.

دەیانگوت کاری قالەیە! مریشکێک لاقی بشکابوایە دەیانگوت قالەیە. خولاسە بەردێک لە ئاسمان بەسەری یەکێک کەوتبا دەیانگوت کاری قالەیە. قالە وەک فەرماندەیەکی سەربازی ناوی دەرکردبوو، ڕۆژ تا ئێوارە منداڵانی ئاوایی بەدوایەوە بووین، هەرچی ئێمەش بمانکردایە هەر بەملی قالەیدا دەهات! ئەویش باکی پێ نەبوو. بابی، پیاوێکی لەسەرخۆو هەژار بوو، قالەی بۆ بەرزەفت نەدەکرا.

خۆشناو هاتنە ئاوایی ترێیان هێنابوو، بانگیان دەکرد: دە وەرنە ترێیان، سەر بەسەر بە گەنم، یەکو نیو بەجۆ. هەر بابا بوو بە جامێک، لەگەنێک، تەشتێک گەنمەوە یان جۆ دەگەیشتە لای خۆشناوەکان و لەبەر تەرازووی دەناو بەترێیان دەگۆڕیەوە. مام قادر پیاوێکی پیری نابینابوو، جامێکی پڕ لە ئاوی شەوی کوندەی لەپێش بوو، هێشووە ترێیەکی زۆر گەورەی لەنێو بوو، چەند دەنکێکی لێ خواردبوو، کاتێک دەستی لەنێو ئاوەکە گێڕا ترێیەکە نەمابوو، تۆزێک دەستی لەولاو لەولای خۆی کوتا، هیچی وەبەردەستی نەکەوت. هاواری کرد: بمگەنێ قالە ترێیەکەی برد! هەرچەندە چاوی فڕ نەیدەبینی بەڵام ئەو کارەی لە قالەی دەزانی!

غارمان دەدا بۆ سەر جۆخینان، ڕوومان لە هەر خاوەن جۆخینێک دەکرد دەمانگوت خەرمان بەرەکەت، ئەویش دەیگوت ئای خێرو بەرەکەتی خواتان لەگەڵ بێت، وەرن کورِم با گەنمتان بدەمێ، لەلای مام خۆشناوی بە ترێی بدەن. ئێمەش کۆشمان دەگرتەوە بۆیان پڕ گەنم دەکردین، ئای چ بەخشندەییەک و چاوتێرییەک لە ئارەقی نێوچاوانو قەڵشەکانی نێو لەپی دەستیان دەڕژا!

قاله، شەوانیش دانەدەکاسا، چالاکیمان هەبوو، کۆدەبوینەوە دەچووینە هەوێزی مێگەلەمەڕی مارێ مام فەندی، سواری پشتی بەرانەکان دەبووین، ئەو مێگەلەمەڕە دەڕەویەوە، غرمەی دەکرد،

دەنگی زەنگوڵی ملی نێریەکان هاڕەی زرینگانەوەی لە هەموو گوندی دەبیستـرا، لەکاتێک مام فەندی بە هەشتاوی دەهاتە دەرەوە بە خۆ بە گۆپاڵەوە، ئێمەش لەنەویایی گەڕێ[1] لەسەر زگ ڕادەکشاین و هەناسەمان لە خۆمان دەبڕی، مەگەر پێی لەسەر پشتی دابنابایینا ئەگەرنا ئێمەی نەدەبینی. مام فەندی هەتا دەنگی تێدابوو فیکەو ئحێ ئحێی بۆ مێگەلەکە دەکرد، دەیبینی لە هەوێزێ تۆز بەری ئاسمانێی گرتیە، مەڕ قوڕەپێچ بووەو بۆتە تۆپ، وەک گورگی بەنێو وەربووبێت! مام فەندی دەیگوت پێم سەیرە سەگەکانیش ناوەڕن هیچیش دیار نییە! ئاخر سەگەکان ئێمەیان دەناسی چونکە نانمان دەدانێ بە ئێمە نەدەوەڕین.

کاتێک مام فەندی دەچووە ژووری، دووبارە سواری پشتی بەرانەکان دەبووینەوە و غارمان پێدەدان، هەتا بە ناچاری شوانەکە بە قاپووتەوە دەهات لەنێو مێگەلەکە ڕادەکشا. ئێمەش بە سەر و گوێلاکی تۆزاوی و کراسی دڕاوەوە بەپارێز دەچووینەوە ماڵێ، لە ترسی لێدانی دایکم، بە دزیەوە خۆمان لە جێگای دەخزاند. قالە، ڕۆژێ هێندەی دەڕەتاندین بەولاو بەولادا، شەوان هێندە کفت دەبووین، هەر سەرمان بە بالیفی دەکرد خەومان لێدەکەوت. زۆر جاران قۆڵی کراسم پێوە نەدەما لەبەر شەڕەمنداڵی! بەیانی لە دەنگەدەنگی دایکم خەبەرم دەبۆوە دەیگوت: هەردووک چاوم کوێر بێت، ئەو قۆڵەکراسەی بۆ پێوە نەماوە! بەڵام هەتا بەخەبەری نەدەهێنام، دەستی بە لێدانم نەدەکرد، دەیگوت لەخەوێدا لە منداڵی بدەی شێت دەبێت!

بەیانی، تازە سروەی نەسیمی سەبای ساڵحان دەنگوت، بە هەمان

---

١- گەڕێ: قوڵاییەکی گەورە و خڕ، بازنەیی.

شێوەی ڕۆژانێ بەرێ، قالە لەسەر گوفەکێ حازرو ئامادەباش چاوەڕوانی دەکردین. هەر ئۆتۆمبێلێک، سوار ولاخێک، پیادەیەک، ڕووی لە گوندی بکردایە قالە دەچوە پێشوازیو ئێمەشی بەدواوە بووین، دەبوایە قالە بزانێ بۆ هاتۆتە گوندەکەمانو چ کارێکی هەیەو دەچێتە ماڵی کێ؟ خۆی لێدەکرد بە چاوساغ و بەپێشی دەکەوت هەتاوەکو شوێنی مەبەست، ئێمەشی بەدواوە بووین.

چێشتەنگاوێکی درەنگ بوو لە دووریانێ ئۆتۆمبێلێک تۆزی دەکرد، بەرەو گوندی دەهات، ڕەشاش برێنیان لەسەر ئۆتۆمبێلەکە دابەستبوو. قالە گوتی ئەوانە چەکدارن. دیاربوو حەمەی سابیر ئاغای بوو لەگەڵ جاشەکانی، مام عەلی کوێخا قادریان ئاگادار کردبوو میوانی دەبن، ئەویش بۆ سەلامەتی گوندەکەمان و وەک دەم چەورکردن، گیسکی بۆ سەربڕیبوون. بەرلەوەی نانوشیو ئامادەبێت، گوتیان با تفەنگانێ بکەین، بزانین کامەمان نیشانەشکێنە، هاتنە سەر گوفەکی پێش ماڵی ئێمە، بەردێکی سپیان لە گردی موهەندیسی نیشانەکرد، بە ڕەشاش برێن و تفەنگی ئینگلیزی و کەنەدی تەقەیان لە بەردەکە دەکرد و نەیاندەئەنگاوت. ئێمەی منداڵیش هێشتا قەوان نەدەگەیشتە ئەرزی، خۆمان بۆ فڕێدەدا و دەمانکرد بەشەڕ لەسەر قەوان. یەک لە جاشەکان ناوی ئەنوەر شەشخەریتە بوو، یەکی قولەخڕەی تێکچەقیوو بوو لەبەر خەریتە و فیشەکدان هیچ شوێنێکی بەدەرەوە نەبوو!

کە ئەنوەر شەشخەریتە بینی ئێمە زۆر بە تاسەیین بۆ قەوان، گوتی ناهێڵم قەوانەکان بۆ خۆتان بەرن، دەبێ بۆتان بکەم بە گوێفڕکانێ، دووری هەڵدەدەم بزانم کامەتان زووتر دەهێننەوە! هەر منداڵێک قەوانەکەی هەڵدەگرتەوە ئەوانی دیکە گوێیان ڕادەکێشا. تاوەکو قەوانەکەی فڕێدەدا، گوێیان بەرنەدەدا. گوێی هەر منداڵێکیان

ڕادەکێشا، لەتاو ئازاری گوێی قەوانەکەی فڕێدەدا. دیاربوو ئەو جاشە لە بەشەڕدانی منداڵەکان لەزەتی دەکرد! هێندەیان گوێی خەسرۆی ڕاکێشا گوێی بەخوێندا هات، سۆتەکە جگەرەیان بەپشتی گوێیدا کرد. قالە گوتی منداڵینە وەرن با بڕۆین قەوانی جاشانمان ناوێ، کە پێشمەرگە هاتنە گوندی و تەقەیان کرد قەوانی پێشمەرگان هەڵدەگرینەوە!

زۆرم برسی بوو، گوتم بەجێم مەهێڵن دەچم نانێکی دێنم دەیکەمە پاروو. چومە گژ تەشتێ نانی نانەکم ڕاکێشا، دایکم گوتی کوڕم نەکەی لە ماڵێ داکاسێی هەتا هەموو گوندی سەراوبن دەکەی! بەتەوسەوە وای گوت، تەڕ ئارای قالەتان هەڵگرتیە وەک سەی پێ سوتاو لەوسەری بۆ ئەوسەری گوندی! بە تورەیی نانەکەی لێوەرگرتم، سەوەشیرەکەی هەڵدایەوە هەندێک ماستی بۆ لە نانەکەی هەڵسوویم و بۆی کردمە بابۆڵەو دایەدەستمو گوتی بڕۆ با ئیشەکەتان مەعتەل نەبێت، منداڵ چاوەڕێت دەکەن، بەغەوسی بەغدایێ، قالە سەری هەمووتان بە فەتارەت دەدات! هەر بەخۆی گوتی ئەنگۆش گەلەک لە قالەی ساڵحتر نین، بەڵام وەک دەڵێن هەموو تەیر گۆشتخۆرە هەر ناوی گورگی بەدە! بەلای ماڵی پلکە عەیشێ دا ڕەت بووین، دیاربوو لە سێبەری خانوی، لەگەڵ چەند ژنێکی گوندی بە دەم دەستاڕ سوڕاندن و گەنم هاڕین بۆ بروێش، گۆرانیان دەگوت، قالە گوتی کوڕینە وەرن فرسەتە لەبەر دەنگی دەستاڕو گۆرانی، ئاگایان لە ئێمە نیە، پشتم بۆ دانێنەوە دەچمە سەربانی داندۆکو کەشکتان بۆ فڕێدەدەمە خوارێ، دەچین لەلای باخچەی توور و سرقی ماڵی شێخ جەلالی دەیخۆین، بە هەموان قالەمان سەرخست، کۆشمان گرتەوە بۆ کەشکو داندۆکی، بەشی خۆمان برد، لە پەنای باخچەی، هێشتا تەواومان نەخواردبوو لەوسەری گوندی حەشاماتێک

لە باربەر بەرەو گوندی دەهاتن، چوینە پێشیان سێ پیاومان بینی، یەک ڕەوە هێسترو بارگینو کەریان پێبوو، بەنێو ئاوایی وەربوون. قالە گوتی دەچنە ماڵی کێو چ کارێکتان هەیە؟ گوتیان دەچینە ماڵی ناڵبەندەکەی ئەو ولاخانە ناڵ دەکەین، هەموویان بنی سمیان سواوەو قەیاریان[1] درێژبووە ناتوانن بڕۆن لەبەر بێ ناڵی. وەک هەمیشە قالە بە پێشکەوت و گوتی وەرنە دوام! بوو بە چاوساغیان و ئێمەش بەدوایەوە!

کاتێک لە ماڵی ناڵبەند نزیک بووینەوە کە ولاشڕاوچی باوکم بوو، دێڵەتاژیەکی زۆر خێرای هەبوو ناوی قوتە بوو، دیاربوو بە قاپوتی شوانان خۆیان بەسەر تاژیەکەدا دابوو، قروچکەو نوسکەی دەچووە کەشکەلانی فەلەک! تاژیەکە بە با هاتبوو[2] خاوەنەکەی نەیدەویست تاژیەکە لەگەڵ گۆڵەتاژی جووت ببێت، نەبادا توتکەی لێ پەیدابێت و لە ڕاوبکەوێت و خنۆک[3] بێت، بۆیە خەریک بوون دوو سنجاق (قولابە)یان لە ئەندامی زاووزێی دەدا. یان زۆرجاریش بە چەقۆی سوورکراوە ئەندامی زاووزێی دێڵەتاژیەکەیان داخ دەکرد، بۆ ئەوەی لە با بچێتەوە. لەوان ڕۆژگاران، ئاژەڵی مێینەش دەبوایە باجی مێبوونی خۆی بدات!

دایکی قالەی هاتبووە ماڵی ئێمە، داکیم لەسەر تەندووری خەریکی برژاندنی ئەستوورکە ئاردەساواری بوو. ئەویش منداڵێکی ساوای لە ئامێزێ بوو، بە دایکمی دەگوت: هەر خێرم لەسەربوو ئەوشەو کچەکەم نەخنکابوو، بەیانی کاتێک لە خەو هەستام چ ببینم، دەسترازەی لانکەکەی شل ببۆوە سەری شۆڕ ببۆوە، نەیگەیشتبومایە

---

١- قەیار: سمی ولاخ ئەگەر درێژ بوو پێی دەڵێن: قەیاری هاتووە. لە جێی ئەوەی بڵێن: نینۆکی هاتووە.

٢- بە با هاتبوو (بە باهاتن): وە هەوەسهاتنی وەختی جووتبوونی سەگ و تاژی.

٣- خنۆک: تاژییەک کە لە ڕاو دەکەوێ و ناگاتە کەروێشک.

دەخنکاو قورِم بەسەری دەبوو. ئێستاش نەخۆشەو هێناومەتە لای تۆ ئەوە هەفتەیەکە سەروملی ڕاناگرێ، شەشدەرمانەم[1] داوەتێ و لەلای شێخ تەهای نوشتەو کشتەکم بۆ کردووەو لە شەمێ مشتم[2] گرتوەو ئەوەتا لە شانیم دوریووە، بەڵام هیچ چاکتر نەبووە، هەندێک دەڵێن بۆنی کردیەو بە بۆنێ کەوتییە، هەندێک دەڵێن چاووزارە، هەندێک دەڵێن پەرکەمە، هەندێک دەڵێن فرچکی کەوتووە. بە قوربانت بم دەڵێن دەرمانێکی باشت هەیە ئەگەر بماندەیێ! دایکم مەلاشوی هەڵدایەوەو گوتی: ئەوە چاوی خێل بووە! فرچکەوەجێی پێکرد، دەیگوت فرچکەوەجێ فرچکی ئەو منداڵەی بێتەوەجێ، فرچکی ڕیویان بچی لەجێ، سەلەوات لە دیداری محمدیو، نێو لەپی دەستی لەهێنی پێی دەداو سەراوبنی دەکرد. لەوکاتەدا من خەریکی تەماشاکردنی ئەو تۆزقاڵە تۆزانە بووم لە دەوری ئەو کۆلکەتیشکانەی دەڕژانە نێو ناندێنی بە چاو دەبیندران فووم لێدەکردن. دایکم بانگیکردم: بڕۆ لە دەلاقەی لای ماڵی پلکەخەیارێ[3]، شووشەدەرمانەکی لێیە بۆم بێنە دوو مراکەچای بدەمێ، دەستبەجێ چاک دەبێتەوە، ئەوە ڕازیانەو زەنجەفیل و دارچینی هاڕدراوە، متفەڕکی غەوسیشی تێدایە.

لە دوای ئەوەی دەرمانەکەیان دەرخواردی منداڵەکەی دا، دایکی قالەی کەوتە گازاندان لە قالەی کوڕی: قادرۆکەی من ئەوەندە سەرەڕۆو سەردڕە[4] هەر پێدەوەستم ئانیشکی کورتەکو سەرچۆکی شەرواری بۆ بدوورمەوەو پینە بکەم، نە بزگوڕ و نە پێڵاوی بە

---

١- شەشدەرمانە: دەرمانێکی میلی بوو تایبەت بوو بە منداڵی بەبۆنکەوتوو. لە شەش جۆر گژوگیا ساز دەکرا.

٢- شەمێ مشت: ئەو دوعا و نوشتەیەی کە لە (شەمع) مۆم دەگیرا.

٣- دەلاقەی لای ماڵی پلکەخەیارێ: ئەو دەلاقەیەی دەکەوێتەی لای ماڵی پلکە خەیاڵ.

٤- سەردڕ: منداڵێک کە بەهۆی عەجوولی و جوڵە و بزۆزییەوە جلوبەرگ زۆر دەدڕێ.

بەرەوە نەماوە، شمەک خۆی لەبەر ناگرێ! خوشکۆرە لە خەفەتی ئەو کوڕە ئاگرو پەنگرەی نەبوایە، بە بیست ساڵیدیکە داوم لەسەری سپی نەدەبوو ئاوام بەسەر نەدەهات، ئەوها بڕوا داوی ڕەشم لە سەری نامێنێ لە خەفەتی قالەی، ڕۆژ تا ئێوارە مندارە هورتکەی گوندی بە دو خۆی دەدا لەوسەری گوندی بۆ ئەوسەری گوندی! ئاخر ئەوێ ڕۆژێ کابرایەک ئەسپی هێناوە، حاجی حەکیم بۆی بخەسێنێ، قالەی کوڕم دەلحازی لەوێ حازر بووە. ئەسپیان لە عەرزی داوە، ئەسپی تایین لەتاوی ژانی خۆی پەلەفرکێی کردووە، سمی پاشووی لە شەرواری قالەی کوڕم گیربووە، هەر لە نیفۆی هەتا دەلینگی هەرزڕاندبوو، هەر خێرەکم لەسەر بووە گۆشتی نەگرتبوو، ئەگەرنا جێی دەکردە ئەو جێ و قوڕم بەسەری دەبوو، ئێستا قالە لەنێو قەبری بوو! دونێ هەموو دونێ هەردوو دەستو نینۆکم چوو لەگەر داوودوورمانی، شەرواری لۆ قالەی بدوورمەوە. خۆ لوشکەی ئەسپی بیگرتابوایە بە غەوسی بەغدایێ فەراقی ڕەشی لێدەبڕاو جارێکی دیکە قالە نانی کەرت نەدەکردو جێی دەکردە ئەوجێ! لەسەر نانی نیوڕانێ لۆ بابی دەگێڕاوە چۆن گوونی ئەسپیان قەڵاشتوە و هێلکەکانیان لێ دەرهێناوە. خۆم پێ ڕانەگیرا چەپەرۆکەکی زڕدایکانەم لە تەپڵی سەری داو نقەم لێبڕی پێمگوت ڕۆڵە لەسەر نانی چۆن باسی ئەو شتانە دەکەی! خوشکۆرە ئەوە هەمووی بەختو یەغباری منە، قالەی من بەگژ گەورانیشدا دەچێت، ڕۆژی پێنجشەمێ ڕابردوو، لە شایی ماڵی سەلیمی ئەحمەدی، دۆڵو زوڕنا دەیکوتا، شایی و ڕەشبەڵەک ئەوسەری دیار نەبوو، سمەی خەجێ جاحێڵە، نەیزانیبوو پیاو دەبێ لە پێشڕا بچنە نێو شاییو ژن لە دوایێڕا بچنە شایی، وەکو ژنان لە

پاشڕا چووبوە نێو شایی، ئەو زیڕەکوشتیەی[1] کوڕم بەوەی زانیووە لەنێو گوندی بە سمەی گوتووە سمەژنانی! ئەویش خڕکەبەردێکی ڕا ئالاندۆتێ، خوا ڕوحمی بە من کردووە قالەی نەگرتووە، دەیانگوت بە دیواری مارێ کەریمی کەوتووە، هێندەی سەرکەپەنیرەکی کەستەک لە دیواری کردۆتەوە! ئەگەر بە قالەی کوڕم کەوتبایە جێی دەکردە ئەو جێ، کەسی بە زمان نەدەگەیشتە سەرێ!

هەر کەسێک لە گوندی بیویستایە کارێک بە منداڵانی ئاوایی بکات، دەبوایە قالەی ڕاسپێری، بۆیە دایکم بە نیازی ڕاچاندنی[2] چیغێک بوو، دەبوایە ڕایەڵەکانی چەند بەن بوایە، دوو هێندە بەردەی بەقەد بستێک درێژوکانی بێنن، بە هەویری سەری داوەمووە ڕسراوەکەی تێوەرپێچن. دایکم گوتی بڕۆن ها ئەوە گونیەو جۆڕک و تورەگان بەرن، بڕۆنە لای چاکەغەریبەی بەردم بۆ بێنن. قالە گوتی: پلکە بەدیعە چەند بەردی بێنین، دایکم گوتی ڕایەڵەکەی زیادەیە، یانی سێزدە، چونکە کەس ناوی ژمارە سێزدەی نەدەهێنا پێیان وابوو شوومە، دەیانگوت زیادە. دایکم گوتی جارەک بیستو شەش بەردان بێنن، واتا بیست و شەش بەرد. بە ژمارە حەفتاشیان دەگوت سێ جار بیست و دە.

قالە بە پێشمان کەوت چوینە ئەو زورگەی بەر ئاوایی، لەو کاتەدا سەرەتای پایز داهاتبوو، هەورەکان بەرەو کوێستان دەڕۆیشتن. سێبەرەکانیان بەسەر ئەو گردو تەلانو تەپۆلکانە و دەشتاییەکانی ڕادەخوشین و خۆیان لە زەوی هەڵدەسوو. ئێمەش لەنێو سێبەرەکاندا غارماندەدا، کاتێک لە پەرپەڕۆچکەی ئاسمانێ پۆلێک سیسارکە کەچەڵو داڵاشە کەلاکخۆرەمان بینی جۆخینەیان بەستبوو بە دوای

---

١- زیڕەکوشتی: منداڵێک کە زیرە دەکا و دەبێتە هۆی مردنی.

٢- ڕاچاندن: ڕایەڵکردنی بەن و داو.

یەكتردا لە ئاسمانێ دەخولانەوە، ئەوەش ئاماژەبوو بۆ بوونی كەلاك لەو نێوەدا.

قالە گوتی وەرن كوڕینە با بڕۆین بزانین ئەو دیووی گردی، كەلاكی چی لێیە؟ بۆ ئەوەی دالاشێك بگرین، پەڕی باڵەكەێ بكەین بە پیكو دووزەلە بۆ شایی! بە پارێز لە گەوەی گردی سوڕاینەوە، قالە وەك ئەو پڵنگانەی دەچنە ڕاوی ئاژەڵی كێوی، خۆی دەچەماندەوە، بە ئەسپایی پێی لەسەر زەوی دادەنا، كاتێك ئەودیووی گردیمان لێ بەدیاركەوت، كەلاكی لێبوو. سیساركو دالاشەكان هەر بابا بوو سەری لە هەناوی كەلاكی ماینەكە نابوو بەشی خۆی لێدەپچكڕاند، چەند هەنگاوێك لە كەلاكەكەی دوور دەكەوتنەوەو دەیانخوارد.

قالە گوتی: ئەمن لەسەر زگو ئانیشكم بۆیان دەچم، ئێوە نابێ بجولێن! دالاش و سیسارك وەك باڵندەی دیكە نین یەكسەر بفڕن، بەهۆی قورسی لاشەیان، چەند هەنگاوێك بەپێ غار دەكەنو باڵیان فش دەكەن، تاوەكو بە ئاسمان دەكەون.

كاتێك قالە زۆر نزیك ببۆوە لێیان، لنگی دانێ و كەوتە سەریان بەردێكی بە دالاشێكدا دا، پەڕی لێ بە باكرد بەلام نەكەوت، قالە هەزار سوێندی دەخوارد: ئەو چاكەغەریبە هەردووك چاوم مجرۆ بكات، ئەو پەڕانە لەگەڵ بەردەكەی ئەمن لێمدا لێی هەلوەری بەلام نەكەوت.

هێندە ماندوو ببوین لەو زورگانە هەموومان وەك تەماتەی سوورهەڵگەڕابووین، قالە گوتی با بڕۆینەوە لای بەردەكان. هەریەكەو بەگوێرەی توانای خۆمان بەردمان هەڵگرت، گەیشتینە دووریانێ، سوارماینەك لەلای تەتەراوەی ڕا دەهات، گەیشتە لای ئێمە، پیاوێكی ڕدێن ماشوبرنج، ڕیشی قەڵەم و كۆڕپە كردبوو، هەمومان بەیەكەوە گوتمان خاڵە ماندوو نەبی، ئەویش گوتی ئای عەمر درێژ بن، ئەوە

ئەو کۆڵەبەردانەتان بۆ چیە؟ قاڵە بەر لەهەمووان گوتی ئەوە پلکە بەدیعە چیغی ڕادەچێنێ، بۆ ئەومانە. پیاوەکە لە ماینەکەی دابەزی، گوتی بێنن منداڵینە بەردەکانتان بۆ لەو تیرەی دەنێم. هەر زوو بەردەکانمان دایەدەستیو لە تێرەکەی هاویشت. قاڵە وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، کەوتە پرسیاران: خاڵە دەچیە ماڵی کێ؟ ئەویش گوتی دەچمە ماڵی مام حەمەدی، نازانم نێرەکەرە شینەکەی ماینانی مایەیان نا، قاڵە گوتی بۆ ماینەکەت بە تەرەبە[1]؟ پیاوەکە گوتی بەڵێ، قاڵە گوتی ئێمە لەگەڵت دێین بۆ لای مام حەمەدی پێیدەڵێین ئەو نێرەکەرەی ماینان بدە بەو میوانەی ماینەکەی لێ چا دەکات[2]، بۆ ئەوەی جاش هێستری ببێت. لەسەر گوفەکێ، قۆڵتی ماین چاکردنی لێیە، پێیدەڵێین (قۆڵتی ماینان)، دوێنێ شێخ فاتیحی پۆریجەش هات ماینی لێ چا کرد. پیاوەکەش گوتی زۆر باشە. کاتێک پیاوەکە پشتی دەکەوتە ئێمە، قاڵە هەردووک دەستی لێک دەخشاندو تەماشای ئێمەی دەکرد، زەردەیەکی دەهاتێ یانی ئەمڕۆش بەزمێکم بۆ سازکردن، دەچینە سەیری ماینو نێرەکەرە شینی لە قۆڵتی ماینان! پیاوەکە بەردەکانی لەپێش ماڵی ئێمە دانان. دایکم گوتی ئەوە بۆ هێندەتان پێچوو؟ خۆ هەویرەکە هەمووی ڕەق بۆوە، ئێوە هەر نەهاتنەوە! بە فافۆنان هەر ئاوی بۆ دێناین و ئێمەش هەموومان دەخواردەوە، دەیگوت دەڵێی لە جەنگی مەغلوبەی گەڕاینەوە تەریفە بووینە لە تینوان و چاویان ڕەش بووە!

قاڵە پێش کابرای کەوت بەرەو ماڵی مام حەمەدی، کابرای بە مام حەمەدی ناساند، مام حەمەدیش لە دوای بەخێرهێنانی میوانەکە لە بن سمێڵانەوە هەر لێوی لە قاڵەی دەکرۆشت بەوەی کە هەموو ڕۆژێ

---

١- بەتەرەب: بەتەڵەب، وە هەوەسهاتن و وەختی جووتبوونی ماین.

٢- لێ چاک دەکا (لێچاککردن): کرداری جووتکردنی نێرەکەر و ماین لە یەکتری.

مشتەری ماین چاکردنی بۆ دێنێ و دەرگای ماڵی لێدەگرێ، بە خۆ و بە خاوەنماینەوە. قالەش تەبای کابرای خاوەن ماین، نێرەکەرەکەی لە مام حەمەدی دەخواستەوە.

هەموو بەرەو قۆڵتی ماینان بەرێکەوتین، قالە خاکەناسێکی هێناو دایەدەستی خاوەن ماینەکە پێیگوت ئەو قۆڵتەی هەندێک دەردەوە دەرێ، ماینەکەی تۆ زۆر بڵندە با نێرەکەرەکە پێیڕا بگات. کاتێک مام حەمەد بە نابەدڵی نێرەکەری هێنا دەرێ، نێرەکەر هەر چاوی بە ماینێ کەوت، هەر زوو ئامادەبوو بۆ سواربوون. لە کاتی ئەنجامدانی کاری جوتبوونەکە، قالە خۆی کردە خاوەنی ئیشەکەی، خۆش خۆش بە کابرای خاوەن ماینی دەگوت خاڵە زووکە شانت بدە بەر پاشووی نێرەکەرەشینی پاڵی پێوە بنێ بۆ لای ماینەکەی، بەڵکو دوو جاش هێستری جمکەی ببێ!

سەرەتای پایزەو نزیک بووینەوە لە گێژەلوولکەی بای پشیلۆکان[1]، کاتێک پشیلۆکەکان لە قوژبنی دیوارەکان کۆدەبونەوە، ئەوە یەک لە نیشانەکانی هاتنی پایزە. قەتێ، ئەو دەشتە پانو بەرینەی هەولێرو قەراجو کەندیناوەو شەمامک بەجێدەهێڵنو کۆچ دەکەن. قازو قورینگو مراوی بە تاقی ئاسمانەوە پۆل پۆل بە عیشقی گەرمەسێر، وەک بە کۆرس گۆرانیی کۆچ بەرەو مەفتەن بڵێنەوە، کاتێک یەکێکیان، بە هەرهۆکارێک بێ، لە ڕیز دەردەچێ یان دوادەکەوێت، سەرکردەکەیان دەگەڕێتەوە سەری و هەموویان باڵیان

---

١- بای پشیلۆکان: پشیلۆکە: گوڵی گیایەکی دەشتییە. وەک لۆکە سپی و تووکنە. کاتێک وشک دەبێ، بەهۆی سووکییەکەیەوە، با دەیبات. لە ڕۆمانی (کاریتە یا ئەوبیووی چیا)ی یەشار کەمال، لە وەرگێڕانی شوکوور مستەفا، (نیزگیل)ی بۆ بەکارهاتووە.
بای پشیلۆکان: ئەو بایەیە کە هەڵدەکات و ئەو پشیلۆکانە بێرو بەوێدا دەبات. کە نیشانەی هاتنی پاییزە.

شۆڕدەکەنەوە، خولێک لێدەدەن و بەردەوام دەبن بەرەو مەنزڵ.

کاتی سواخدانەوەی سەری خانوو و لەودەکایەکانە بە قوڕ و، داکردنی گەنم و جۆیە لە چاڵ و عەمباران. گوندییەکان بەرهەمەکانیان کۆدەکەنەوەو، ئەوەی لە پێداویستی خۆیان زیادە، دەیفرۆشن و ڕوو لە شارەکان دەکەن بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان لە جلوبەرگو شەکرو چاو برنجو ڕۆنو... کەس ژمارەی پێڵاوی خۆی نەدەزانی، لە هەرماڵەی یەک یان دوو کەس بە کاری ئەو کڕینە هەڵدەستان، بەنی ڕەنگاوڕەنگیان بە پێی هەمووان دەگرت و گرێیان لێدەدا، بەنە سوورەکە هی مەحمودییە، زەردەکە هی محەمەدییە، کەسکەکە هی هەمینێو... دە جاریان لێ دەجوویەوە تاوەکو لێی تێک نەچێ.

کاتی دابینکردنی زەخیرەی زستانە. لە گوندی، بە نۆرە هەرڕۆژەی ماڵێک مەنجەڵە گەورەکانی ساوارکولاندنی دەخواست. مەنجەڵ لەسەر کوچاگری ڕیز دەکران، ماڵی وا هەبوو زۆر خێزان بوو، یەک عەربە گەنمی ڕەشکوڵ، یان زیاتریشی دەکرد بە ساوار. کاتێک ساوار بە کوڵ دەهات، منداڵانی ئاوایی بە خۆ و بە جام و لەگەنەوە ڕیزمان دەبەست بۆ وەرگرتنی دانوولە. ماڵی مام عەلی کوێخا قادر و برایەکانی، ماڵی سەلیمی مام برایم و برایەکانی، هەموویان پێکەوە دەژیان. ئەو ماڵە زۆر خێزانانە، ژمارەیان دەگەیشتە سی کەس یا زیاتریش، مەزەندە دەکەم عەربە و نیوو یان دوو عەربەش ساواریان دەکولاند. لە نێوەندی حەسارێ قۆڵتێکیان لێدەداو بە هەویر سواخیان دەدا لە جیاتی قوڕ، دەیانسوویەوە بۆ ئەوەی ساواری تێدا بکوتنەوە.

ئەو ساوارکوتانەوەیە پیاوان ئەنجامیان دەدا، زۆرجار خەڵکی گوندەکانی دەوروبەریش بەشدارییان لەو ساوارکوتانەوەیە دەکرد، وەک مەراسیمی ئاهەنگێک چاوی لێدەکرا. بە گۆرانیی تایبەتی

ساوارکوتانەوە دەستی پێدەکرد، هەرجارەی چوار پیاو بەشدارییان دەکرد، ژنانیش ئەو ساوارەی لەگەڵ کوتکە بە زەبرەکانی پیاوان بڵاودەبوو، کۆیان دەکردەوە نێو قوڵتەکە. ئەوکات، ڕۆژی سێجار چایە نەدەخورایەوە چونکە کەم کەس توانای مادی هەبوو. لەو بۆنەیەدا چایان لێدەنا یان سەبەتەترێیەکی گەورەیان دابەش دەکرد، هێندەی ئاهەنگی بووکگواستنەوەیەک خۆش بوو! ئەو گۆرانیانەی لەیادم مابن کە تایبەتە بە ساوارکوتانەوە، یەک لەو چوار پیاوەی ساواریان دەکوتا گۆرانی دەگوت و ئەوانی بەرانبەری بۆیان دەگێڕایەوە. گۆرانیەکان:

کیژ هەر کیژێ دێمەکاری
چاوی وەکی چاوی ماری
خۆم لۆ هەردا سەر دیواری
ماچی دەکەم پڕ بەزاری!

کیژ هەر کیژێ دیبەگەیە
دەرێی بزنە بە تەگەیە!

ئەو کانیەکەی لە چیغلۆکی
بەخۆم لێدا بە نینۆکی
کێ ئاو لێبرد؟
ناو عەیشۆکی

ئەو کانیەکەی لە کەنداری
بەخۆم لێدا بە گۆپاری
کێ ئاو لێبرد؟

کیژێ خاری
ماچت دەکەم پڕ بە زاری!

کیژ هەر کیژێ گردەسۆری
گەردن پڕ مەرجانو مۆری
کوڕان دەبەن لۆ لای ژۆری

دانیشتوە لە بن تووێ
ئارووی دەخوا بە چەقوێ
سبحان الله تەبعم چووێ[1]

کیژ هەر کیژێ میرەکانی
پەنجەم گوشی لەگەڵ ڕانی
دایکی حیفریت بوو، پێی زانی!

لە گوندی ئیلنجاخی، پیاوێک بە ناوی حەسەن هاتبوو بەشداری لە ساوارکوتانەوە بکات، ئەو ساوارکوتانەوەیە بەتەنها بە شەو ئەنجام دەدرا، حەسەن کاتێک گەیشتە لای ساوارکوتانەوەکە زۆر پەشۆکاوو خۆڵاوی ببوو، دەیڕوانیە دوای خۆی و هەر چواردەوری. کە لێت دەڕوانی لەسەر گۆنای هەتاوگازو تەوێل و قەڵشەکانی لەپی دەستی، ئایەتەکانی حەڵاڵخۆری و زەحمەتکێشیت دەخوێندەوە. پەشۆکاوییەکەی سەرنجی هەموانی ڕاکێشا، چونکە هەر بسم اللەی دەکردو فووی لە هەر چواردەوری خۆی دەکرد، وەک ئەوەی شتێک

---

١- تەبعم چووێ: تەبیاتم چۆیە، ئارەزووم کرد.

لە دەوروبەری خۆی دەربکات! یەک لینگەکڵاشی بە پێوە مابوو. جامەئاوێکیان بۆ هێنا بەسەر زاری خۆی دەکرد، هێندە بەپەلەو بەهەشتاوی ئاوەکەی دەخواردەوە، ئەوەندەی نەدەخواردەوە دوو هێندەی بە سنگ و بەرۆکی خۆیدا دەڕشت! لە پەلەپەلیان، ئاوی پەڕیبووە بۆڕی هەناسەیەوە، کۆخەیەکی پێوەنووسا، دەمێک بوو خەڵکەکە چاوەڕوانیان دەکرد هەناسەی بێتەوەبەرو کۆخینەکەی تەواو بێت. تۆزێک ئاسایی بویەوە، پرسیاریان لێکرد: حەسەن ئەوە چی بووە؟ چیت لێ قەوماوە؟ ئاوا پەشۆکاوو لە خۆڵێ وەردراوی؟ خێرە ئاوات لێ بەسەرهاتووە؟ خۆ شەڕت نەکردووە؟ ئەویش گوتی خۆزگە شەڕ با! ئەوەی لە من قەوماوە لە کافری نەقەومێ!

شاخی گاوانان کەوتۆتە بەینی ئیلنجاخ و گوندەکەی ئێمە، هەموی کەرتکەشاخی ڕووخاوە، بەناوبانگ بوو کە گوایە شاری جندۆکانەو بە شەو کەس خۆی لێنەدەدا. حەسەن گوتی خزمینە بە قورئانی لە سنگی مامۆستایدایە، کاتێک گەیشتمە شاخی گاوانان، سوێندتان لەسەرم نیە، کوتان بۆ دەگێڕمەوە ئەوهایە، شاییەک دەگەڕا نە سەری دیاربوو، نە بن! دۆڵ و زوڕنا دەیکوتا، شاییەکی ڕەشبەڵەک هەر ژنەک و لە دەستی پیاوێکدا بوو، هیچ پیاوێک بێ دۆ[1] نەبوو!

---

١- دۆ: ١) بەرهەمێکی سپیاییە و لە ماست بەرهەم دێ. ماست و بڕی پێویست ئاو دەکرێتە نێو مەشکەوە، دەژەێندرێ و پاشان دۆ و ڕۆنەکەرەی لێ پەیدا دەبێت.

٢) لە شایی ڕەشبەڵەکە کوردەوارییەکان، هەرپیاوێک ئافرەتێکی (کچی خۆی، یان خوشکی، یان کچی مام، یان کچی پورزا و...) لەگەڵ بووایە، ئەو ئافرەتە پێیدەگوترا (دۆ). ئەو کچە لە شاییەکەدا دەچووە دەستی پیاوێک و ئەو پیاوەش ئافرەتێکی نزیک بە خۆی ئێزن دەدا بچێتە دەستی ئەو پیاوە یان ئەو کوڕە و. هەڵپەڕێت.

زۆر جار کە شاباش دەدرا بە چاوەشەکان. چاوەش پارەکەی بەدەستەوە دەگرت و بە بەردەم شاییەکەدا غاری دەدا و هاواری دەکرد: شاباش بەسەر فلانکەسیدا. یان بەسەر بووک و زاوایدا و زۆر جاریش لەگەڵیدا دەیگوت: بە قوزی دایە (بێدۆی)یەوە! یانی بە قوزی دایکی ئەو کوڕەی کە

هەرچاویان بە من کەوت، جندۆکەکان بانگیان کردم: حەسەن وەرە مەڕۆ سەرچۆپی شاییەکە بگرە، ژنی بۆ کوڕی شای جندان دێنین، زۆری نەماوە بووک بگاتە ئێرە و لەسەر خانێ زینی دایبەزێنین. ئەمنیش لەترسی ئەوەی نەوەک لە غەیبەوە دەستم لێبوەشێنن، هەیپێم لێکرد، هەر غارمداوە هەتاوەکو ئێرە هەر بە دواوەم بوون، پیرەژنێکیان یەکی ڕەشەی ددان کەوتوو پرچ قژن، پێیاندەگوت دایکەدێو، کەوتە سەرم، چەندجار کەوتووم و هەستاومەوە، کەڕکەکەشم[1] لێ بەجێماو لە بەری کردمەوە، هەتا خوا ڕوحمی پێکردم گەیشتمە لای ماڵی شێخ تەهای، جندۆکە لە دوام بوونەوە، گیسکەکم خێر لە خۆم گرتووە. حەسەن بەردەوام بوو لە گێڕانەوە و هەموو ئەوانەی ساواریان دەکوتاوەو ژنەکانیش کەسیان نوقەیان لێوە نەدەهات، وایان گوێ دابووە حەسەنی هەموو ئەندامەکانی جەستەیان ببوو بە گوێ، هەر بابا بوو لە بن لێوان بسم اللەی دەکردو فوی بە چواردەوری خۆیدا دەکرد .

کەسی وا هەبوو خۆی بە سوێندانەوە ڕەش دەکرد، دەیگوت بە غەوسی مار لە بەغدایە ئەو کاتەی لە مارێ هاتمە دەرێ بێم بۆ ئێرە، گوێم لە دەنگی دۆڵ و زوڕنای بوو لەلای شاخی گاوانان! حەسەن زیاتر باوەڕی بەخۆی دەکرد کە هەر بەڕاستی دووچاری ئەو ڕاوەدونانە بووە، هەموو ئازاێ بەدەنی دەلەرزی کاتێک سەیری سەروسیمات دەکرد، جەمەدانی کەوتبووە ملان و لە تۆزێدا غەرق ببوو، وەک کرێکاری خۆڵکێشانی لێهاتبوو! دەیگوت: پیرەژنە حیفریتەکە دووجار کەڕکەکەی گرتم و لەبەریداکەندم، خۆم ڕاپسکاند

---

بەرانبەر شاییەکە ڕاوەستاوەو تەماشا دەکات و دۆی خۆی لەگەڵ نییە. لە بابەتەکەدا مەبەست لە لێکدانەوەی ژمارە دووە.

١- کەڕک: پەستەکێک کە لە لوا (بەرگن)ی بەرخ دروست دەکرێ.

لە دەستی، ئێستا ڕەنگە کەڕکەکەم لەبەر پیرەژنە حیفریتەکە بێت.

لە دوای ئەو شەوەو گێڕانەوەی حەسەنی، لە هەرماڵێک گوێت هەڵدەخست، باس باسی جندۆکەو پیرەژنەکەو شایی بووکگواستنەوەی کوڕی شای جندۆکان، مێشکو هزری ئاژنین دەکردیو زۆر ژن هەبوو منداڵەکانی پێ دەترساند و هەترەشبردی دەکردن!

## بزمووک[1]

دوو بزنەدۆمان هەبوو. بزنەدۆ بەو چەند بزنە کەمە دەگوترێ کە تەنها بۆ ماست و دۆی ماڵ و منداڵی خۆت کەڵکی لێوەردەگریو بەحاڵ بەشت دەکات. ئەوانەی مەڕو بزنیان بە مێگەل هەبوو، شوانیان دەچووە بەر مەڕو بزنان، منداڵێکیشی دەچوە بەر کارو بەرخان بۆ ئەوەی بێچوەکان لەگەڵ دایکیان تێکەڵاو نەبن، نەبادا دایکیان بمژنو شیرەکەی هەموو بخۆن، شیری لە گوانیدا نەمێنێ بۆ دۆشین. ئەوانەی بزنەدۆیان هەبوو نەیاندەتوانی شوانێک بۆ مەڕو بزنەکان بگرن و بەرخەوانیشیان هەبێت. بە هەموو ئەوانەی کەمیان مەڕو بزن هەبوو، شوانێک دەگیراو هەموو ئەو ئاژەڵانەی کۆدەکردەوە، بەو شوانە دەگوترا شوانی (ناو هۆزە)ی. شوانی ناو هۆزەش وەک هەرشوانێکی دیکە بە شەرت دادەمەزراو دەبووە ڕێنجبەر بۆ ساڵێک، جاری واش بوو لەگەڵ خەڵکەکەی ڕادەهات، شوانیەکەی جێنەدەهێشت و شەرتی نوێ دەکردەوە بۆ ساڵێکی دیکە. شوان دادەمەزرا، بۆ نمونە ساڵی بەنیو عەربە گەنم و دەستێک

---

[1] - بزمووک: دارێکە درێژییەکەی نزیکەی هەشت سەنتیم و ئەستوورییەکەی هێندەی قەڵەمێکە، بەهۆی بەنێکەوە دەخرێتە زاری کار، بۆ ئەوەی شیری دایکی نەمژێ.

جلوبەرگەو دوو جۆت کڵاش و بزنەدۆیەکو توتن و پەڕەسیگار.

ئەوانەی بزنیان کەم بوو، بۆ ئەوەی کارەکان بزنەکان نەمژن بەدوای چارەسەرێکدا دەگەڕان. باوکم گوتی بڕۆ دارێکی بەقەد بستێکم بۆ بێنە، منیش بۆم هێنا لەبەرسێبەرێ دانیشتبوو، قەڵەمبڕی دەرهێنا دارەکەی لەنێوەندێڕا کرد بە دوو کەرتی وەک یەک، لە هەردوو سەری دارەکە دوو لەلەی کرد بۆ ئەوەی بەنی لێ گرێبدات، بەشێوەی لغاوی ئەسپ، گوتی بڕۆ ئەو کارانەم بۆ بێنە با ئەو (بزموک)انەیان لە زاری بکەم، کارەکانم هێنا و بزموکی لە زاری کردن و گوتی ئێستا لەگەڵ دایکیان بن ناتوانن دایکیان بمژن. لە دوای دۆشینی بزنەکان بزموکیان لە زاری کارەکان دەردێنا بۆئەوەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دایکیان بمژن.

## شونهەڵگر

ئەو بەیانییە کزەبایەکی شەماری، جلەشۆراوەکانی سەر ڕستەی حەسارێی دەبزاوت. ئاسمان هێندە شینو ڕەنگ شەفەقی بوو، چاو لە تەماشای پڕ نەدەبوو، دایکم بە بابمی گوت ناسکەنانێکت بۆ بکەم بە ڕۆنی کەرەی؟ بابم گوتی ناسکەنانم[1] بۆ مەکە، ناخۆم گەرمایە، ماستاوێکم بۆ بگرەوە! ئەو ڕۆژە ئەستورکی گەرممان بە ماستاوێ خوارد لەگەڵ باوکم بە مراکی دار بە نۆرە لەو کۆتکە[2] ماستاوەمان دەخواردەوە.

لەناکاو لە گردەکەی بەرامبەری ئاوایی، بەو بەیانە زووە، هێشتا

---

١- ناسکەنان: نانێکی شێوە چوارگۆشەیە، بە چەند توێیەکی تەنک و بەڕۆن دروست دەکرێ.
٢- کۆتک: بادی، دەفرێکی دارینە بۆ ماستاو و دۆ بەکاردێت.

خێرو شەڕ بەش نەكرابوو، حەشاماتێك لە خەڵك شۆڕبوونەوە بۆ گوندی، كاتێك باوكم بینی پیاوی میری (حكومەت)یان لەگەڵە و چەكی شانی پۆلیسەكان دەبریقایەوە. وەك هەرجارێكی دیكە، گوتی یاللە خێر، دیسان پۆلیس هاتن! ئێمە بێئاگا لەوەی بەدوای شوێن پێی ونبووی خەتایەكدا دەگەڕێن. ئاخر لە دوای كوشتنی سمایلەدرێژو خەجێ، كە لەماڵەكەی خۆیان لەنێوەڕاستی گوندی و بەقرچەی نیوەڕۆیەكی هاوین، لەلایەن دوو برای خەجێ ڕێزەڕێزەی گوللان كران هەر لەسەر ئەوەی بڕیاریاندا بوو بەیەكەوە بژین، لەو كاتیەوە پۆلیس نەهاتبۆوە گوندی.

كاتێك نزیك بوونەوە، باوكم گوتی ئەوەی لە پێشەوە دەڕوات، عەلی عبداللەی شوونهەڵگرە، ئەوەی دی باشچاوەشەو پۆلیسی لەگەڵن، هەندێك خەڵكی گوندەكانیشیان بەگەڵ كەوتبوون. عەلی عبداللەی شونهەڵگر دیاربوو، شوێنپێی دزەكانی هەڵدەگرت. شوێنهەڵگر شوێنەكەی گەیاندە هەوێزی مەڕی، كە لەگەڵ گەردی بەیانی ژنان بۆ كۆكردنەوەی قشپل، هەوێزەكەیان ماڵیبوو، بۆ ئەوەی لە زستان بیسووتێنن. عەلی عەبدوڵای شونهەڵگر گوتی: بووەستن! لە دەوری هەوێزەكە سووڕا، شوێنەكەی دەركرد، دووبارە بەردەوام بوو. كاتێك هەموو خەڵكی ئاوایی گەورەو بچوك لێیان كۆبوونەوە، باشچاوەش گوتی: نابێ هیچ پیاوێك لە ماڵەوە بمێنێتەوە، هەموان بچنە مزگەوت. لە ئاكامی چەند پرسیارێكی خەڵكی ئاوایی بۆ خەڵكی گوندنشینو ئامادەبوان ئاشكرابوو، ئەو پیاوەی لە تەنیشت باشچاوەش وەستابوو، جووتەهێستریكی بارەبانی لێ دزرابوو. دزەكان دیواری خانووی هێسترەكانیان بەدیواربڕ بڕیبوو. دیواربڕ بریتیبوو لە ئاسنێكی سەرتیژكراو هێندەی پیشەقانێك درێژ بوو، بۆ دیواربڕین بەكاردەهات. دیواری خانووەكان لە خشتی قوڕ بوون،

کاتێک خشتێکت دەرهێنا، دەرگایەک دەبێتەوە بۆ دەرهێنانی چەند خشتی بتەوێ، ئاسان دەبێت. هەرچەندە زۆربەی خاوەنی هێسترەکان و وڵاخەبەرزەکان لە تەنیشت ژووری نووستنی خۆیان وڵاخەکانیان دادەکردو یەک دەرگاشی هەبوو بۆ چوونەژورەوەی مرۆڤەکانو وڵاخەکان، لێ دزی کارامە دەیتوانی زەفەریان پێببات.

خەڵکی ئاوایی گەورەو بچووک تەماشای زاری باشچاوەشیان دەکرد، هەر بابا بوو چاوی لە مۆلەق وەستابوو، نقەی لێوە نەدەهات، کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد ئەلفازی بگەڕێ، لە تۆمەتبارکردنی خۆیان دەترسان بێئەوەی تاوانێکیان کردبێت. لە چاوەڕوانی تۆمەتبارکردنی خۆیان غەرقی چاوەڕوانی ببوون. باشچاوەش هاتەگۆ: باش گوێم لێ ڕابگرن هەرچی درۆم لەگەڵ بکات، بەو قامچیە ڕەشەی، هەموو ئازای بەدەنی شینو مۆر دەکەمو لە حەپسخانەی دایدەڕزێنم! ئەو پیاوەی لەبەردەستان وەستاوە، ئەمشەو جووتەهێسترێکی لێ دزراوە، ئێستا شونهەڵگر شونی هێناوەتە ئەو گوندەی ئێوە، دەبێت دڵی پاک بکەنەوە کە ئێوە نەتاندزیوە!

ئەو سەردەمان باوبوو دەیانگوت کوڕ ئەو کوڕەیە بچێتە هەوێ[1]و بێتەوە! یانی شەوێ نەترس بێت و بچێتە کەلێنێ، ئەوەی ئەو کارانەی پێنەکرابوایە دەیانگوت دەستو پێ سپیەو بێدەسەڵاتەو زەلامی شەوێ نییە، بە هەندێکیش دەگوترا دۆخینی لە تەنیشتییە یانی ژنە، یان دەیانگوت فلانکەس زەلامی پشت لانکێیە!

مام حەمەد بێ ئەوەی کەس لێی بپرسێ، بە دەرپێیەکی سپی خوتبەی[2]، وەک هەرگوندییەکی دیکە، هاتبووە نێو حەشاماتەکەی

---

١- هەوێ: ١) ئەو ژنەی کە بەسەر ژنێک دەچێت. ٢) کەسێک بە شەو بچێت کارێک ئەنجام بدات و بە سەلامەتی و سەرکەوتووی بگەڕێتەوە. لێرەدا مەبەست لە دووەمیانە.

٢- خوتبە: نوێژی ڕۆژی هەینی.

ئـاوایی، خـۆی لێـک دەکێشـاوە و باوشـکی درۆیینـەی دەهێنـا خـۆی، دەیگوت شـەوی ئەمشـەو خـەو لـە چاوم نەکەوتووە. بـەمانای ئـەوەی ئـەو گوایـا هێنـدە ئـازاو ڕەشـیدەو زەلامـی شـەوێیە، ڕەنگـە ئـەو دزینـە کاری ئەو بووبێت وای خۆ نیشـان دەدا. خـاوەنی هێسـترە دزراوەکـان گوتی: خزمینە گازندەم[1] لێمەکەن، یان دەبێت شونەکەم لـە گونـدی بـۆ دەربکەن یان دەبێت هەمووتان ئەوەی دەسـتی داری دەگری، قورئـان و تەلاقم بۆ بخۆن کە ئێوە هێسترەکانی منتـان نـەدزیووە و دڵـم پـاک بکەنەوە!

مـام حەمـەد، جیـا لـە هـەموو کـەس و خـەڵکی گونـدی، گـوتی: ئـەمن قورئـانێ دەخـۆم، بـەلام تـەلاقی نـاخۆم، خـاوەنی هێسـترەکان گـوتی: حەمـەد، حەمـەد ئـەتۆ نـە قورئـانی بخـۆ نـە تـەلاق، ئەگـەر ئـەتۆ هێنـدە ئازاو جەربەزەبیت بتوانی ئاقارو تخوبی سێ گوندان بەشـەو ببڕی و هێستری من لە ژورێ بدزیو دیواربڕی بەکاربێنی، گەردنی بابیشت ئـازاد بێت، ئەمن لەگەڵ تۆم نییـە، لەگـەڵ ئـەو کەسـانەمە کـە پیـاوی شەوێو کەلێنانن!

بـابم، بـە حـوکمی ئـەوەی ڕاوچـی بـوو، هەنـدێک سـەری لـە شـونهەڵگرتن دەردەچـوو، گـوتی: تـۆ بڵێـی ناڵـەکانیان پاشـوپێش نـەکردبێت؟! عـەلی عەبـدوڵا شـارەزاتربوو لـە بـاوکم، گـوتی: نـەخێر ناڵـەکان پاشـوپێش نـەکراون، چونکـە کاتێـک سـمیان لـە زەوی داوە، خۆڵەکەی بۆ پێشەوە فڕێدراوە.

لەدەوری ئاوایی سووڕان، دیاربوو خەڵکی گوندی بەخت یاوەریان بـوو، شـوێنەکە لـە گونـدی دەرچووبـوو، بـۆ یـەک لـە گونـدەکانی دەوروبـەر. مـەلاو ڕیشسـپی ئـاوایی دەسـتیان بـە ڕیشـیاندا دێنـاو

---

١١- گازانده: گازنده، گلەیی.

دەیانگوت: شوکر بۆ خوا ئەو بەڵایەی ناگەهانە بەرۆکی ئاوایی بەرداو لە یەخەمان بوویەوە، بێئەوەی تخوونی قورئان بکەوین! ئاخر قورئان، بە چاک و خراپ نابێ تخونی بکەوی و دەستی لێبدەی، نەبادا هەردووک چاومان مجرۆ بکات.

## مامۆستاکەم

لە دوای ٦٦ ساڵ تەمەن، ئێستاکەش شەرمت لێدەکەم!

ساڵی ١٩٦٧ لە قوتابخانەی ناوەندی ئیشکان لە هەولێر، پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم. مامۆستای ئینگلیزیمان ناوی محەمەد بەرزنجی بوو، پیاوێکی تێکسرماوی بەژن مامناوەند بوو، چاوەکانی وەکو ئاوێکی مەند شین بوون. ڕۆژێک باسی ماستی لای خۆمانمان کرد. ماڵمان لە گوندی گەڕەشێخان بوو، ڕۆژی هەینی کە هاتمەوە ماڵ، دایکم مەنجەڵێک ماستی مانگای پێچاوە، لەگەڵ خۆم بۆ مامۆستا محەمەدم برد، ماستەکە لە بازاڕ هەر بایی ١٠٠ فلس (دوو درهەم) دەبوو. مامۆستا، هەر بۆ ئەوەی من لەبەرچاوی قوتابیەکان تەریق نەبمەوە پارەم بداتێ، گوتی ئەحمەد عەلی! کتێبی ئینگلیزیم بدەیە، ئێستا بۆت دێنمەوە، ئەمنیش کتێبەکەم دا پێی، هەر زوو کتێبەکەی دامەوە. کە چوومەوە ئەو ژوورەی لە گەڕەکی تەعجیل بە کرێمان گرتبوو، ویستم دەرسی ئینگلیزی بخوێنم، کتێبەکەم لێککردەوە، دەرسمان لە کام لاپەڕە بوو، دیتم ڕوبعێکی کاغەزی سەوزی تێدابوو، مامۆستا محەمەد ئەو بڕەپارەیەی دانابوو، کە ئەو کات سێ مەنجەڵ ماستی پێدەهات. ئەوەیە ڕەوشتی بەرزی مامۆستا. لەو کاتەوە خۆم بە قەرزداری مامۆستای ڕاستەقینە دەزانم. لەو چەند ساڵانەی

ڕابردوو، کە مامۆستایان بۆ داوا ڕەواکانی خۆیان لەسەر شەقام بوون، منیش وەک تاکێکی ئەو کۆمەڵگایە شانبەشانی نارازیبووان لەسەر شەقام بووم، بەرپرسێک بە تەلەفۆن پێیگوتم: کاک حازم خۆ تۆ مامۆستا نیت، بۆچی بەشداریی لەو خۆپیشاندانە؟ گوتم: کە بووم بەپێشمەرگە، لەسەر مافی ڕەوای خەڵک، هەموو گەنجیی خۆمم بەخشی. ئێستاش لە سەر ئەو پرەنسیبە ئەخلاقیانەی باوەڕم پێیەتی داناکەلێم! بۆ شەوەکەی، ئەو چەند دێڕەم نووسی، پێشکەشە بە هەموو مامۆستایەکی ڕاستەقینە، بە تایبەتی مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی.

بەیانیت باش مامۆستای خۆم
ئەمن پەروەردەی دەستی تۆم
بە قەڵەمەکەت سوێند دەخۆم
لەسەر تۆ ببڕێ نان و دۆم
پشتت بەرنەدەم، قەت نەڕۆم
کە پێم گرت هاتم بۆ لای تۆ
لە پاش داری و دوو داری و دۆ
فێرت کردم نەکەم درۆ
نیشتیمانی خۆم خۆشبووێ
نەشکێنمەوە گوڵ و چرۆ
چەکی شەرەف لە شانم کەم
بە داگیرکەر بڵێم بڕۆ
من وەک بەرپرسان سپڵە نیم
دیمەدەر لە ژێر قەرزی تۆ

## تەیرە! عەلیت چی لێکرد؟

نە گولزاری پڕ لە هوزار و پەپوولە، نە دەریای ڕازاوە بە نەورەسەکان، نە ئاسمانی ڕەنگاڵەیی، نە ستوونی تیریژی ڕووناکی کلاوڕۆژنەکان، نە جوانی کۆلکەزێڕینە، نە چلورەی بن ساپیتە و گوێسوانەکان، نە ئاونگی قەرسیلی دەوری گوندان، نە ئەستێرەی کاروانکوژەی نیوەشەوان، هیچ دلخۆشیم پێ نابەخشن، بێڕەونەقن، نادرەوشێنەوە وەک جاران!

ماکی جەوهەری هەرشتێک، لە سای سەری هاوزمانی حەرامزادە و بەرپرسی گیرفانبڕ و زەلیلی دەرگای بێگانە، هیچی وەکو خۆی نەماوە، ڕەوشتی بەرزی کۆمەڵگای کوردەواریش، ئاتاری لەسەر پاتاری خۆی نەماوە، سووڕی گەردوون پێچەوانەو بەراواژوو بۆتەوە!

پەرێشان و بیربلاوم بەو هەموو دەرد و کەسەر و بەو هەموو ئێش و ژانەوە!

ئازادییان زەوت کردووم، دەرەتانم بۆ نەماوە، لەوەی زیاتر کە چیرۆکی کەلەپووری زەمانی زوو بگێڕمەوە...

بەربەیانی هەمو ڕۆژێک لەگەڵ ئەنگووتنی هەتاو، لەگەڵ پێ و قەدەمی سروە، کە ڕووناکی خۆی بە ژورەکەمدا دەکا، دەریای دڵم دەکەوێتە گێژەن و شەپۆل دەدا، بۆ ئەو گەنجانەی پیرکران، خوێن لە دوو دیدەم سەردەکا!

سەت مخابن! لە مەلبەندی برشت و پێز، ئەوەی دەیچێنێ و دەیدورێ لە بەرەکەتی گوڵە گەنم بێبەشە! خەلکی ولاتی دەریاینەو لە عەزرەتی تنۆکێک ئاو، تەریفەینەو جەرگمان ڕەشە!

بە ناچاری دەست دەبەم و دەچمە گژ سندووقە ڕەشەی یادگارییە

هەرەکۆنەکان، بەبێ پرس و بەبێ فەرموو، تەمەن بەرەو ژوور هەڵدەکشێ بە بێوچان، بۆیە وا بەهەرەداوان، بەرلەوەی بکەومە ئاوزینگان، لە پاییزی تەمەنمدا نامەوێ پشتتان تێبکەم، ئەگەر سەرتان نەیەشێنم بۆتان دەبمە حیکایەتخوان...

لە ئاقاری هەمو دێهاتی کوردستان، هەموو گرد و دۆڵ و کەندەلان و شاخێک، ناوی تایبەت بەخۆی هەیە. گوندی گەڕەشێخان، گوندێکی قەوغەبوو، لەلای باکوورییەوە شاخی گاوانان و گردی نیسکان و زورگی شێخ سمایلی. لەلای خۆرهەلاتیەوە کەندێ بە کفرو کەندار لەشکر. لەلای خۆرئاوایەوە گردی مهەندسی کەندێ مامەسێنیان بە بەر گەڕێ تێپەڕدەبێ. لای باشووری، گەڕێ حەمەدی ونسان و چاکەغەریبە هەیە، چاکەغەریبە، لەسەر گردێکی قوت، غەڕەبەردێک دارێکی تێچەقێندراوە، بە چەند پەڕۆکێکی سەوز هەمووی تیتۆڵ تیتۆڵ بوون، هێندەی وەک متفەڕک لێی بکەنەوە! دیارە دەیانگوت پیاوچاکە، لێرە نێژراوە بە تاقی تەنها، هیچ گۆڕی دیکەی لە تەنیشتو دەوروبەری نییە. بەردەکانی ڕەش و لووس بوون، هێندەی خەڵک ماچی بکات و لە بەرۆک و نێوچاوانی خۆی بخشێنی، بە تایبەتی ئەو شوێنەی ئازاری هەبووایە، یان بۆ داواکاری مرازی کچ و کوڕان، یان بۆ داوای منداڵ و زۆر داخوازی دیکە. گۆڕی پیاوچاکان لە کوردوستان، زۆر کەس کەلوپەلی لەسەر دادەنا، بۆ ئەوەی لێی نەدزرێ، کەس دەستی بۆ نەدەبرد لەترسی ئەوەی نەوەکو چاک هەردوو چاوی مجرۆ بکات! مانگایەکمان لە دۆمان کرپبوو، دایکم گوتی: بڕۆ لە چاکەغەریبەی متفەرکی بۆ بێنە، لە ملی دەبەستم بۆ ئەوەی گۆلکەمێی ببێ و شیری زۆر بێ و بۆ دۆشین ئارام بێت!

بۆ داواکاری و زیارەت، چوارشەممان دەچوون، وەک مامڵێ دەفەرمێ: چوار شەممەی دەچنە چاکی! دایکم متفەرکی چاکەغەریبەی

لەگەل چەند مروێکی شین لە ملی مانگا زەردی بەست.

من لە قوتابخانە لە بیرکاری زۆر خراپ بووم، دەچوومە سەر چاکەغەریبەی، بەردەکانم لە سەرو چاوی خۆم دەخشاند و ماچم دەکرد، قەلەمم بە بەردەکاندا دەهێنا، بەلام بەداخەوە ڕۆژێک لە بیرکاری دوو نمرەی بۆ زیاد نەکردم!

ڕۆژێکی کۆتایی شەستەکان، زستانێکی زۆر سارد بوو، کوردگوتەنی تفت هەلباوێشتبایە دەمەیی. چەند ڕۆژ بوو باو باران بوو، کاتێک باران زۆر دەباری، باوکم گوتی ئەورۆ ڕۆژی ڕاوەمامزیە. دیار بوو مجێزی لە ڕاوێ بوو، خۆی هەلکردو بە پێخواسی، تاژی ڕست کرد. گوتی دەڕۆم ئەوا لە بنی هەریبرینگاند[1] و ڕۆنی کرد! دوو نان و سەرکەپیازێکی لە نێو پشدێنی گرێدا، ڕۆیشت بۆ ئاقاری گردەسۆری بۆ لای کەندار لەشکرو گردوسێن و بەستێ شاقازی. ئەو ڕۆژە لە دوریانێ لوولەی دەبابان بە دیارکەوتن. بە زنجیرەکانیان ئەو قوڕەیان دەشێلا. لەو گوندەی ئێمە زیروح لە دەرێ نما[2]، هەر بابا بوو خۆی لە ژورێ خزاند، تەنها لە دەلاقە بچۆکەکانڕا دەبابەکانمان دەژمارد، کە ژمارەیان ١٨ دەبابە بوو بێجگە لە زیلی سەربازی و تەداروکاتی جەنگی.

لە گوندی، بەس عوسمانی مام برایمی چووە پێش سەربازەکان، دەیویست هەلاتووی سەربازی و دواکەوتوی سەربازی، لە گوندەکەمان بپارێزی و، لە یەخەی گوندیان بکاتەوە. بەو عەرەبییەی کە هەر کوردی بوو مام عوسمان عەرەباندبووی دەیگوت: (هازا تەریق ئیلنجاغ بەس سێ کەندی لە پێشە!) بەرەو گردەسۆری سیانان ملیان پێوەنا، لەوێشەوە بەرەو کەلی قەشقەی، کە دوایان بڕا،

١- هەریبرینگاند: هەلّیبرینگاند. برونگی داین. بارانەکە خۆشیکردەوە.

٢- نما: نەما.

ڕۆیشتن. خەڵک وردەوردە لە ماڵەکانیان هاتنە دەرێ.

ئەو ڕۆژە، لە برسان و لەسەرمان، ڕیشۆڵە و بوغاز[1] و سۆفەقیتە[2] و سۆفەقیتە[2] و کێشکەپاساری، گەواڵەی دەکرد. بەتایبەتی کە زبڵی نوێی بەرپێی ورساتی ڕۆدەکرا. خەجێ خار ئەحمەدی، دوو سێ پاشۆل کاوکۆت و زبڵی لە هۆڵی مەڕی ماڵێ سەلیمی مام برایمی، دەرهێنا لە بن دیواری لەودەی کای ڕۆکرد. بەڵکو ڕۆژ بێتەدەر لەبن هەوران، زبڵەکە وشک بێتەوە بۆنێو سۆبەی عەوایی[3]. شەهید کەریمی برام و چەند منداڵی هاوتەمەنی، لەسەر ئەو زبڵەی خەریکی فاق دانانەوە بوون. لەسەرمان، خۆمان دابووە بن ساپیتەی سواندەی خانووی مارێ خار ئەحمەدی، هەڵدەلەرزین، لە چاوەڕوانی دندووک لێدانی ڕیشۆڵەیەک لە دانەی داو و، لە هەستانەوەی گازمالوکە[4] و تەقینی فاقدا نقوم ببوون! کات بەرەو ئێوارە دەچوو، لە ناکاو چەند زیلێکی سەربازی، کە چەند سەربازێکیان تێدابوو، گەڕانەوە. کە بینیمان، باوکم لەنێو زیلێکیاندا دەستو چاوی بەسترابوو، بە پێخواسی بردیان بۆ هەولێر.

کاتێک لە ئاقاری گردە سۆری، کە باوکمیان گرتبوو، پێیانگوتبوو تۆ موخەڕیب (تێکدەر)ی بۆ سۆسەکردن ئاوا خۆت وەک ڕاوچی نیشان دەدەیت!

لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر، لەو شوێنەی باوکمیان گرتبوو، ویستبویان تاژیەکە بکوژن، باوکم زۆر زۆری تکاکردبوو تا تاژیەکە

---

١- بوغاز: جۆرە باڵندەیەکی کێوییە.

٢- سۆفەقیتە: سۆفیە قیتە، پۆپنەقیتە، پۆپیتە. جۆرێک لە چۆلەکەی کێوییە و دوو هێندەی پاساری دەبێت.

٣- عەوایی: ئەو جۆر زۆپایانەیە کە لوولەی دووکەڵکێشیان هەیە بۆ سەربان.

٤- گازمالووکە: دارێکی بچووکە نزیکەی سێ سەنتیم دەبێ، لە فاقەی گرتنی چۆلەکەدا دانەی داوی پێوە دەکرێ.

نەکوژن. تاژیەکە ناوی (تەیرە) بوو، هەتا گەیشتنەوە گوندی، تەیرە بەدوای ئەو زیلەی باوکمی تێدابوو غاری دابوو، کە تەیرە هاتەوە لە حەساری ماڵی خۆمان وەرکەوت، دایکم هەستیکرد، تەیرە برسی و ماندووە نانی بۆ برد، پێیگوت: تەیرە! عەلیت چ لێکرد؟ تەیرە دەچووە دەرێ و دەهاتەوە ژوور، دەیویست پێمان بڵێت بەکوێدا بردیان، نانەکەی نەخواردو وەک مانی گرتبێت! چەناگەی لە سەر هەردووک لەپی دانابوو، وەک بگریەت بۆ باوکم!

لەگەڵ دایکم، چووینە سەر چاکەغەریبەی، دایکم دوعای دەکرد، بەڵکو هیممەتێک بکات بۆ ئازادبوونی باوکم. دایکم، بەردێکی بەقەد دنکە گوێزێکی هەبوو، زۆر جار لە گوندی بۆ منداڵبوون و ژانەزگ و سەرئێشە دەیانبرد، دەیانگوت یەکەویەکە! دایکم دەیگوت: ئەوەندەی ئەختوچارم کرد، کە عەلی ئەو بەردەی لەگەڵ خۆی ببات، نەیبرد. چونکە دڵم خەبەری دابوو عەلی شتێکی بەسەردێت! باوکت گاڵتەی بەوشتانە دەهات، خۆ ئەگەر بەردەکەی پێبا، سەربازەکان لە عاندی کوێر دەبوون و نەیاندەبینی، ئاخر ئەو بەردەم، لە مەرقەدی غەوسی بەغدایە خشاندووە!

لە دوای چەند ڕۆژو هەوڵێکی زۆری دۆستان، باوکم ئازاد بوو، بەڵام لە سەربازگەی هەولێر، پەنجەی گەورەیان شکاندبوو. کاتێک باوکم هاتەوە، تەیرە لە حەژمەتی هاتنەوی باوکم، دەنوسکایەوەو کلکەسووتەی لەبەر دەکرد. دایکم ڕووی لە باوکم کردوو گوتی: چاکەغەریبە بەهاناتەوە هات، گەرنا، بە مەرەدی قادر فەڕاشی ئۆمەراوەی دەچووی! گیانی شاد، قادر فەڕاش لە ساڵی ١٩٦٣ حەرەس قەومی شەهیدیان کرد. بابیشم لەبەر دڵی دایکم دەیگوت: ئەو بەربوونەی لە چاکەغەریبەی دەزانم!

## مادی و میسالّی

هاوینی ساڵی ١٩٧١ ماڵمان لە گوندی گەڕەشێخان بوو، ساڵێک و شەش مانگ بەسەر دەرچوونی ڕێککەوتننامە و بەیانی ١١ی ئازار تێپەڕ ببوو. حکومەتی عێراق دەزگایەکی دروستکردبوو بە ناوی ئاوادانکردنەوەی باکوور (اعمار شمال). دیارە بڕیار بوو، ئەو گوندانەی لە کاتی شەڕی ڕژێم و پێشمەرگە، لە لایەن ڕژێمەوە سووتێندرابوون، خانوویان بۆ دروستبکەنەوە. لەو کاتەدا، بەرپرسە سەربازییەکانی پارتی، بوون بە قۆنتەراتچی (مقاول)ی دروستکردنەوەی خانوەکان، یان بۆ چاوبەستنی خەڵک، کەسێکیان لەگەڵ خۆیان دەکرد بە هاوبەش (شریک).

هەر بەرپرسێک هەوڵی بۆ چەند گوندێک دەداو بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. فارس باوە بۆ بێستانەی گەورە، عەریف عسمان بۆ باغەمرەی گەورە، سەید کاکە بۆ ئۆمەرەسۆرەوو میرزاغا.

هەر لە هەمان ساڵ، کە عبدولوەهاب ئەتروشی پارێزگاری هەولێر بوو، شێخ ڕەزاش مدیر شورتەبوو، بڕیاریاندا بەرپرسە سەربازیەکانی پارتی، لە سەرپەل بۆ سەرێ، بۆیان هەیە ئۆتۆمۆبیلێک بە قاچاغ لە کوێتەوە بهێنن بۆ کوردستان. دەبوایە بەتابلۆ ئۆتۆمۆبیلی عێراقی دەربازیان بکەن، پاشان لە هەولێر بۆیان ژمارە بکەن.

ئێمە خێزانێکی ١٦ کەسی بووین، بەرەی دوو دایک بووین، بەهۆی تێکەڵاوی باوکم بە سیاسەت لە ریزەکانی حیزبی شیوعی، هێندەی لەو گوند بۆ ئەو گوند باربکەین، ئەوەی هەمان بوو لە دەستمان دابوو، تەنانەت زەوی کشتوکاڵیشیان بە ئێمە نەدەدا. لە گوندی گەڕەشێخان تاقەماڵ ئێمە بووین کە زەویمان نەدرابۆیەو تەنانەت لە

گوند خانوشمان بەکرێ بوو. باوکم هاوینان پێش کڕینی جلوبەرگ، هەر زوو گەنمی باراشی دەکڕی، زۆر کەس نانی (مزاش)ی دەخوارد، توانای نانی گەنمی نەبوو، جۆو گەنمیان تێکەڵ دەکرد پێیدەگوترا مزاش. زۆرجار باوکم دەیگوت: ئۆخەیش کەلەکەم کەوتە عەردی، باراشی ساڵێکم دابین کرد!

## بابم هاوینان بە (هەللاج)ییەوە خەریکبوو

تەمەنم ١٧ ساڵ بوو، کوڕی گەورەبووم، دەبوایە دەستبارێک لەگەڵ باوکم بگرم. لەگەڵ خەلکی گوندەکانی دەوروبەر چووم بۆ گوندی (کانی بزرە) بۆ کرێکاری، کە هەندێک لەو خانوانەی بۆ دەرچووبوو. سەرپەرشتی کرێکارەکان، گەنجێکی بیست ساڵە بوو، ناویم لە یاد نەماوە، پێیاندەگوت چاودێر (مراقیب) وەک ئێستا دەبوایە چاودێریش لە حیزبی دەستەڵاتدار بێت، مقاولەکەش هەر بەرپرسێکی سەربازی پارتی بوو، بۆیە مراقیبەکەی ڕاسپاردبوو ڕۆژانە چەند کاتژمێرێک کارمان زیاتر پێبکات بێبەرامبەر. منیش، کرێکارەکانم هان دەدا هەشت سەعات زیاتر کاری زیادی نەکەن.

یەکێک لە کرێکارەکان بۆ ئەوەی خۆی خۆشەویست بکات لای مراقیب، گوتبووی ئەوە کوڕی عەلی حاجی تاهیرە باوکی شیوعیەکی زۆر پیسە! مراقیب کە بەوەی زانیبوو، مقاولی ئاگادار کردبۆوە، گوایە من خەسڵەتی کرێکارەکان تێکدەدەم. مقاول مراقیبەکەی ڕاسپاردبوو، بۆ چاوشکاندنی کرێکارەکانی دیکە، لەبەرچاوی کرێکارەکان لێم بدات و دەرمبکات،، تا کەس زاتی ئەوە نەکات داوای مافی ڕەوای خۆی بکات.

ئـەو ڕۆژەی خـەریکی قوڕەپەسـتی[1] سـەری خانوویـەک بـووین، سەعات ببوو بە پێنجی ئێوارە، هێشتا بەشی سەعاتێک قوڕ مابوو، مراقیب هاتبوو سەربانی خانووەکە، گوتی: دەبێ هەمووی تەواوبکەن! منیش گوتم: فریاناکەوین بەڕووناکی نانێک دروست بکەین، با قوڕەکە بۆ بەیانی بێت، بەڵێن بێت من شلی دەکەمەوە، بێئاگابووم بڕیاریداوە لەبەرچاوی کرێکارەکان چاوم بشکێنێت، گوتی: سەگبابی شیوعی بۆت نیە یەک قسە بکەیت، ئێوە ماددین! منیش گوتم چاک نیە وەک تۆ سەگبابێکی میسالی نیم و کرێکاران ناچەوسێنمەوە!

ئەوکات، نە ئەمن دەمزانی میسالی چیەو نە ئەویش دەیزانی ماددی چیە، تەنها یەکتریمان پێ تۆمەتبار دەکرد. لەوکاتەدا ستڵێک قوڕم بەدەستەوە بوو، قوڕەکەم ڕۆکردو هەر ئەوەندەم زانی یەک زللەی غروورانەی لە بنانگوێم سرەواندو ویستی شاپێکیش ڕابوەشێنێت، لەبەختی من پێی لە هەلاشی خانووەکە گیر بوو، منیش زۆری لێ داخدار بووم و زۆری چەوساندبوومەوە و زوڵمی لێکردبووم، بە هەموو هێزی خۆم و پاڵپشتی ڕەوایەتی ئەو ڕقە پیرۆزەم، یەک ستڵم لە بنانگوێی قایمکرد، قوڵفی ستڵەکە لە گوێی گیربوو برینداری کرد، خوێن و قوڕ تێکەڵبوو، چاوی نەیدەدی، هێندەی قوڕ تێهەڵسوابوو. بردیان لە خوارەوە دەموچاوی بشۆنەوە. کرێکارێکی بە تەمەن کە ڕیشی قەڵەم کردبوو، بە بیانووی نێوبژێکردن، هاتەلام گوتی: تا زووە بڕۆ لەو نێوە نەمێنی، ئێستا پیاوەکانی فارس باوە بێن زۆرت لێدەدەن و دەشتگرن.

پیکەبێک، گەچی هێنابوو لەسەر ڕۆیشتن بوو، لەگەڵ کرێکارەکان سواربووم، شوفێر گوتی: بۆ کوێ؟ گوتم: خەڵکی گەڕەشێخانم دایکم

---

[1] ١- قوڕەپەست: قوڕپەست. ئەو قوڕەیە کە لەجیاتیی گڵەبان، بە ئەستووری لەسەر هەلاشی سەربانی خانوو ڕادەخرێ.

مـردووه، دەمـەوێت هـەتا ئازیانـە لەگـەڵ ئێـوه بـێم، ئـەویش زۆری ڕەحمەت بۆ دایکم نارد، گوتی: لەوێش تا گردەسۆری وەرە، دەچمەوە گردەسۆری. بەو شێویە ڕێگەم نزیک دەبۆوە. گێژەڵووکەی گەچی نێو پیکەبەکە، سـەراپای سـپی کردبووم، وەک پەیکـەری گـەچم لێهـاتبوو، هەسـتم دەکـرد بـرژانگم سـپی بـوون، گـەر بەدواشـم کـەوتبان نەیاندەناسـیمەوە. بـەڵام زۆر برسـی و تینـوو ببـووم، لـە بەیانیـەوە کرێکاری و ئێوارەش شـەڕ! لـە گردەسـۆر کـە دابـەزیم، لە سـەرپەڕی گوندی لە ماڵێک لامدا. دونیا دەهات تاریک دابێت و سێرە هـەڵبگیرێت، چوومە گژ کوندەلانی، دەرکی کونـدەم کـردەوە، دەمـم پێوەنـا دەتگـوت تەریفـە بوویمـە لـە تینـوان، خـۆم زگـاو کـرد. دەرکـی کوندەکـەم دەبەستایەوە، ژنی ماڵەکە کە چاوی پێمکەوت، گوتی: بیسم الله! بیسم الله! ئەتۆ لەمە چێتری[1] یان جندۆکەی؟ گوتم: دایە! نە جندۆکەم، نـە لـە ئێوە چێترم، کرێکاری گـەچم، خـەڵکی گەڕەشـێخانم دایکـم مـردووەو دەچمـەوە. ئـەویش بـەنۆرەی خـۆی دایکمـی ڕەحمـەتبارانکرد و خـۆی کـوێرکرد بـۆ هەتیوکـەوتنی مـن. گـوتم: گـەر نـوردووه نـانێکم بـدەیێ زۆرم برسیە. دوو ئەستوورکی ئاردەساواری دامێ، ملی ڕێگـەم گرتـو هەردووکیانم خواردو بە لایەکی زگم ڕانەگەیشت! دەمویست ڕێگەکە بەگورگەلۆقە[2] ببڕم، بـەڵام بـەحاڵ پێمدەکرا بڕۆم، کاتێک گەیشـتمەوە گونـدی. ماڵمـان بەکرێ لـە خـانووی حـاجی باپیری بـوو لەسـەرپەڕی گوندی.

ئـەوان سـەردەمان، خەڵـک وەک ئێسـتا نـەبوو، خـەریکی پـۆبجی و فەیسبوک بێت، هەر سەرلەئێوارە دەخەوتن، بەتایبەتی وەرزی هـاوین. کە گەیشتمەوە ماڵەوە، جگە لە بـاوکم هـەموویان خـەوتبوون. ئەمنیش

---

١- لەمە چێتر: لە ئێمە باشتر. مەبەست لە جۆرێک لە جنۆکە یان بوونەوەری نەرەوەی مرۆڤ.

٢- گورگەلۆقە: ڕۆیشتنێکە لەنێوان غار و ڕۆیشتنی ئاساییدایە.

یەکجار ماندوو بووم، هەر لە حەساری لبادێکم ڕاخست و لێی خەوتم. بەیانی کاتێک گوجیلە تاژیەکانی باوکم دەست و دەموچاویان دەلێستمەوە خەبەریان کردمەوە. دیاربوو دەمێک بوو منیان نەبینیبوو وا حاڵی بووم خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی، دایکم کە زانی گوجیلە منیان لێستۆتەوە، گوتی: دەبێ گڵاویت لێدەربکەم! قوڕاویان گرتەوە، سێ قوڕاو و حەوت ئاوی ڕوونیان پێداکردم، لەگەڵ چەند بسمەلایەک گوڵاویان لێدەرکردم!

## خەوبینین بە پارەوە

ساڵی ١٩٧٢، باوکم سەرپەرشتی چەند شانەیەکی حیزبی شیوعی دەکرد لە گوندی. خەڵکی ئاوایی، ئەوانەی شیوعیش نەبوون باوکمیان خۆشدەویست، پەیوەندی کۆمەلایەتیان لەگەلی بەهێز بوو، بۆیە بۆ زۆر شت ڕایان وەردەگرت. پیاوێک ناوی کاک حەمەد بوو، هەموو ژیانی بە کرێکاری لە کەرکوک و موسل بەڕێکردبوو، خۆی بە دۆستی شیوعی دەزانی، خێزانەکەی شیوعی بوون. وەک خواست و هیوای هەر کرێکارێک، هەموو ئاواتی ئەوە بوو، ڕۆژێک دەولەمەند بێت و لە کرێکاری ڕزگاری بێت. ئەو پیاوە لە ڕووی ڕۆشنبیریشەوە هەندێک لە پاش بوو. فیترەتی ئەو جۆرە مرۆڤانە وایە کە لە ژیانی هەژاری بێچارە دەمێنن، ئومێد لەسەر شتگەلێکی خورافی هەلدەچنن، بۆ ئەوەی دەستێک لە غەیبەوە بێتە فریادڕەس بۆیان. ئەوسەردەم بەبیرمدێ لە پەنا دیواری مزگەوت و دیوەخان و کۆڕی شەوان، گێڕانەوەی خەون پانتاییەکی زۆری گفت و گۆیەکانی بەردەکەوت، هەر بابا بوو خەونی خۆی دەگێڕایەوە، یەکێک دەبوو بە دەمڕاست و تەفسیری خەونەکانی بۆ دەکردن. هەندێک کۆلکەمەلاو

کۆلکەخوێندەواریش کتێبی خەوننامەیان هەبوو.

کاک حەمەد، نازانم لە کێی بیستبوو گەر یەکێک لە خەودا گوو بخوا، نیشانەی ئەوەیە دەوڵەمەند دەبێت و دەستی بە گەنجینەیەکی زۆر ڕادەگات. ڕۆژێک هاتە لای باوکم، لەوکاتە دوو میوانی دیکەشمان هەبوو، کاک حەمەد دانیشت، بە ڕوخساریەوە دیاربوو هەواڵێکی خۆشی پێیەو دەیەوێ بە تەنها بۆ باوکم باسی بکات. کاتێک میوانەکان ڕۆیشتن، کاک حەمەد گوتی: وەستا عەلی ئەمشەو خەونێکی زۆر سەیرم بینی، خودا بە چاکی بگێڕی! باوکم بە تەوسەوە گوتی: یاالله خێر! خەونی خێرێ بی، بەخێر گەڕابی، یوسفی مسرێ سەدەقەی لێدابی، فەرموو خەونەکەت چیبوو؟ کاک حەمەد گوتی: ئەمشەو لە خەونمدا یەک لەگەنی پڕ لە پیسایيم لەپێش بوو، بەمراکان[1] کەوتمە سەر خواردنی، ١٣ مراکم خوارد لە مراکی ١٤ی بەخەبەر هاتم! باوکم گوتی: دەک ڕەببی نۆشی گیانت بێت، ئایا لەگەنەکە پیسایی تێدا مابوو؟ کاک حەمەد گوتی: کەمێکی لە بنی مابوو، باوکم گوتی بریا بنی لەگەنەکەت بلێستباوەو هیچت تێدا نەهێشتباوە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە انشاالله دەولەمەند دەبیت، دەستت بە گەنجینەیەکی زۆر ڕادەگات و لەو تەنگەژەیەی تێیکەوتوی ڕزگارت دەکات! کاک حەمەد دیار بوو حەزو ئۆخژنەک لە ناخیدا چەکەرەی کرد، هەر زوو مالئاوایی کرد، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵە خۆشە بە خێزانەکەی ڕابگەیەنێ.

١- مراک: کەوچکی چێشتخواردن. لە بنەڕەتدا (ملعقە)ی عەرەبییە.

## عاملاندن

لــە نێوەڕاســتی پــایزی ســاڵی ١٩٧٣، لــە چەنــد ڕۆژی ڕابــردوو نەرمەبارانێک بارییبوو، هەر بایی ئەوەی زەوی نەرم کردبۆوە و لە جێ جۆخینان پاشماوەی کووزر و بنجۆخین، وەک کاکۆل و سمێڵی تازەلاوێک قان قان سەوز ڕوابوو.

ئەو ڕۆژە، لە بەربەیاندا لەگەل ئەنگوتنی سرووە، ئەستێرە خۆیان شــاردەوەو مانگیــان بــە تــەنها هێشــتەوە! هەرچەنــد دەمڕوانــی، تاقــە ئەستێرەیەکم لە دەوری مانگ بەدی نەکرد، تەنها بۆ ڕازو نیاز لەگەل مانگ، هەربۆیە مانگ لە حەسرەت تەنهایی لەت بوو.

تیشکی زێڕینی خۆر، تازە سوانەی خانووە گڵەکانی گەڕەشێخانی ماچ دەکرد، تیرێژی خۆر دەلاقەکانی ئاوەدان دەکردەوە. نوزەی بای نەدەهات بایی ئەوەی پەڕەموچەیەک بجولێنی، ڕۆژێکی هێندە سپی و بــە دەســتنوێژ بــوو، ئاســمان ڕەنگــی ئەڵماســی گرتبــوو. ســاماڵێک، دەتگوت ڕێوی ئاسمانی لیستۆتەوە! شوانێک بە ناوی جەمیلی مام حەمەد عەلی، لە ڕێگای گردەسۆری شۆڕبۆوە بە هەرەداوان نێوقەدی گۆپالەکەی گرتبوو بۆ لای ماڵی ئێمە دەهات، بە باوکمی گوت: دوێنێ لەلای گردی نیسکان کەروێشکێک لە پێش مێگەلەمەڕەکەم هەستاوە! ئەو هەواڵە بۆ بابم زۆر گرنگ و خۆش بوو. بابم، خەریکبوو ئەسپی زیــن دەکــرد، بــۆ ئــەوەی بچێتــە گــژ کەروێشکەشــینی. پیاوێــک لــە گوندەکەمان هەبوو، لەوسەری گوندی بۆ ئەوسەری گوندی لەگەڵ هەمووان بەشەڕ دەهات، جاری وا هەبوو کەسی بەدەست نەدەکەوت لەگــەڵی بەشــەڕ بێــت، لەگــەڵ برایــەکانی خــۆی کــە جیرانــی بــوون، بەشەڕدەهات! سال نەبو سەری لە شەش جێیانەوە نەشکێ!

ئەو ڕۆژە دەرگای لە ماڵی ئێمە گرت گوتی: اسماعیل (هەردی برام)

کەڵـــەبابی ئێمـــەی گرتـــووەو لێـــی داوە. بـــاوکم بـــەدەم زینکردنـــی ئەسپەکەی گوتی: ئێمە سێ کەڵەبابمان هەیە، کامەت پێ باشە ببە، من کەڵەبابی ئێوە سەردەبڕم و دەیخۆم! دیاربوو ئەو بەنیازی شەڕ هاتبوو، باوکم گوتی ئەگەر بە نیازی شەڕیت، یەکەم، لەودەمەیدا شەڕم نایێ، دووەم، ئێستا سێ ماڵم لەپێش ماوە، هەرکات شەڕت لەگەڵ کردن، لە نۆبەی خۆم سایلی گوندی، شەڕی خۆمت لەگەڵ دەکەم. هەردیش، بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکات، گوتی: ئەمن نەبووم، کوڕی حەسەنی پلکەفاتمێ بوو. کابرا کە زانی باوکم شەڕەکەی لە گەڵ ناکات، بە بۆڵەبۆڵ ڕۆیشت بۆ سەر ماڵێ حەسەنی پلکەفاتمێ.

دایکم بە هەردی گوت کوڕم یاخوا لوغلوغەت لە زمانی کەوی، ئێستا لەگەڵ ماڵێ حەسەنی دەیکاتە شەڕ، ئەتۆ پێم ناڵێی وەکی سەی پـێ سـوتاو کـو گەیشـتیە ئەوسـەری گونـدی؟ دایکـم ئـەو ڕۆژە لەبەرخۆیەوە هەر دەیگوت: تەمەشا! شەڕ لە بادینان تۆز لە دەرکێ مە!

باوکم ڕۆیشت بۆ ڕاوێ. کاتێک کەروێشک لە لانێ دیاردی دەکاو هەڵیدەستێنێ و تاژی تێبەردەدا، بەسواری ئەسپی دەکەوێتە دوایان، ئەسپەکە لە ئاودرێکی قووڵ بازدەداو ناگاتە ئەوبەری، سەرانگرێ دەبێت، بابم لەهۆش خۆی دەچێت، بەڵام ئەسپەکە باوکم بەجێ ناهێڵێت! تاژییەکە هاتەوە، دەنووسکایەوە، دایکم گوتی: بڕۆ بەدوای سادقی کەچەڵی خانەی و حەیدەری قادری، پێیان بڵێ تاژییەکە هاتۆتەوە باوکم دیارنیە. لە دوایان چووم لەگەڵم هاتن، دایکم گوتی: بەگویرەی ئەوەی تەیرە دەنووسکێتەوە، عەلی شتێکی بەسەرهاتووە. دایکم دەیگوت: هەرچەندی پێمگوت عەلی! بۆ ئاودەنگی یەکێک لەگەڵ خۆت ببە، گوێی نەدامێ، هەندێک قەسپی کوردکوژی لە بارکی کردو ڕۆیشت، ئەو پیاوە قسەی منی ژانەسەرە.

من و سادق و حەیدەر هەیپیمان لێکرد، تاژییەکە لە پێشمان وەک دەلیل دەڕوا، کاتێک ئێمەی بردە لای باوکم، ئەسپەکە لموزی لە باوکم دەدا بۆ ئەوەی قیتی بکاتەوە. سادق و حەیدەر بابمیان قیت کردەوە، باوکم تازە بەهۆش خۆی دەهاتەوە، چاوی هەڵێنا گوتی: ئەوە چی بووە؟ گوتیان بۆ نازانی لە سەر ئەسپی کەوتویە خوار و سەرت شکاوە! گوتی: هەر ئەوەندەم لەبیرە دیاردی کەروێشکێکم کرد و تاژیم تێبەردا.

باوکمیان سواری ئەسپەکەی کردەوە، بەلاّم تاژییەکە بۆ لای زورگی شێخ سمایلی دەڕۆیی، سادق گوتی: با بڕۆین بەدوایدا، گومان دەکەم تاژییەکە کەروێشکەکەی کوشتبێت. ئێمەی بردە سەر کەروێشکەکە بەلاّم فەراقی ڕەشی لێبڕابوو. کەروێشکەکە خۆی هەڵکوتابوو بگاتە قەیمەی[1]، تاژییەکە هەریگرتبوو.

باوکم دەستێکی بالای هەبوو لە عاملاندن و پەروەردەکردنی ئەسپ و تاژی. ئاخر تاژی ڕەسەن نێچیری ناخوات بە مافی خاوەنەکەی دەزانێت، بە پێچەوانەی گەندەل و پیسخۆرەکانی ئێستای وڵات، کە نە عاملێندراون و بێ پەروەردەن، بۆیە دەست بۆ هەموو پیسخۆرییەک درێژ دەکەن!

---

١- قەیمە: قایمە، لانە یان ئەو شوێنەی کە تێیدا سەلامەتە.

## مەلانەفتە کێیە؟

سالّی ١٩٧٣، هاورێی کۆچکردوو مەلانەفتە، لە دەشتی هەولێر ئیشرافی گوندەکانی پشت ڕێ بوو. دیارە بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمووزی مەزن، بۆ ئەوەی وەک کادیر دەرنەکەوێ، حیزبی شیوعی پێداویستی نەوتفرۆشتنی بۆ کڕیبوو، تا بەئازادی بەسەر ڕێکخستنەکانی گوندەکاندا بگەڕێ. بەوپێیە ناوی مەلانەفتەی بەسەردا دەبڕێ و، شانازیشی بەو نازناوەوە دەکرد. لەکاتی زیندانیکردنی، بەخێوکردنی منداڵە سەرکەوبنکەکانی دەکەوێتە ئەستۆی شێرەژنی هاوسەری بە ناوی هەیبەتخان. هاورێ مەلا، ورتکەنانی زیندان کۆدەکاتەوە، لە کاتی سەردانی زیندان دەیداتە خوشکە هەیبەت، ئەویش بۆ منداڵەکانی دەباتەوە بۆ ئەوەی بیخۆن! هاورێ مەلا، پیاوێکی بە هەڵوێست و موکوڕ لە سەر بیرو باوەڕەکەی، نەترس، قسە لە ڕوو. لەنێو جووتیارانی دەشتی هەولێر و شەمامک و قەراج و کەندێناوە، هەتا بلّێی خۆشەویست و خاوەن کەسایەتیەکی سەنگین و باوەڕپێکراوبوو.

من وەکو شاگردێکی ئەو مرۆڤە مەزنە، زۆرم یاداوەری تاڵ و شیرین لەگەڵ ئەو مرۆڤە مەزنە لەبیرکراوە هەیە، چ لە ڕێکخستنی نهێنی و چ لە پێشمەرگایەتی، بەداخەوە بارتەقای خەبات و مێژووی پڕ لە شانازی، ئاوری لێنەدراوەتەوە، بگرە دەفتەری کردەوەکانی تۆزی چەند دەیەیەک داپۆشیووە!٠ بۆیە بە ئەرکی ئەخلاقی و ویژدانی خۆمی دەزانم، ئەوەندەی تەمەن و تەندرووستیم مەودام بدات، یادێک لەو مرۆڤە تێکۆشەرانە بکەمەوە.

هاورێ مەلا، لە تەمەنی مندا نەبوو، بەڵکو چەند ساڵێکیش لە باوکم گەورەتر بوو، لێ هەمیشە وەک هاوتەمەنێکی خۆی هەڵسوکەوتی

لەگەڵدا دەکردم، لە ڕووی سۆزو ئامۆژگاریشەوە، وەک کوڕی خۆی!

بە پێچەوانەی ڕۆژگاری ئێستا، حیزبایەتی پڕاوپڕ بوو لە ئەخلاق و هەڵوێست و ڕاستگۆیی و فیداکاری. وەک ئێستا خەڵک بە حیزبایەتیی شەرم نەبوو، بەداخەوە ئێستا حیزبەکان خاڵی بوونەتەوە لەو پرەنسیپە ئەخلاقییانە، بەرژەوەندی کەسیی، بۆتە تاکەئامانج!

کوڕێکی گەنج، پاڵێوراوبوو بۆ ئەندامییێتی لە حیزبی شیوعی، بە منی گوت شیعر دەنووسم، تۆ بڵێی لە ڕۆژنامەی بیری نوێ بۆم بڵاوبکەنەوە؟ منیش گوتم با ئەو سەرەمانگە هاوڕێ مەلانەفتە بێت، شیعرەکەی نیشان بدە. من دەمزانی شیعرەکەی ڕووی مەجریسی نییە، لێ نەمدەویست ئەو فرسەتە لە دەست بدەم بۆ وروژاندن و تورەکردنی هاوڕێ مەلا!

کاتێک هاوڕێ مەلا هاتە ماڵی ئێمە، هەر زوو بانگی کاکی شاعیرم کرد، هاوڕێ مەلا گووتی: دەی بۆم بخوێنەوە بابە، ئەگەر دەستەی نووسەران پێیان باشبێت ئەوە بەلاوی دەکەنەوە، ئەگەر پێشیان باش نەبێت ئەوە بەلاوی ناکەنەوە!

کاکی شاعیر یەک دوو کۆخەی کردو قورگی خاوێنکردەوە، دەستی بە خوێندنەوەکرد: (بەناوی خودای گەورەو میهرەبان، دانەری زەوی و ڕاگری ئاسمان، ئەوە لینینە ئەوە لینینە، مەندیلی سپییەو کەوێ و سەلتەکەی شینە، ئاگاداری بی مەکەو مەدینە!) هاوڕێ مەلا گۆشتی سەر ڕوومەتی هەڵبەزییەوە، ئەوە نیشانەی تورەبوونی بوو، هەتا دەنگی تێدابوو گوتی (الحکم للە) کورە برام ئەتو کو دەزانی لینین مەندیلی لەسەری بووە و کەوێ و سەلتەی لەبەرکردییە، ئەوجا کێ دەڵێ لینین باوەڕی بە مەکە و مەدینەی هەبووە! لا حەولە وە لا قووەتە ئیللا بیللاهـ العەلییو العەزیم!) ئەوە بەمن نارێن عەلی حاجی تایەری، ئەتوی بە زەمبیلەی لە عاسمانێ لۆ من هینایتە خوارێ؟ یان

لەنێو قۆدی عەتاران! ئەوە کێ تەسقیفی کردووی ئەوەندە بێمستەوای؟

دوای بەڕێکردنی کاکی شاعیر، هێشتا نەهاتبوومەوە ژووری، هاوڕێ مەلا هاواری کرد: کوڕە ئەحمەدۆک! وەرە هەتیم هەتا کەنگێ ئاقر نابی و واز لەوکەتنانە نایینی؟ شرتو شۆی ئەو کوڕەت پێشکاندم! بەشەرەفم، ئەندام قاعیدییەکەت سالەک دوادەخرێ و دەبێ تەوبیخەکی مزر مزریشت بکەن!

ڕۆحت شاد مامۆستا لەبیرکراوەکەم...

## عیشق

عیشق، سەمای ڕوحی پەپوولەئاسای وشەیە، گەڕی ڕەشبەلەکی ڕستەیە، دوگیانبوونی شیعر و لە دایکبوونی گۆرانیە!

**عیشق،** ئاونگ و خوناوەی ئەو نەرمەبارانەیە کە فریشتەکان نەرم نەرم دەیبارێننە سەر ئەو دڵانەی دەبنە مریدی ئەو ڕێبازە پاکە، بۆ ئەوەی لە ژەنگی پاک بکەنەوە و ڕەونەقێکی سەرلەنوێی پێببەخشن، بۆیە، ئەگەر لێی وردبینەوە، دەبینی مرۆڤی عاشق نورانیە و هەمیشە دەدرەوشێتەوە.

عاشقبوون، نەغمە و ئاوازی سروودێکی مەخمەری هێندە نەرمە وەک سەمفونیا لەگەل سروەی دەمەو بەیان و بای بسکان، ئاوێزانی سیما و ڕوخساری سپێدەیەکی ڕەنگ ئەلماسی دەبن، عاشقان لێوی خۆیان بە ئاونگی سەرپەڕەی گولەنەستەرەن تەڕدەکەن، خۆیان لە باڵای سنەوبەرەکان دەئالێنن، تا بەرزترین چڵەپۆپە. لەترسی تەپڵی فتوای ڕق و سەربرین، گۆرانی بۆ ژیانێکی ئاوێزەیی دەچڕن.

**عیشق،** ڕەگەزێکی گرنگی پایەکانی مرۆڤبوونە، هەرکەس عاشق

نەبێت، لە حەسرەت تەنهایی ڕوحی خۆیدا دەمرێ. جیاوازیەكان ناتوانن عیشق سندم بكەن، هیچ میرغەزەبێكی سەربڕ عیشقی پێڕام و دەستەمۆ ناكرێ. تەنها عیشق خەیاڵی فەنتازیای ئەو دیووی ئاسوگەی سنوورەكان دەبینێ، ڕەنگەكانی پشتەوەی كۆلكەزێرینە دەلاوێنیتەوە.

**عیشق**، دیاریەكی خۆزایی بارەگای یەزدانیە، بۆیە پەریەكان بە شاباڵی بەزەیی و بەخشندەیی باوەشێنی ڕوحمان دەكەن. گەر پێتوایە بڕواداری، بێنیاز و نەزەرپاكی، ناكرێ بۆی لە ڕكوع نەبی. قەڵەمڕەوی مەملەكەتی عیشق بێ تخوب و بێ سنوورە، پابەندی هیچ پەیڕەوێكی نێوخۆ نیە، هیچ جیاوازیەكی ئۆلی و ئەتنیكی و ئایدولوژی و چینایەتی نابنە ڕێگر لە بەردەمی.

ڕۆژێك نیگام لە نیگای كچێكی هاوتەمەنم هەڵەنگوت، كە خولیایەكی دوور و درێژی لە ناخیدا پەنهاندا بوو، كاتێك نیگای پەڕجوئاسای دەڕژانە نێو زومی گلێنەی هەردوك چاوانم و پانتایی سەدەفی دڵم، چەند شەپۆلێكی گەرمی خوشەویستی لە دڵم چەقین، تێچەقین و ڕۆچوونێك هەتا سەر مۆخی ئیسقانی ئاژنین كردم!

نیگای ئەوڕۆژە، بووە سەرەتایەك بۆ پەیوەستبوون و گیرۆدەبوونێكی ئەبەدی. هندێك وشەی نیوەچڵ و چەند ڕستەیەكی خنكێندراو وەكو شیلە و ڕەواقی هەنگوین زریچكەی دەبەست و دەچۆڕانەوە نێو ڕوحم، بەدوای وشە نیوەشەرمنەكاندا دەگەڕا ڕستەیەكیان لێ بهۆنێتەوە، ئا لەو كاتە هەستیارەدا دەنگێك وەك هەورەتریشقەی بەهار هەموو وشەكانی پچڕاند، شەپۆلەكانی نیگای هەردووكمانی هەڵكروزاند، ئەوە دایكی بوو بانگیكرد.

چەند ئاوڕ و نیوەئاوڕیك وەك شتێكی لە لای من لێ بەجێ مابێ كە لە چاوانمدا ون بوو، تایەكی گەرم دایگرتم، ئەو شەوە خەو

نەچووە چاوم، هێندەی وشە پچڕاوەکان پاشوپێش کەم، بە هەموو بارێک لە نیازی گەیشتم کە پێم دەڵێ خۆشمدەویی!

لەو ڕۆژەدا ئەو ڕازانەی لەو چاوانەدا بەدیم کردن، تابلۆی خەمیکی قوڵە کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە لە پرێسکەی ئەندێشە و یادەوەریمدا جاویدانیە و زەمەن پێی کاڵ نابێتەوە.

بکوژانی خوشەویستی لە هەر سەرا و دەراوێ، لەسەر کۆسپەی هەر دەرگایێ، هەر کۆلانێ، وەک یاساوڵ ڕاوەستاون، ئامادەباش بۆ ئەوەی عیشق سەرببڕن. وەک شاعیری گەورەی فارس ئەحمەدی شاملو دەفەرموێ: (دێن بۆن بە دەمتەوە دەکەن، نەکا ڕۆژێک گوتبێتت خۆشمدویی! دێن بۆن بە دڵتەوە دەکەن...).

ڕۆژی سەد جار گوێمان لێیە باسی سووتان، خنکان، ڕق، تۆڵە، کوشتن، ئەوەی بڵێ خوشمدەوێی، سێدارەی بۆ هەڵدەبەستن!

داخەکەم، لەترسی جەلـلادی سەما نەموێرا لە شەڕابی خەستی ڕوانینی چاوەکانی بەدمەستی بکەم، نەشمدەتوانی هەستەکانم بە دەستی فەرامۆشی بسپێرم!

ڕۆژێکی جیاواز، خۆر وەک یاقووت دەدرەوشایەوە، کەسێک تا عاشق نەبێ نە جیهانی بەختیاری فریشتەکان و نە جوانی پەلکەزێرینە و زیندویی ڕەنگەکان نابینێ! نە لەگەل پەرەسێلکەش باڵ دەگرێ. هەربۆیەش لەو بازاڕە بێبەزەییەی جیهاندا، ئەوەی کڕینْ و فرۆشتنی پێناکرێ، تەنها عیشقە!

ئێستا کە من وادەی سەفەرمە و ژیان تێکوەردەدپێچم، ئەو پێشهاتە گرنگانەی وێستگەکانی ژیانم، کە کاریگەری لەسەر دەروونم هەبووە و برینێکە لە دڵمدا، بە هۆی کاریگەری نەریتی باوی کۆمەڵگا، نە ئەوەتا ژانی کەم دەکا و نە پێشم فەرامۆش دەکرێ. ڕەنگە لە ڕووم نەهاتبێ باسی بکەم، چونکە لێرە ڕق ئازادە و خوشەویستی

یاساغە، باجەکەیشی هەڵوەرینە!

تەنها نیازمان ئەوەبوو دەمانەویست بە ڕەزامەندی گەورەکانمان بۆ یەکتر بین، بەڵام بەداخەوە لەژێر زوڵمی نەریتی کۆنەپارێزی، بۆ چرکەیەکیش بۆنچەقەوێڕی[1] برژانمان، نەگەیشتە بەر کونەلووتی گەورەکانمان! دوو خەم بوونە ئاوەڵدوانە، یەکەمیان خەمی نیشتیمان کە ڕۆژ بەڕۆژ تێیدا دەتوامەوە و لە نێو زیکری هاوڕێیانم جەزم دەبووم، دووەمیان عیشقێکی پاکژ کە تێیدا ببوومە سۆفیەکی نەزەرپاکی ئەوینداری، دەبوایە بەناچاری، یەکیان بە کێڵی خەونە سەربڕاوەکانم هەڵبواسم! لەسەر د وریانی بڕیاردان، خۆم بۆ یەکیان ساخ کردەوە.

دیارە ئەوەی مامۆستا گۆرانم هەڵبژارد کە دەفەرموێ:

نەڵێ خۆی بۆ وەتەن کوشت و لە ڕێی عیشقی منا نەژیا

وەزیفەم بوو لە پێناوی وڵاتێکا سەرم بەخشم

کە تۆی پەروەردە کرد بۆ من لە داوێنی چیا و کەژیا!

لەو ڕۆژە ددانم لەسەر جەرگی خۆم داگرت، بەری خۆمدا چۆڵەوانی و پشتم لە ئاوەدانی کرد! ئەو بڕیارە نیگاکانی ئەبڵەق کردین شەڕابی کامەرانی قلپ کردینەوە، یەکەم پێکی ئەوینێکی یەکجار پاکژی لێ ڕشتین کە هەرگیز کۆناکرێتەوە!

---

[1] - بۆنچەقەوێڕ: بۆنی برژانی گۆشت.

حازم عەلی کوتك

## عیشق

کە هەست دەکەم خەریکە دێتە گوفتار
لەبەر لێوی دەمرم ڕۆژی هەزار جار

خونچەی دوو لێوی لەسەریەک ترازا
چ بازاڕی دوڕو یاقوت و مرواری نیشان دا!!

سادە و دەروون سپی بێ فرتوفێڵە
گەردنی هەڵدەکێشا وەکو ماینی کەحێلە

کوڵمی سووری تیشکی زێرینی هەتاو
وەک پەڕەی گوڵ گەش دەبێ کاتی شەوئاو

لە گرشەی ڕۆژی چەرخـــی ڕوومەتی تۆ
لە شەرمان خۆی پێچاوە گوڵی شەوبۆ

زوڵفی بادراوی بۆ من بۆتە تەناف
باجی مێرولەیە بچێتە گژ قولەی قاف

خاڵی سەر لێوی وەک پیرۆزەی شینە
دە جارێک حاڵی دەستکوژی خۆشت ببینە

بە تیلەی چاوێکی یاری حەرێم گرانم
خەریکە باڵ دەگرم لەسەر پشتی هەورانم

خاپەرۆکی یادەوەرییەکان

که نایبینم دڵەی پڕئـێش و کۆژان
خەوم دەتۆرێنیَ لـەبەر شین و شـەپۆڕان

دیم لێوم لێدەکرۆژێ دور بەدوری
ئاماژەیە نزیک نەبم لە پەرژین و سنووری

دیارە شۆفارێکی دیووە لـەو سـەراو و دەراوە
بۆیە وەکو ئاسکی سرک بەپڕتاو بوو گەراوە

بەسرتـە پێیگوتم هـــــەتیو برۆ بەولاوە
دەزانی ئاوایی هەموو لێمان بە چـاوە؟

بە سۆزەی بای بەیان سینەی کراوە
نارنـج و لـیمۆ سەریان پێکوەنـاوە

کۆڵان سـەراپا بۆنی ئەوی لـێدیَ
بۆنی ڕەشەڕەیـحانە پەرچەمی شیَ

لەگەڵ لەرینەوەی دوو سـێوی کاڵی
دەلـەرزێنیَ عـەرشی پـاشا و قـەڕاڵی

بـاڵای بەرزی نە کز و نـە گۆشـتنە
پوزی سپی و بیَ دەرمانی توکنە

### حازم عەلی کوتك

گەندەموی بناگوێ و لاجانگ و قۆڵی
ئەبرۆی دەست نەخـــۆردە و تیری مژۆڵی

پەرچەم کەلاَفە ئاوریشمی ولاتی چینە
لەژێر تیلاکی خواری چین بە چینە

بسک و پەرچەم لاجانگی دادەپۆشێ
مەیلی عاشق بۆ کەتنێک ڕادەکێشێ

خوا دەزانێ چەند پەرێشان و پەشێوە حاڵەکەم
داخەکەم دوێنێ نەمدیووە دیتنی قەڵلا دەکەم

هێندەی ڕووم لە بەژنی تۆ بوو ڕووم لە قاپی خودابا
دەبوو ڕەواجی خەڵوەتی سۆفی لە ئاستی من شکابا

چەرخەی ڕومەتی هەتاوگـاز ڕوگـەمە
فەرزە لە دەوری بگەڕێم لە جێی بەردی کەعبەمە

لە دونیا دا چیم لە دەست دێ ڕاونراوو دەربـــەدەر
هەر ئەوەندە مەگەر بێمە سۆراغت ڕۆژی مەحشەر

## یاسین حاجی تایەر

عەگیدێ ماڵەبابێ من هەیلێ!
كەسایەتی و جوامێری و هەیبەتی، پێش زەمەنی خۆی كەوتبوو!
تاوەكو دنیا لە تاریكایی وەرنەپێچرابایە، قسەی دڵی خۆی نەدەكرد!
لە ترسی زەبری شەوانی، ناحەز لێی دەپرینگایەوە!٠

یاسین حاجی تاهیر، ماڵی لە گوندی ئۆمەراوەی سەر بە ناحیەی قوشتەپە بوو، هەر لە نێوەڕاستی پەنجاكانی سەدەی ڕابردوو، هەستی بە چەوسانەوەی چینایەتی كردبوو، بۆیە بەدوای ڕێگایەكدا دەگەڕا، خەباتی تێدا بكات بۆ كۆتاییهێنان بە چەوسانەوەی چینایەتی و پلەبەندی مرۆڤەكان. بەو هۆكارەوە، خۆی لە نێو ڕیزەكانی حیزبی شیوعی دیتەوە و بوو بە هەڵگری هزری ماركسی.

لە سەرەتای حەفتاكان، دوابەدوای بەیانی ڕێككەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، لە بیرمە لە خۆشی ئەو بەیانە مێژوویییە، مامم یاسین حاجی تاهیر كە من بە كاكە یاسین بانگم دەكرد، وەك نەریتێكی ئەو سەردەمەو سایلی زۆربەی خەڵكی كوردستان، یەك یەدەگ فیشەكی دەمانچەی تەقاند!

لە دوای ئەو ڕێككەوتنە، حوكمڕانیی دهۆك و هەولێر و سلێمانی، بۆ ماوەی چوار ساڵ ڕادەستی پارتی كرا. عبدوالوهاب ئەتروشی بوو بە پارێزگاری هەولێر، شێخ ڕەزا بە بەڕێوەبەری پۆلیس.

پارتی، لە ڕێگای ئەو بەرپرسانەوە، كەوتە وێزەی شیوعیەكان و خەڵكی نیشتیمانپەروەر، بۆ ئەوەی دەستبەرداری پارتەكانی خۆیان بن و بەربەرەكانێ لەگەڵ دەرەبەگایەتی نەكەن، دژی چەوسانەوەو پلەبەندی مرۆڤەكان نەوەستن، تەسلیم بە خواست و كەڵكەڵەی حیزبی قائید بن!

ڕۆژێـک بووکگواسـتنەوە بـوو لـە گەڕەشـێخان، ژن بـۆ سـاتقی کەچـەری خانـەی یـان هـادی ئـامۆزای بـوو، دەهـات. کـاکم یاسـین و هیدایـەتی پیـرداود کـوڕەی، بانگێشـت کرابـوون بـۆ ئـەو داوەتـەی. ئـەوکات بـاو بـوو نیشـانیان دادەنـا بـۆ تفـەنگانێ، پێشـبڕکێ بـوو بـۆ ئـەوەی بـزانن کـێ نیشانشـکێنەو تفـەنگچی باشـە! کاغـەزێکیان لـە جەڕەیـەک پێچـا لـە سـەرڕێگای گردەسـۆریان دانـا، وەک ئێسـتام لەبـەرچاوە سـەیرم دەکـرد، هـەرچی پێشـمەرگەی پـارتی ئامـادەبوو تفـەنگیان هاوێشتە نیشـانەکە، کەسیان نـەیانپێکا! خـەلکی گەڕەشێخان گوتیان: ئەوە یاسینی حاجی تاهیری هات، ئێستا نیشانەکە دەئەنگێوی. مـەولود ڕەسـوڵ، پێشـمەرگەیەکی پـارتی بـوو، پیـاوێکی ئـازابوو نـاوی خـۆی بیسـتبۆوە، زۆری تفـەنگ هاوێشـت لێـی نـەدا، زۆر تـووڕەبـوو، تفەنگەکەی بە ئەرزی دادا، دەیویست بیشکێنی. خەڵکەکـە گوتیـان دەی یاسـین بـزانین چـی دەکـەی؟! کـاکم یاسـین گـوتی: ئـەوە نیشـانەی دەمانچەیـە نـەک تفـەنگ! دەمانچـەی هەڵکێشـا، چواردەخـۆرێکی سـێ غـازی دەسـکزەردی پێبـوو، پشـتی بـە لـەودەی کـای دا، دەمانچـەی لەسەر دەسـتی دانـا، یەکـەم فیشـەک پارچـەی جـەڕەی بردە ئاسـمانێ! پارتیـەکان زۆریـان پـێ نـاخۆش بـوو، شـیوعیەک نیشـانی بـە سـەردا شکاندوون!

هیدایەت گوتی لەگەڵ یاسینی چووین بۆ (جدیدەی لـەکان) بۆ مـاڵی ئەنوەری حاجی عومەری کە دواتر بە شەهید ڕۆستەم ناسرا. ئـەنوەر پێیاندەڵێ خزمێکمان بووکگواستنەوەیەتی، دەبێ بچین بۆ ماڵی ئـەوان. ئەوانیش لەگەڵی دەچن. چەند چەکدارو بەرپرسی پارتیش لەوێ دەبن، کـە جەڕەیـەکی ئاویـان کردۆتـە نیشـانەو بـەنـۆرە تفـەنگی داوێنـێ، کەسیان نایپێکن! بەرپرسەکە دەڵێ: تفـەنگ و فیشـەکی بدەنـە ئـەو دوو برادەرەی بزانین دەزانن تفـەنگی بـاوێن! کـاکم یاسین دەڵێ تفـەنگمان

ناوێ دەمانچەمان پێیە! بەرپرسەکە گاڵتەی پێدێ. هیدایەت گوتی: یاسین دەمانچەی سوارکرد، یەکەم فیشەک کورتی کرد خۆڵی بە جەڕەکەیداکرد، دوەم فیشەک جەڕەکەی شکاند. بەرپرسەکەی پارتی زۆری پێ ناخۆش دەبێت نیشانەی بەسەردا شکاوە، دەکەوێتە بڕو بیانوو و دەڵێ: ئەوانە کێن؟ چۆن دەبێ دەمانچەیان پێ بێت؟ هیدایەت گوتی نانەکەمان نەخوارد ئەوێمان بەجێهێشت.

باوبوو، لە شایی ڕەشبەڵەک کاتێک پارتیەک دەیگوت فارس باوە یان سابیر شێخ جامی یان فارس کەریم، شاباااااااش! تەقەیان دەکرد. کاکم یاسین لە بەرامبەردا عادل سەلیم یان مەلا نەفتە یان عەلی حاجی مەخموری شاباش دەکرد، هیدایەت ئاسمانی سوور دەکردەوە بە گوللەی! ئەوانە هەمووی باری ڕاپۆرتەکانی سەر کاکم یاسینی، لە لای عبدوالوهاب ئەتروشی و شێخ ڕەزای، قورس و قورستر دەکرد، مانگ نەبوو کاکم یاسین و هیدایەت لەلایەن پارتییەوە نەگیرێن و ئەشکەنجە نەدرێن!

ڕۆژێک دوو پێشمەرگەی پارتی، لەسەر جادەی کەرکوک هەولێر، عەرەبێکیان ڕووتکردبۆوە، کاکم یاسینیان پێ تۆمەتبار کرد و دۆسیەیان ڕەوانەی مەحکەمەی سەورەی بەغدا کرد، حوکمی بیست ساڵی بەسەزدا سەپێندرا. خەلکی ناوچەکە لەجیاتی کاکم یاسین سوێندیان دەخوارد، دەیانگوت یاسین حاجی تاهیر ڕەوشتبەرزە، پیاوی ڕاووڕوت نیەو، ڕێگری کاری شیوعیەکان نیە!

باوکم و مامم حسێن شەو ڕۆژ بەدوای بەردانی کاکم یاسین وەبوون، بابم یان لە ئەبوغرێب بوو یان لەلای موکەڕەم تاڵەبانی و عامر عەبدوالله بوو، دیاربوو ئەحمەد حەسەن بەکر سەرکۆماری عیراقیان گەیاندبووە ئەو باوەڕەی کە پارتی بەزۆر دەیەوێ ئەو تاوانە بەسەر یاسین حاجی تاهیردا ساغ بکاتەوە! بۆیە مەرسومی

جمهوری تایبەتی بۆ بەردانی دەرچوو.

ئەوان سەردەمان وەک نەریتێک، هەرکەس دەهاتە لای ئازادکراو تەقەی خۆشیی دەکرد. لەبیرمە هەرکەسیش دەهاتە لای کاکم یاسین، وەک عەلی حاجی، مەلا ئۆمەری کوشافێ، مستەفا ڕەمەزان، شەهید ڕۆستەم و زۆری دی، تەقەی خۆشییان دەکرد، ئەوەش پارتیەکانی هارتر دەکرد! بۆیە پارتی سەنەگەیان لە سەر هەڵنەگرت، تاوەکو لە١٩٧٣/١١/١٤ لە گوندی ئۆمەراوە، لەبەردەرگایماڵی خۆێ، بەبەرچاوی منداڵەکانی، شەهیدیان کرد.

ڕۆژێک، تایەر هەللاجی باپیرم لە هەولێر دەچێتە چایخانەی مام عومەری، لەوێ هەردوو نەوەی خۆی (شەهید کەریم و جەنگی) دەبینێ، پرسیاری یاسینی کوڕی دەکات. ئەوانیش دەڵێن باپیرە! مام یاسین بریندارە. تاوەکو دەیگەیننە نزیک گۆڕستانی گوندی ئۆمەرئاوا. ئینجا لەوێ پێیدەڵێن مام یاسین شەهید بووە و ئەوەش گۆڕەکەیەتی! تایەر هەللاج، ئامێزی لە گۆڕەکەی دەدا و چەندین جار دەڵێ خوایە مەرگ! خوایە مەرگم بدە! ئەوەندە بە خڕکە بەردان لە سنگی خۆی دەدات، خۆی نیوەمردوو دەکات. بە چەند کەسێک هەڵیدەگرن و لە گۆڕەکەی یاسینی دەکەنەوە. لە دوای مانگێک، لە سوێ و حەسرەتی یاسینی، ئەویش بە زگی دا و مرد. لەو ڕۆژەوە، پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی، قورێکی هێندە خەستی بۆ بنەماڵەکەمان گرتەوە، کە لە دوای نیو سەدە لەنێو خوێن و فرمێسک دەپلیقێینەوە! ئەو قوڕە خەستە، مەگەر هەر پارتی و بارزانی بۆ ماڵی حەمەد ئاغای مێرگەسۆریان گرتبێتەوە. یاسین حاجی تایەر هەڵکەوتەیەکی زەمەنی خۆی بوو!

ئەو چەند دێڕە زۆر کەمە لە ئاست، ئەو زوڵمە و ئەو گەورەییەی ئەو مرۆڤە! کارەساتێکی هێندە گورچکبڕ بوو بۆ خێزانەکەمان، تا

ئێستاش گەرمەبرینەو ساڕێژ نابێت! لە دوای ٤٧ ساڵ، شەو نیە وەک خۆرە بەرنەبێتە گیانم!

## مام سەدیق

لەکۆتایی هەفتاکان، لە تاریکەشەوێکی ئەنگوستەچاوی زستاندا، چەند شەوو ڕۆژێک بوو باران نمنم بەردەوام لێی نەدەکردەوە، بارانێکی ئیقلیمگیر بوو، هەر ناوچەکەی ئێمەی نەگرتبووەوە، گشتگیربوو. گوندی قەوغەی گەڕەشێخان خۆی لە سەت ماڵێک دەدا، لەو گوندە زیروح لە دەرەوە نییەو نوقمی بێدەنگی بووە، هێندە تاریکە چاو چاوی نابینێ، ترۆسکاییەک بەدی ناکەی تەنها شەوقی ئاگری نەوتی بابەگوڕگوڕو بیرەنەوتەکانی سەربەشاخی ئەودیوی زورگەزراو لە بەرزگی هەورەکانی دەدا بەحاڵ هەستت بە ڕووناکیەک دەکرد.

لە دوای نانی ئێواران، دەبوایە بۆ کات بەسەربردن، یان بچیە ماڵە دراوسێیەک یان کەسێک دەهاتە لای تۆ، ئاخر نە تەلەفزیۆن نە ڕادیۆیەک نە ئامێرێکی کات بەسەربردن نەبوو، بەناچاری هەتاوەکو کاتی خەوتن دەچوینە ماڵە هاوسێیەک، بۆیە بە دایکم گوت دەسووڕێمەوە ماڵی مام عەلی کوێخا قادر. ئەو کاتەی لە ماڵ دەرکەوتم، گوندێکی کشومات، تەنانەت سەگەکانیش ناوەڕن، ئەوەی گوێت لێدەبێت نێوە نێوە، بە هۆی بارانی درێژخایەنەوە، چۆڕاوگەی ئاوی سولاوکەو سوانەی خانوەکانە. جارجارەش، بەهۆی خوسانی دیوارە قوڕەکانەوە، گوێت لە شڵپەی یەک لە دوای یەکی کەوتنەخوارەوەی چەند تۆپەڵەقوڕێک دەبێت. مرۆڤ چاشمیش و قولاغ دەکات وەک هەستی پێی بونەوەرێک دەچێت، مرۆڤ ئامادە

دەبێت بۆ هەر ڕوداوێکی نەخوازراو، کەسێک بەدەرەوە نیە، لە شەوێکی تاریکی نمنمەی بارانباردا تەلیسمی ئەو بێدەنگیە بشکێنێ. حەسارەکان دەرگایان نییە، ئەگەر ماڵێکیش دەرگای هەبێت، تاوەکو کاتی خەوتنان دایناخات.

ئەو بارانە نەرمە، چەند شەوو ڕۆژی خایاند، کە مایەی دڵخۆشی جوتیارەکان بوو، بەتایبەتی ئەوانەی تۆیان کردبوو. لەنێو هەموو خەتە جووتەکان ئاو ڕاوەستابوو. بۆ بەیانی هەرجوتیارێک دەدوا دەیگوت وەڵڵا پەرەی قەبریشی داوە! یانی ئاو هێندە بەزەویدا ڕۆچوەتە قولایی زەوی، تەڕایەتی گەیشتۆتە ئێسکوپرووسکی مردووەکانیش!

لەوکاتەی گەیشتمە حەساری ماڵی مام عەلی، لە پشت دەرگای ژوورەوە بانگم کرد: ماڵێ! ماڵێ! پلکەفاتم گوتی: ئەحمەد ڕۆڵە ئەوە ئەتۆی؟ وەرە ژورێ کورم خۆ ئەتۆ بێگانە نی بەقوربانت بم! هەر زوو دەمانچەکەی لێوەرگرتم و لەژێر کەواو چارۆگەکەی شاردیەوە، گوتی نەبادا میوانی دیکەمان بێت! ئاخر ئەوان سەردەمان هەر کوردێک چەکی پێوە بگیرابوایە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەردەچوو.

پلکەفاتم هەستی بە هەر جوڵەیەک دەکرد بە دەمانچەکەوە لەپشتم ئامادەبوو، بۆ ئەوەی هەرچی زووە دەمانچەکەم لە چەنگی بنێ. بیرم نەماوە هۆکارەکەی چی بوو، تەنها پلکەفاتم و کەوسەری کچی لە ماڵ بوون، کەوسەر تەمەنی حەوت بۆ هەشت ساڵان دەبوو.

لەناکاو یەکێک بەخۆو بە قوتەگۆپاڵێکەوە خۆی بەدەرگایدا داو هاتە ژورەوە، مام سەدیق بوو، ئامۆزای مام عەلی کوێخا قادر. پیاوێک لێوانلێو لە بەرائەتو سادەیی و سوعبەتی خۆش، وەک هاوتەمەنێکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ مندا دەکردو خۆشیدەویستم، ئەمنیش دەمم لێی سپی ببۆوە، هەموو سوعبەتێکم لەگەڵ دەکرد. ئەوکاتی باوکم، بە

تۆمەتی كوشتنێك، كە كوژراو بكوژی یاسینی مامم بوو، لە زیندانی موسڵی سزای هەتاهەتایی بەسەردا سەپێنرابوو. مام سەدیق وەک هاوسێیەک دەیویست خاوەنداریمان لێبكات. چەند جار دەیگوت وەستا عەلی لە زیندانێڕا پێیگوتوم ئەحمەدو منداڵەكان ئەمانەتی تۆن، هیوادارم مامێكی باش بیت بۆیان. من وەک گەنجێک هەمیشە تەشقەڵەم پێدەكردو ئەو خاڵە لاوازەم بۆ بەرژەوەندی خۆم بەكاردێنا كە گوایە باوكم گیراوەو دەبێ نازمان ڕابگرێ.

مام سەدیق، یەكی سوورەی تێكچەقیوی قوتەخڕەی تۆزێک بەلای قەڵەویدا بوو، دوو چاوی زەقی هەبوو، چاوەكانی وا بەخێرایی گڕدەدا وەک لەسەر بۆڵبەرینگ بن، بە قەپێلكی چاویدا دەسوڕاند. پاڵتۆیەكی ئاودامێنی شۆڕی سەربازی لەبەردابوو، بەهۆی قسەكردنی بەكوردیو جامانەكەیەوە نەبوایە، وات دەزانی سەربازی ڕوسیەو لە جەنگی دووەمی جیهانی گەڕاوەتەوە! هێندەی باران بەسەردا باریبوو، هەڵمی لە جامانەو پاڵتۆكەی هەڵدەستا! هەردوو دەستی لێک دەخشاند بە ئامانجی گەرمكردنەوەیان. خۆی وا ئالقای سۆپایەكە كردبوو خەریک بوو لە ئامێزی بگرێ. بە تەوسەوە پلكەفاتم گوتی: ئاوا گەرم نابیەوە بڕۆ نێو سۆپاكەی!

پلكەفاتم بە مام سەدیقی گوت: بۆ كاسبیەكی ناكەی، ملت دەڵێی قونكەهەوجارە! ئەویش گوتی كوا كاسبی هەیە بەو زستانەی تاوەكو من نەیكەم؟ مام سەدیق، كاتێک خێزانەكەی كۆچی دوایی كرد، ماڵ و منداڵێكی گەلەک زۆرو ڕەشوڕووتی بەسەردا بەجێمابوو، كوڕە گەورەكەی ناوی بەهرام بوو، لە من گەورەتر بوو.

پلكەفاتم گوتی بۆ ڕەمەزانێ نابیە دۆڵەنگێوی[1] پاشێوان؟ بە دۆڵ

---

١- دۆڵەنگێو: دەهۆڵكوت.

لێدانێ خەڵکی بە ئاگا بێنی پارشێوان! ڕۆژی پێشی جەژنەی حەقی خۆتیان لێوەربگرە. ئەمنیش ئەو پێشنیارەم بە هەل زانی گوتم وەڵڵا پلکەفاتم ڕاست دەکات، ئەو ئیشە هی زەغەلو عەمەلمەندەو ملەستوورو دەستوپێ سپیانە، سەری دێشێ بۆ تۆ، دەتوانی کاتێک شەرمت شکاو فێری دۆڵ لێدانێ بووی، پاشی ڕەمەزانێش بەردەوام بیت بۆ بووکگواستنەوەو شایی. خولێکی خێرای بە چاوەکانی لێداو دوو سێ جوونی مزری پێدام گوتی: هەی!... بۆ ئەمن چاوەشم؟ خوات بە قوربانی وەستا عەلی بکات، دەنا هەویری تۆ ئەوەندە ئاوەی نابات، بەو قوتەگۆپاڵەی هەموو ئازای بەدەنم دەشکاندی!

ئەو ڕۆژە، نازانم کێ لە ماڵێ مام عەلی چووبووە شاری، جوتێک پێڵاوی لاستیکی سووریان بۆ کەوسەرێ هێنابوو. کەوسەر هەر زوو زوو پێڵاوەکەی بەسەردەکردەوەو بە کراسەکەی دەیسڕییەوە و لە شوێنی خۆی دادەنایەوەو زۆر دڵی پێ خۆش بوو، لێی خافڵ نەدەبوو. کەوسەر کچی تاقانەی داکی بوو زۆریان ناز دابۆیە، پلکەفاتم زۆری خۆشدەویست. کەوسەر هێندە بەپەلە بۆ لای پێڵاوەکانی ڕۆیشت، کۆسپەیەک لەلای دەرگای بوو، پێیاندەگوت عەتەبە[1]، پەنجەی گەورەی پێی تێهەڵقۆچا[2] بەیەنی نینۆکو پەنجەی خوێنی لێهات، هەندێک سۆتەکە جگەرەیان پێداکردو بۆیان پێچا. بەهۆی ئازاری پەنجەیەوە، بۆ ماوەیەک پێڵاوەکانی لەبیرکرد. ئەمنیش بە فرسەتم زانی گوتم سەرێکی دەرەوە دەدەم بزانم هێشتا هەر دەباری، لەگەڵ هاتنەژوورەوەم، هەردووک پێڵاوەکانی کەوسەرێم هێنا. بەدەم خۆ نزیککردنەوەو خۆ تێهەڵسوین لە مام سەدیقو پێکەنین، کە

---

١- عەتەبە: کۆسپەیەکی گڵین بوو بەمەبەستی ئەوەی ئاوی باران نەیەتە ژوورەوە، لەبەر دەرگا دروست دەکرا.

٢- تێهەڵقۆچا: تێکوتان یان تێناڵقانی قامکی پێ لە شتێک.

گوایا دڵی لە خۆم ڕازی دەکەم‌و سەبوریم پێی دێ، سەرم بە شانی کردبوو هەر تاکە پێڵاوێکیانم لە گیرفانێکی پاڵتۆی مام سەدیق هاویشت. مام سەدیق داوای بەرماڵە نوێژی کردو نوێژی دابەست. لەوکاتەدا سەگێک دەیلووراند، باو بوو دەیانگوت کاتێک سەگ دەلورێنێ و لمۆزی لە ئاسمان دەکات، نیشانەی ئەوەیە تەنێکی نامۆ لە ئاسمان وەک بەڵایەک دێتە سەر زەوی و ئەو سەگە دەپارێتەوە بەڵا لە گوندەکەی دووربێ! کە نزیکتر دەبێتەوە، سەگەکە دەڵێ لە ماڵی خاوەنم دووربێت، دوایی دەڵێ بەڵا تەنها لەخۆم دووربێت! دەیانگوت لینگەپێڵاوێک دەواونخون بکەنەوە. بۆیە پلکەفاتم گوتی: کەوسەر کچم لینگەپێڵاوەکی نخون بکەوە! کاتێک کەوسەر چووە لای پێڵاوەکان‌و پێڵاوی خۆی نەبینی، دەستیکرد بەگریان گوتی: دایە پێڵاوەکانیان بردووم! کەوتینە بەر لێکدانەوە، دەیانگوت ئەگەر لە دەرەوە بوایە دەمانگوت گوجیلە تاژیەکانی وەستا عەلی بردوویانە گەمەی پێبکەن، بەڵام پێڵاوەکان لە ژورەوە بوون. ئەمنیش بە فرسەتم زانی هەتاوەکو مام سەدیق لەسەر بەرماڵە نوێژییە، خۆم دەربازبکەم. بە ئامازە، لەوکاتەی مام سەدیق لە ڕکوع بوو، بە کەوسەرو پلکەفاتم گوت ڕەنگە مام سەدیق شاردبێتیەوە، چونکە کچی هاوتەمەنی کەوسەرێی هەبوو، ئامازەم بۆ گیرفانی پاڵتۆکەی مام سەدیق کردو گومانم خستەسەری و هەستام خواحافیزیم کرد. کەوسەر بۆ پشتراستکردنەوەی گومانەکەی من، ڕانەوەستا مام سەدیق سڵاوی نوێژەکەی بداتەوە، لەپشت دەرگای گوێم لێبوو، زانیم سواری سەری مام سەدیقی بوو، پێڵاوەکانی لە گیرفانی پاڵتۆکەی مام سەدیق دەرهێنا. گوێم لێبوو پلکەفاتم دەیگوت ئەتۆ بەقسەی خۆت دەروێش‌و تۆبەکاری، قەت لە خوای ناترسێی پێڵاوی ئەو تفارەی دەدزی؟ کەوسەر دەیگوت ئەوە دەتویست بۆ کچەکانی خۆتی

بـەری؟ مـام سـەدیق حەپەسـابوو، ئـەرقومی نـەدەکرد و ئـەلفازی نەدەگەڕا. لە دوای مرخێش مرخێشێکی زۆر، مام سەدیق گوتی ئەدی کوا ئەحمەدی مـام عـەلی؟ چـی لێهات؟ گوتیـان ئەحمەدی فـەقیر هـەر زوو ڕۆیشتەوە.

کە گوێم لێبوو مام سەدیق دەیگوت ئەوە کاری ئەحمەدییە، دەمگوت بـرا بـۆ ئـاوا خـۆم تێهەڵدەسووی‌و ئـامێزم لێدەدات! خـۆم دزیـەوەو باریکـەم دایـێ. دوو سـێ جنێـوی مـزری پێدامو گۆپاڵەکـەی داواکـرد گـوتی ئێسـتا دەچمـە ماڵێیـان. خـۆم بـە مـاڵێ خۆمانـدا کـرد، سـەگێکی ڕەشی یەکجار درمان هەبوو، کاتێک مام سەدیق دەیوست لە دەرگـای حەساری ئێمە نزیک بێتەوە، سەگەڕەش شـالاوی بـۆ دەبـردو ئەمنـیش وەک ئەوەی سەگەکە بە دزو پیاوخراپان بوەڕێ، خۆم لـە گێلی دەداو دەمگوت: دەی! کس کس کس قەلـەی خـۆم! هێنـدەی دیکـە سـەگەکە ڕشتی دەکرد.

لە دوای چەند جنێوێک گوتی شەرتبێ لە سەرت ناچی با لـەنێو دوو نانی گەرم بێ هەتا دەتگرم! مانگێک تێپەڕ بوو هەمیشـە خـۆم لـە مـام سەدیقی دەشاردەوە. ڕۆژێک گوتم بـا بـزانم ڕقەکـەی دانەمرکاوەتـەوە هەر دوور بە دووری گوتم: مام سەدیق چووبوومـە زینـدانی موسـڵێ، بابم و مامم زۆر سەلامیان لێدەکردی! ئـەویش گـوتی: سـەلامی خـوای لەوان بێ، خوات بـەقوربانی وەسـتا عـەلی بکـات لـە زیندانێیـە ئەگـەرنا بـەو قوتـەگۆپاڵـەی هـەموو ئـازای بـەدەنم دەشـکاندی، بـەڵام دەسـتی وەستا عەلیم بڕاوە، چونکـە ئـەنگۆی ئەمانـەتی مـن داوە هـەتا دێتـەوە، هەتیمی سەگ ئەتو کەنگێ ئاقڵ دەبی و واز لەو کەتنانە دێنی!؟

## کۆپتەرو سووتاندنی نامەکان

هەلیکۆپتەر، بکوژی شەهید کەریمی برام، ناتوانم شەرحی کاریگەریی ئەو هەواڵە جەرگبڕە لە سەر هەستی خۆمتان بۆ بکەم، هەر ئەو خودایە دەزانێت چەندە ڕقم لە هەلیکۆپتەرە، برینێکی لەناخمدا دروستکردووە، لە دوای ٣٨ساڵ، تاکو ئێستا وشک نابێت، چەند دەکەم قەتماغە ناگرێ، وەکو هەردووک چاوی دایکم خوێنی لێدێ و هەردەم تەڕە.

هاوارتە لە من براکەم! نەتگەیشتمێ خۆمت بەسەردابهێنم، مەگەر لەسەر ڕەخت و جامانە بەخوێنەکەت ئەشکی سوور داببارێنم. کۆپتەر لێم بۆتە کولکی تیراوەی، بەبیستنی دەنگی کۆپتەر دووبارە هەڵدەداتەوە! ئێستاش شەوان لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، کاتێک پێشمەرگەی پاسەوان، هاواری دەکرد: وریا بن هەلیکۆپتەرە هاوڕێیان!

تا ئێستاش لەگەڵدابێت، کۆپتەری باغە و نایلۆنی یاری منداڵانیش ناکرم. گەلێک جاران منداڵەکانم داوایان کردووە، بۆم نەکڕیوون، دایکیان هەمیشە پێیدەگوتن: تەنها داوای کۆپتەر مەکەن! بابتان ڕقی لە کۆپتەرە.

خەریک بوو ببمە (گورەشێت). گورە شێتی هەولێرێ، کاتێک نامەی کوژرانی کوڕەکەی بۆ دێنن، شێت بوو! لەوە بەدوا، بەیانیان کاتێک هەڵدەستا، هەرچی کاغەزی ئەو شارە هەیە هەر هەمووی کۆدەکردەوەو ئێوارە ئاگری تێبەردەدا، وایدەزانی هەمان نامەی گۆرینە، کە هەواڵی کوژرانی کوڕەکەی تێدا نوسراوە!

دڵنیام ئەگەر ئەو پێشمەرگایەتیە نەبوایە، منیش دەبوومە ئەحەشێت! هەرچی کۆپتەری ڕاستی و منداڵانە هەیە هەر هەموویم ئاگردەدا! لەو

ڕۆژەوە یاخیبوونێکی شێتانە لە ناخمدا مووتەربە بوو و سەری هەڵدا.
بە بیستنی دەنگی کۆپتەر مووی لەشم ڕەق ڕادەوەستن، پێمخۆشە بەرەنگاری بم، ئاخر کۆپتەر سەدان خوێنی من قەرزدارە، دەزانن کۆپتەر واتای چی؟! کۆپتەر بکوژی کەریمۆکی برای لە دایی و بابیم، بکوژی شەهید شێرۆی برای دەرێم و هاوڕێکانی، کۆپتەر بکوژی شەهید بەکر تەلانی و هاوڕێکانی، کۆپتەر بکوژی تەواوی خانەوادەی سەعید بۆڵقامیشی، کۆپتەر بکوژی...

## زەنگەسۆرە

پایزی ساڵی ١٩٨٢، پێشمەرگەکانی لقی دەشتی هەولێری حیزبی شیوعی، چەند ئوتۆمبێلێکمان هەبوو، لەوانە، لۆریەکی یابوردەی سەوز کە من لێمدەخوڕی. شەوی دەما دەبوایە بە تاریکی، لە ترسی کۆپتەری، لە گوندەکان دەربکەوین. دەبوایە لەو هەڵەت و کەندو دۆلانەی دەشتی کۆیە بەتایبەتی ئەوبەر ئەوبەری بەستی شەرغەی، تا ئێواریَ خۆمان حەشار بدەین. بەڵام کاتێک دەگەیشتینە شوێنی خۆشاردنەوە، هەر بەتاریکی ئوتۆمبێلەکانمان لە خۆمان دووردەخستنەوە، نەبادا بەهۆی ئەوان ئاشکرا بین. بەرامبەری بەلەبانیَ، گەلیەکی درێژ هەڵدەکشیَ بۆ لای بایزاغای، هێشتا تاریک بوو هاوڕێیانی پێشمەرگەم لەو گەلییە دابەزاند. سووڕامەوە بۆ ئەوەی لۆریەکە ببەمە شوێنێکی دوور لە خۆمان، شەهید وەیسی ماتۆڕێکی پێبوو بەدوامدا هات، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو بگەڕێمەوە لای برادەران. لە خوار بەلەبانیَ، کۆزەدارێکی[1] لێبوو، لۆریەکەم لە ژێر

١- کۆزەدار: کۆمەڵێک دارو درەختی تێکچرژاو کە ڕەتبوون و ڕۆیشتن بەنێویدا سەخت بیَ.

دارەکان ڕاگرت بۆ ئەوەی دیار نەبێت. گەڕامەوە بۆ لای ماتۆڕەکە، دنیا هێشتا تاریکی مابوو، سە و گورگ لێک دەکرایەوە، لقی داربیەکان شۆڕببوونەوە، من بە ژێریاندا دەڕۆیشتم، سەرم نەوی کرد لقی داربیەک کەوتە پشتی ملم. مرۆڤ کاتێک شتێکی بە پشتی ملی دەکەوێ، ملی کورت دەکاتەوە بۆ نێوشانی، منیش بە دەم ڕۆیشتنەوە وەک شیشە گۆشت دابڕنی، ئەو هەموو زەنگەسۆرەم داڕنیە پشتی ملم، هێندەیان پێوەدام ڕەخت و جلوبەرگ و جامانەم فڕێدا، شەهید وەیسی بەنزینی لە ماتۆڕەکە دەرهێنا لە سەر و پشتەملی دام، جلەکانی تەکاندم. گوتم: هەتا زووە بمگەیەنە لای هاورێیان بەڵکم حەبێک دەرزیێک هەبێت. هەتا گەیشتمە لای هاورێیان هەموو سەرو گوێلاکم ئەستوور بوو، کە گەیشتمە لای هاورێیان، دەوریاندام. شەهید اسماعیل چەمەزەردەرە، شارەزابوو قوڕەسووری گرتەوە هەموو سەرو ملی بە قوڕ سواقدام. هەندێک لە برادەران دەیانگوت: هاوڕێ ئیسماعیل ئەوە سەری هاوڕێ حازمت بۆ کێ لە قوڕێ ناوە؟ ئەویش دەیگوت: ئەگەر هەلیکۆپتەر بێت، بێگومان بۆ ئێوە!

هاورێیەک لەمن بە تەمەنتر بوو ناوی تایەری تەلەمەتارو دینگاوەیی بوو، ناوی پێشمەرگایەتی مەلا کەریم بوو، برادەرایەتیمان زۆر خۆش بوو، هەر لەدەورم دەسووڕا، وەک زەنگەسوورەکان بەویانەوەدابێت! بیرمە، لە جادەی قیڕ یان هەر شوێنێک مەترسیی کەمینی لێبکرایە، زۆربەی هاورێیان هەوڵیان دەدا لە پێشەوە بڕۆن، جا چ بە هۆکاری خۆبەخشی و فیداکاری یان لەبەر قسەو قسەڵۆکی دەوروبەر و تۆمەتی ترسنۆکی! منیش وەک هەر هاورێیەکی دیکە، بە نۆبەی خۆم هەندێکجار دەکەوتمە پێشەوە. هاوڕێ مەلا کەریم کە دەیبینی لە پێشەوەم، شەیالەی ڕەختەکەی دەگرتم ڕایدەکێشامە دواوە،

ئــەوکارەی لــە ڕوانگــەی دڵســۆزی بــوو، لەبەرئــەوەی ئێمــە لە بنەماڵەکەمـان شـەهیدمان زۆر بـوو، دەیویسـت بمانپـاریزێ. دیـاربوو ویژدانـی ئـازاری دەدا ئەگـەر شـەهیدی زیـاتر بـدەین، دەیگـوت: کـورە ئەتۆ هەتا کەنگێ ئاقل نابی؟ ئەدی پێت نـاڵێم (نـە نێری بـە لـە بەرایێ شـاخت بشـکێ! نـە پیرەمەڕبـە لـە دوایـێ گـورگ بتخـوا! لەنێوەڕاسـتێ بلـەوەڕێ!) ئـاخر دەڵێی لەبـەر تـاڵانێ ماویـەوە، بۆ دەتـەوێ خـۆت بـە کوشتن بدەی!

کاتێک مەلا کەریم دیتی سەرو ملم بە قوڕە، دەیگـوت خـەمت نـەبێ، ئەوشەو دەتبەمە نێو خزمان لە گردەسۆری سیانان، هـەمووم خزمن، دەتشۆم هەتا ئاوێ ڕۆنت لێدێت!

## گۆمەشین، گوندێک بۆ بازگەی پێشمەرگە

یەک لە ڕۆژەکانی پایزی١٩٨٢، لقی دەشتی هـەولێر، بـە فەرمانـدەیی شـەهید عـەباس، خۆمـان بـە گونـدی گۆمەشـیندا کـرد، بـە نیـازی پەڕاندنــەوەی دوو پێشــمەرگە، لــە شــارێکەی هــەولێر کۆیــە بــۆ بــەرێکردنی پۆســتەو نامــە بــۆ گونــدی مەلــەکان. گۆمەشــین، بــۆ پێشمەرگەی هەمو لایەنەکان گرنگی خۆی هەبوو، تا ڕادەیەکی زۆر لە خەڵکەکـەی دڵنیـابووین. ببـووە بازگەیـەک بۆ پەڕینـەوەو پەیوەنـدی، دەشـتی هــەولێر بـە سـەرکردایەتی و بـە پێچەوانەشـەوە. لـە ڕووی شارستانی و پێشکەوتنەوە، لـەپـێش بـوون. ئـەوەی بیـرم ناچێتـەوە، پیرەمێردەکان، لەبن دیواری، کۆنکانیان دەکرد! ئەوکات کەم کەس ئەو یارییەی دەزانی.

حاجی عەولا ماڵی لەسەر لێوی کەندێ بوو، من پەیوەندیم لـەگەڵی زۆر خۆش بوو، پیکەبێکی هەبوو زۆر جار بەنزینی بۆ لـە پیکەبەکـەی

خۆی دەردەهێنام بۆ تویێتا شلەخەجێیەكەم. جارێک گوتی: ئەو گیسكەم بۆ تۆ داناوە، حەزدەكەم لێی بخۆی كەی سەری بڕم؟ ئەمنیش گوتم: بەیانی بۆ نیوەڕۆ بە شلەساوەر لێینێنن. حاجی عەولا گوتی: هاوڕێ عەباس و مەلا كەریمیش بانگێشت دەكەم. ڕۆژی دوایی من و شەهید عەباس و مەلا كەریم، چوینە ماڵی حاجی عەولا، هەریەكەو لەگەنێک شلەساوار بەگۆشتیان لەپێش دانایین. من، كەرتەنانێكم بە شلەساواری دادا، ویستم لە زارم باوێم، پێشمەرگەی پاسەوان هاواریكرد گوتی: سێ هەلیكۆپتەر بەرەو ئێرە دێن! دەرپەڕین، شەهید عەباس گوتی: هاوڕێ حازم بڕۆ هاوڕێ ئەبو دنیای بیینەوە لەنێو گوندی، ئێوە بچنە خانووی مەلا ئەحمەدی كوێخا عەلی، كە شوێنەكەی زۆر بەرزە. هاوڕێ ئەبو دنیا بە ڕەگەز عەرەب بوو، پیاوێكی باڵابەرزی ئەسمەر، ئاربیجی پێبوو پێشمەرگەیەكی ئازابوو. ئێمە زۆر بە تۆكمەیی دامەزراین، وامانزانی بۆ ئێمە هاتوون. لە دوایی زانیمان ئامركەرتێكی سۆسیالیست بە ناوی سابیر لاتە، دوو تانكەری حكومی هێناوە، ئەو هەلیكۆپتەرانە بەدوای ئەو تانكەرانەوەن. لە دەورلێدانیان دەهاتنەوە سەر گۆمەشینێ. لە دوای چەند دەستڕێژێكی دۆشكە، لە گوندی گورزەیی تانكیەكانیان سووتاند. دوایی بە كاک سابیرمان دەگوت بریا تۆشیان شەهید كردبایە، ئەو ساوارەت لە ئێمە كردە قورزەڵقوورت! دەیگوت من چوزانم ئێوە خەریكی ساوار خواردنن!

ئای خەڵكی ئەو گوندانە چەند خۆڕاگر بوون، چەندمان ئەزیەت دان، چەند گوناح بوون، چەندان نیوەشەو لە دەرگامان دان، نوێنی سەر منداڵەكانیان دا بە ئێمە، بەشەخواردنی منداڵەكانی ئەوانمان خوارد! تەمەن هێندەی بەبەروە نەماوە، بۆیە دەمەوێ پڕ بەدڵ داوای لێبوردن لە هەموو گوندیكان بكەم، گەردنم ئازاد بكەن كە ببوومە

ئەرک بەسەرتانەوە، هەست بە تاوان دەکەم بەرامبەر بە ئێوە، بە گەورەیی خۆتان لێمان ببورن!

## شەهید ئیسماعیل چەمەزەردە

ساڵی ١٩٨٣، کاتێک لەسەر گردێکی باشووری گوندی نێرەگین لە بەستی شەرغە، لە شەری براکان شەهید بوو، لەنێو ڕێژنەی گوللە تەرمەکەمان خستە نێو ئەو ئوتومبێلەی کە من لێمدەخوڕی بۆ مزگەوتی گوندی بەردەسپی. ئەوەی لە دوای تێپەڕبوونی ٣٧ ساڵ هەمیشە دەمکولێنێتەوە، ئەو جووتە پێلاوەی پێی بوو کە هەرتاکەی لە جۆرێک بوو یەکیان ئەدیداس و ئەوەی دیکەیان لاستیک. نەمکرد هەڵیانبگرم بۆ ئەوەی ئێستا لە جێگای وێنەی هەر بەرپرسێکی مافیا تاکێک لەو پێلاوەی شەهید ئیسماعیل هەڵبواسم!

## براکوژی

مارانگەستە لە گوریسی ڕەشبەڵەک دەترسێ! ئەو کابووسەی ٣٨ ساڵە، لەسەر سینەم وەلاناچێ! چی بکەم، بەکرەی یادەوەریە تاڵەکانم بە هیچ جۆرێک داناکەلێ، وەک زەروو، بە جەستەی بیرەوەرییم وەنوساوەو هەڵناوەرێ، تابلۆی قوڵترین ئازارمە و هەرچەند دەکەم لە نیگام نابێتەوە. یادەوەری ئەوڕۆژانە دەرد و کوانی زۆر بەژانی داخی دڵن، لە قوڵایی ڕوحمدا جێیان خۆشکردووە.

لەنێوەڕاستی مانگی ٨ی ١٩٨٣ لە جەنگەی شەڕی براکان لە بناری قەندیل، دنیای پڕنهێنی و ئەفسووناوی قەندیل، هەر دەڵێی خودا بۆ خۆپاراستنی کورد لە هێرشی دوژمنەکانی، دروستیکردووە، بەڵام

ئێمە خەریکی شەقارشەقارکردنی دڵی بووین بۆ سەنگەر لێدان لەدژی یەکتری!
دۆڵی باڵەییان، سەری بە ڕانی قەندیل کردووە و پێینگانی لە پردەشاڵ و جادەی زارگەلییە. وەک پیرێکی زونهاری کەنەفت، چاوەڕێیە دەنگی تفەنگان مەکس بێ و بۆ ئەوەی پشویەک بدات! ئێوارەیە، زەردەی خۆر لە دەست ئاسمانێکی نارنجی خۆی ڕاپسکاند، وەک نەیەوێ چیدی ڕووناکی تیریژەکانی، بەرپێی براکوژەکان ڕوناک بکاتەوە! لە مەفرەزەیەک دەگەڕاینەوە لە سەرووی گوندی ماونان، تاریکی باڵی بەسەر ئەو دۆڵەدا کێشابوو، سەربانی هۆڵەمەڕێکمان کردە شوێنی پشوودانی ئەو شەوە. بەر لە نوستن و دانانی پاسەوان و نهێنیی شەو، هەریەکەو کولێرەیەکی نیوەبرژاوی دەستی ڕامیاری مام غەریبمان خوارد، بە لایەکی زگمان ڕانەگەیشت! سەیری پشتی هەر پێشمەرگەیەکم دەکرد دەتگوت گەچی پێداکراوە، کەفی ئارەقەی چەند ڕۆژێکی پێیوە وشک ببۆوە. ڕەخت و تفەنگەکانمان کرد بە سەرین و لێی خەوتین.
لقی دەشتی هەولێر، شەهید عەباس فەرماندەی بوو، دەبووایە هەریەک لە ئەندامەکانی لق لەگەڵ پەلێک بن بۆ سەرپەرشتی. شەهید عەباس لەگەل پەلی شەهید بڕیار بوو. هاوڕێ کەمال لەگەڵ پەلی هەڵکەوت بوو، ئەو پەلەی من فەرماندەی بووم، سادق لەگەڵمان بوو، دەزگای بێتەلی پەیوەندی لای سادق بوو، لە دەنگی پەیوەندی گرتن لەگەل کانەبی گەورە، خەبەرمان بۆوە. دیاربوو بە سادقی دەگوت: هێزێکی گەورەی یەکێتی دەیانەوێ سەری سەکران و گۆمی کرمەسووران و دوندی قەندیل، کە دەکەوتنە پشتی هێزەکانی ئێمەوە، بگرن. بەو سبەی ساڵحان، هێشتا خێر و شەڕ بەشنەکرابوو، بەربەیانێک لەگەڵ ئەنگووتنی بەیان، کزەبایەکی فێنک کاکوڵی ئەو

پێشـمەرگانەی ڕادەژانـد هێشـتا خەبەرنەكرابوونـەوە، یـەک لەوانـە شـەهید هیوا.

خۆمان كۆكردەوە، بووین بە دوو بەش. هندێک پێشمەرگە لەگەڵ هاوڕێ خەیری مانەوە، بەشەكەی دیكە كە ژمارەیان دە پێشمەرگە زیاتر دەبوو، لەگەڵ من بە شـاخی هـەڵزناین. لـە قـەدی شـاخەكە كانییـەک هـەبوو، شـەهید هیوا كە نـاوی خـۆی (مـەحمودی حەسـەن تەها)ی بوو، مەتارەكانی بۆ هەمووان پڕئاو كرد.

تـازە گزنگـی خـۆر كـەزی زێڕینـی وەک لیزگـەی مـرواری لـە ملـی دونـدی قەنـدیل و سـەری سـەكران دەهاڵاند. قەنـدیل وەک شـوورەی بەردین، چین بە چینە، بەسەر لوتكەیەک دەكەوی، دەبینی لوتكەیەكی بەرزتر هەیە! ئێمە گەیشتینە لوتكەشاخێک، دیتمان لوتكەیـەكی بـەرزتر هەیە.

هاوڕێ وشیار كە ڕابەرسیاسیی پەلەكەمان بوو، لەگەڵ شەهید هیوا چونكە ڕۆژی پێشـوو پشـوویان دابـوو، ئـەو ڕۆژە دەیانویسـت ئەركـە گرانەكان ئەوان بیكەن، بۆیە گوتیان ئێوە لێرە پشـوو بـدەن و ئێمـەش دەچینـە ئـەو لوتكـە و پاسـەوانی دەگـرین، چـاودێری بارودۆخەكـە دەكـەین. كاتێـک لـە ئێمـە نـەدیوو بـوون، لـە ناكـاو ڕێژنـەی گوللـە بەسەرماندا باری، ئێمە بێئاگا لەوەی یەكێتی بۆمان لە كەمیندان بەدەر لەو هێزەی كە پێشتر باسمكرد. هیوا و وشیار بە سەریانداكەوتبوون، ئێمە هەریەک لەبن بەردێک دامەزراین، شـەڕ دسـتی پێكرد، شـاخەوان و سـادق كەوتبوونـە دەسـتەچەپی مـن، ئێرە زۆر بـەرزە و، مامۆسـتا پشـكۆ گوتـەنی (لـە مـاڵی خـودا نزیـک بووینـەوە!)، لـە جیـاتی كڕنـوش بردن، بێشەرمانە وەک بڵێی لەسەر كۆسپەی دەرگای (مسجد الحرام) خەنجەرمان لەسەر قوڕقوڕاگەی یەكتر داناوە، دەستنوێژ بە كوفـارەی خوێنی یەكتر دەشـۆین! داربـەڕووەكان بـە دەسـترێژی گوللـەی گـەرم،

گەڵاکانیان هەڵدەوەرین، نەفرەتیان لەو ڕۆژە دەکرد لەو مەملەکەتەدا ڕووان، نەیاندەویست چیدی سێبەرمان لێبکەن!

بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات، قاسپەی کەو وچەهچەهەی بولبول و کوتەکوتی دارکونکەرە، لەو شاخە دەنگی دەدایەوە بەڵام لەگەل گرمە و دوکەڵی ئاربیجی و قرەی بیکێسی و قرمژنی تفەنگان، زیندەوەر لەو شاخەی نەمان، هندێک لە زەندۆڵان خزان، هندێک لە حەوت کێوان تەقین، لە چەند براکوژێک زیاتر، زیڕوح لەو شاخەیدا نەما! لەوکاتەی فیشەک سەردەست بێ، هەموو دەنگێک خەفە دەبێت. کانەبی لەسەر شاخی، بە دوربینەکەی تەماشای ئەو هێزەی کردبوو کە دە بەرابەری ژمارەی ئێمە بوو، کانەبی نەیدەویست ئێمە لە دەست بدات، بۆیە بە بێتەل بە سادقی دەگوت: پاشەکشە بکەن، ناتوانن بەرگەی ئەو هێزە زۆرە بگرن!

من، ملم نەدەدا چونکە نەمدەزانی ئەو هێزە هێندە زۆرە، وام دەزانی تەنها کەمینەکەیە، بویە سادق بێتەلەکەی دایەدەستی من و گوتی: ئەوە هاوڕێ کانەبی، قسەی لەگەڵ بکە! کانەبی پێگوتم: من بەرپرستم، دەڵێم بکشێنەوە، هێزێکی خۆشناوەتیشم بۆ ناردوون. منیش ڕووم کردە هاوڕێان گوتم: ئەی چارەنووسی هیواو و وشیار؟ هاوڕێیەک گوتی: بە چاوی خۆم دیتم لە کەلێنی داران خۆیان غلۆرکردەوە خوارێ. ڕاستی دەکرد، وشیاری بینیبوو، وای دەزانی هیواشی لەگەڵە، بەڵام بە داخەوە کە وشیارمان بینیەوە گوتی: یەکەم دەستڕێژ هیوا پێکرا و شەهید بوو. هاوڕێ کانەبی ناچاری کردین پاشەکشێ بکەین. دەبوایە یەکێک تەقە گەرم بکات تا ئەوانی دیکە لە مەودای تفەنگ دەردەچن، ئەگەر وامان نەکردبایە سواری سەرمان دەبوون و

چێرەکەیان[1] لەسەر دەکردین، سادق و شاخەوان گوتیان ئێمە لیرە دەمێنینەوە و تەقەدەکەین، ئێوە بڕۆن. گوتم: نابێ! ئێوە بڕۆن، من لێرە دەبم و تەقە دەکەم. هەڵە نەبم، هاوڕێ حاجی دەهامم لەگەڵ مایەوە. کە هەموویان لە مەودای تفەنگ دەربازبوون ئێمەش خۆمان هەڵدا بۆ خوارێ. لەوکاتەدا ئێمە بە بزنە ڕێگایەکدا دەچووینەخوار، ئاوم پێنەمابوو، لەبن داربەڕوویەکی گەورە، شەهید عومەرەڕەش وەستابوو لە چاوەڕوانی من، گوتی: سەلامەتی هاوڕێ ؟ گوتم: بەڵێ!

کاتێ گەیشتمە ڕووباری، هەرچەندی شەهید عومەرەڕەش گوتی ئاو مەخۆوە لە خورێنی و ماندوو بوون، گوێم پێنەدا، هەتا زگاو بووم ئاوم خواردەوە. چەند هەنگاوێک دورکەوتمەوە هەموو ئاوەکەم هێنایەوە، تەندروسیم خراپ تێکچوو، بە شەهید عومەرەڕەشم گوت هاوڕێ برۆ من بەجێ بهێڵە، مەترسی نەماوە و من بە هێواشی دێمە گۆمی کرمەسووران، ڕازی نەبوو بەجێم بهێڵێ، گوتی: شەیالە و نیتاقەکەم بگرە تا بەسەردەکەوین، ڕاتدەکێشم. لەبرسان ئەژنۆم ڕاینەدەگرتم، بەوشێوەیە بەسەریخستم.

درورود بۆ گیانی پاکی شەهید هیوا و شەهید عومەرەڕەش.

ئامانجم لەو گێرانەوە پرئازارە ئەوەیە: با هەموومان یەقینێکمان لا دروست بێ کە جارێکی دیکە کەس زاتی ئەوە نەکات شەڕی براکوژی چەندبارە بکاتەوە!

---

[1] - چێرەکە: کەڵەگایی، ئاماژە بە گەلەکۆمەکێ.

## پەسەندنامە

هاوینی ١٩٨٣، بارەگایەكی پێشمەرگە ژمارەیان دە پێشمەرگە بوو، لە گوندی سمیلانی دۆڵی ڕوستێ بارگەو بنەیان خستبوو. باوكم بەرپرسیان بوو. بارەگای سەرەكی لە ڕوستێ بوو، هاوڕێ ئەبو حیكمەت بەرپرسی گشتی بوو. ئەو هاوینە من و هەردی و بۆتان، لە شەڕی قەندیل بووین، لە باوكم دوور بووین. بەڵام هاوڕێ عومەری حەویزی بەرید ناسراو بە هاوڕێ ئاوات، لە خێزانێكی نیشتیمانپەروەری بەناوبانگی شاری ڕانیەیە، جێگای ئێمەی بۆ باوكم گرتبووەوە. باوكم پێشمەرگەی خوێندەواری خۆشدەویست، بۆیە وەك هاوتەمەنی خۆی هەڵسوكەوتی لەگەڵ هاوڕێ ئاواتی دەكرد. دیارە یەك لە پێشمەرگەكان، بە گوێرەی ڕەوشتی پێشمەرگانە، لەگەڵ كچ و ژنانی دەوروبەر هەڵسوكەوت ناكات، كوردگوتەنی چاوباشقاڵی كردوە. باوكم كاتێك هەست بەو كارە نابەجێیە دەكات، دەیەوێت بەرێی بكاتەوە بۆ لای ئەبو حیكمەت. بۆ ئەو مەبەستە بانگی هاوڕێ ئاوات دەكات، دەڵێ وەرە نامەیەكم بۆ ئەبو حیكمەت بۆ بنووسە. هاوڕێ ئاوات خۆی بۆی گێڕامەوە: دەمێك بوو قەڵەمم لەسەر كاغەز دانابوو، مام عەلی سەری خۆی دەخوراند، منیش گوتم: چی بنووسم؟ باوكم دەڵێ بنووسە: بە پەسەندی دەزانم ئەو ناپەسەندە بێتەوە لای ئێوە، تاوەكو كارێكی ناپەسەندی ئەوتۆی نەكردووە! لەلای خەڵكی ناوچەكە پەسەند نەبێ و كاردانەوەی ناپەسەندی لێبكەوێتەوە، بۆیە مانەوەی لە لای ئێمە بەپەسەند نازانم، هیوادارم داواكاریەكەمان پەسەند بكەن!

كاتێك ئەبو حیكمەت ئەو نامەیە دەخوێنێتەوە، دەڵێ ئەوە كێ نوسیوویەتی؟ باوكم دەڵێ: من بەشی دوو لاپەڕەم قسە بۆ ئاواتی

کردییە، چما ئەو بەکەیفی خۆی، هەر ئەو سێ ڕستەی بۆ تۆ نوسیووە!

## مەملەکەتی من بۆنی جیاوازە

زستانی ١٩٨٣ بارەگایەکمان لە ڕێزان بوو، لە خانووی شێخ سولێمانی بارزانی. خارە خولە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک چووبووە لای شانەدەرو جافرەکانو سۆرانی دۆڵی بیاوێ، هەندێک بەیانو پۆستەری لە دیوارو دەرگای ماڵی عومەر ئاغای سریشمەی، کە مەڕدارێکی سریشمەیی و ماڵی لە کەونە مەکتەبەکەی سۆراندا بوو، دابوو. کاتێک عومەر ئاغا دێتە دەرەوە دەبینی خارەخولە ئەو بەیانو پۆستەرانە لە دەرگاو دیواری ئەوان دەدا، بەخارەخولەی دەڵێ: باشە خولە! ئێرە تەنها منی مەڕدارو ئێوەی لێیە؟ خۆ نەبوویتە[1] منەزەمەی دیبەگەی یان دائیرەی ئەمنی مەخموری، ئەو هەموو بەیانو پۆستەرەت لێداوە! خارەخولەش دەڵێ: بەخوای عومەر ئاغا شوێنێکی لەو دارو دیوارەی ئێوە سەلامەتترم دەست نەکەوت!

خارەخولەو پێشمەرگەکان دەگەڕێنەوە بۆ شانەدەری، لە ڕێگا نابینایەکیان لەگەڵ خۆیان هێنایەوە، پاشان زیاترمان ئەو نابینایە ناسی بەڕاستی هەستێکی زۆر سەرنجڕاکێشی هەبوو، ئەگەر لەنێو ئۆتۆمبێلیش بوایە دەیگوت ئەوە گەیشتینە شانەدەری، ئێرە تەنگەتۆرە، ئەوە گەیشتینە بەردەبەرازی، ئێرە ڕێزانە! لێمان دەپرسی چۆن دەزانی؟ خۆ تۆ چاوت فڕ نابینی! دەیگوت بۆن دەکەم، مەملەکەتی خۆم بۆنی جیاوازە!

---

١- نەبوویتە: نەبۆتە، نەبووەتە.

## لەدوای شێخ ئەحمەدی بارزان

لە بەردەبەرازیش لەبەینی شانەدەری و ڕێزان، پیرەژنێک لەبن نایلۆن شوێنێکی بۆ خۆی کردبۆوە، هەموو شتومەکەکانی وەک دیوار هەڵچنی بوو، خانویەکی یەککەسی دروستکردبوو، بەگەرمای هاوین‌و بەفرو بارانی زستان، لەژێر ئەو نایلۆنە دەژیا. پێماندەگوت بۆ ناچیە ڕێزان یان بارزان، لە خانوویەکدا بژی؟ دەیگوت چۆن لە دوای شێخ ئەحمەدی بارزانی دەچمە نێو خانووی بژیم، ناشکوریە بۆ من، دڵی شێخی نارەنجێنم! هەردی، هەمیشە نانی بۆ دەبرد، بۆیە چیدی نەیاندەگوت لە بەردەبەرازی یان لای پیرەژنەکە، هەموو هاوڕێیان دەیانگوت لەلای داکی هەردی. هاوڕێ ئەحمەد شاهێن ڕۆژێک ئاگری پێنابێ جگەرە دابگیرسێنێ دەچێتە لای ئەو پیرەژنە ئاگری لێوەردەگرێ جگەرە دادەگیرسێنێ، کە هاتەوە بۆ بارەگا دەیگوت هەردی ئاگرم لە دایکت وەرگرت، وێستگەیەکی باشە بۆ پێشمەرگە، کارێکی باش دەکەی نانی بۆ دەبەی.

## ڕێوی و چەقەڵی دووپێ

مەلا جەلالیش نانی بۆ ئەسپەکەی کۆدەکردەوە و لە تورەگەیەکدا بە دارێکی هەڵدەواسی. ئاسۆ و ڕەشوانی برای مچەی، شەوان کە برسی دەبوون دەچوونە گژ ورتکەنانی ئەسپەکەی مەلا جەلالی، تەماتەو ڕۆنیان دەکردو ورتکەنانیان تێدەگوشی. هاوڕێ مەلا جەلال دەیگوت: ئەمن هەر چەندی ورتکەنانی کۆدەکەمەوە ئەو نانە هەر کەم دەکات لەجیاتی زیاد بکات! ئاسۆش دەیگوت: هاوڕێ دەبێ ڕێوی‌و چەقەڵ نەیخۆن؟ هاوڕێ مەلا جەلال دەیگوت: ئەگەر ڕێوی‌و چەقەڵ بوایە، بنی تورگەکەی دەدڕاند یان دەیخستە خوارێ لەو دارە بەرزەی، ئەوە

ڕێوی و چەقەڵی دوویێیە، دەترسم ئەتۆ بیخۆی کوڕی عەلی کوتکی!
لە تۆ بەگومانم، ئاسۆش دەیگوت: ئەگەر ئێمە بیخۆین پێت دەڵێین.

## مام کاوێس

لە گەڵتانم
هاوڕێی ڕۆژە سەختەکانم
هەر وەکو ئەستێرەی پێڵوو،
لە شەوی دەیجوور هەڵاتوو،
لە خوێنی بە ناحەق ڕژاویدا ونبوو
بە دڵێکی باوەڕبەخۆ، شانی لە شانی مەرگ دا،
بوو بە برووسکێک لە ئاگر،
بە نێودەمارمدا گەڕا
بزەی لێوت، لەپی دەستت، لە گەشی هەردووک چاوانت، ئایەتەکانی یەکسانی و هیواکانت زۆر بەگەشی پەڵەی دابوو! پلەبەندی مرۆڤەکان و جیاوازی ڕەگەزی ئۆلی و ئەتنیکی و نەتەوەییت، لە ناخەوە لەگۆڕنابوو. تۆ دەنگی ئەو بلوێرە بووی، کە توورەیی تیشەشاخەکانت،
لە بەرامبەر بێ عەدالەتی هەورەکان، دەژەنی!
چوارناڵی پڕ لە غرووری ڕەوەئەسپێکی سەرکەش بووین،
دژی قامچی، دژی لغاو، دژی سندم،
لە پێدەشت و لە نواڵان، لە لوتکەو لە ڕەوەزان،
دەبووین بە دەسماڵ، بۆ سڕینەوەی فرمێسکی قەتیسماوی چاوی گەشی بێلانەکان!
هاوینی ١٩٨٣ لە گوندی کۆیلەی دۆڵی باڵەییانی بناری قەندیل،

بەداخەوە ئەو ڕۆژە دوو شەهیدمان هەبوو، کە چووبوون ئارد بهێنن لە پشتئاشان، کەوتووبوونە کەمینی یەکێتی. شەهیدەکان، هاوڕێ مازن بە ڕەگەز عەرب و سەمیر عەنکاوە بوون، ئێسترەکەشیان کوشتبوو.

خوێنی هەردووک شەهیدەکەو خوێنی ئێسترەکە هەردووک فەردەئاردەکەی کردبوو بەهەویر، بۆ ئەوەی دایکی شەهیدان، بیکەن بە کولێرەو بەنان، بۆ سەرکردە سەرکێشەکان!

مام کاوێس لە سەر کانیەکە ڕیشی دەتاشی، دیارە هەستی بە ناڕەحەتی و غەمباری من کردبوو، چونکە من بەرپرسی، ئەو پەلە پێشمەرگەیە بووم کە ئەو دوو شەهیدەمان دابوو، بۆیە گوتی: هاوڕێ حازم گەر تیغت نیە با بتدەمێ، وەرە ڕیشت بتاشە، تکایە ئەگەر ئەمن شەهید بووم، هەمووتان ڕیشتان بتاشن!

لە چاوانت دنکێک فرمێسک، لەسەر لێوت زەردەخەنەو، لە دڵتدا بەئارامی شەهیدەکانت ڕادەژاند. کاتێک لێت ڕادەمام! بەخۆم لە خۆمم دەپرسی: ئەو یەقینی سەرکەوتنە!

پایزی ساڵی ١٩٨٣ لە ڕێزان، مام کاویس بانگیکردم: هەندێک چەک و تەقەمەنی و نەهێنی هەن، کە دەبێت ڕایانگوێزین بۆ بارزان... ئەو گواستنەوەیە بە ئۆتۆمۆبیل دەبێ و نابێ بەهیچ شێوەیەک شوفێرەکە بە شوێنی ئەو شتانە بزانێت! دەبێ من و تۆ ئەرکەکە ڕاپەڕێنین.

یەک ئۆتۆمۆبیل دەهاتە ئەو ناوچەیە، ناوی فاریج بوو. مام کاوێس پێیگوت: داوا دەکەین ئۆتۆمۆبیلەکەتمان بدیتێ و کرێی خۆشت چەندە بە زیادەوە دەتدەینێ، هاوڕێ حازم ئۆتۆمۆبیلەکەت لێدەخوڕێت و شوفێریەکەی باشە و خەمت نەبێ، هەم بۆ سەلامەتی تۆو هەم بۆ ئەرکەکەی ئێمەش باشترە. ڕێککەوتین و ئۆتۆمۆبیلەکەی پێدایین. چەکوتەقەمەنیەکانمان بارکرد و خێوەتمان لێ بەست. لە ڕێگا نمنم

یەکەم بارانی ساڵ دەباری، بۆنی خاکمان تێر هەڵمژی، مام کاوێس بەکرەیەکی تەسجیلی لە گیرفانی دەرهێناو خستیە سەر تەسجیلی ئۆتۆمۆبیلەکە، گۆرانیی هونەرمەندی کۆچکردوو، محەمەد عارف بوو، بە غەزال غەزال دەستی پێکرد. مام کاویس هەموو دەنگی دابووە تەسجیلەکە، منیش لێک لێک دەنگەکەم کەمدەکرد، هەتا مام کاویس لێم وەدەنگ هات: توخودا دەنگی کەم مەکە!

ئەوەی تاوەکو ئێستا دەمکولێنێتەوە ئەو ئارەزووە سادەیەی مام کاوێسە، گوتی: هاورێ ئارەزوومە لە پێشەوەی ئۆتۆمۆبیل سوار ببم و باران نمنم ببارێت و جگەرەیەکی ڕۆسمەن دابگرسێنم و گۆرانیەکانی محمد عارف گوێ لێبگرم!

بەهاری ١٩٨٥ لە گوندی ئیلینجاغی کۆیە، لە شەڕی خۆبەخۆ، شەهید ڕێبازی یەکێتی، لە کتێبی قەندیل بەغدای هەژاند، بەشی دووەم لاپەڕە ١٣٦ دەڵێ: کاتێک شەهید ئازاد داربەسەری، هات، گوتی: مام کاوێس لەو پەنایە بریندارەو کەوتووە، یەکسەر چووم بۆ لای، کە بینیم، هەموو ڕۆژانی سەختی ساڵانی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ و ١٩٨٠م بەبیرهاتەوە، کە بەیەکەوە جەولەمان دەکرد. مام کاوێس دەستی بە قسان کرد: حەیف! ئەوە بیست ساڵ زیاترە خەبات دەکەم، کەچی ئێستا لە شەڕێکی ناڕەوادا دەکوژرێم، گوتم: دڵنیابە بە شەهیدێکی گەورەی ئەو گەلەت دەزانم! مام کاوێس داوای کرد گوندەکە چۆڵ بکەن با دکتوری خۆمان بێت چارەسەرم بکات. لەو کاتەی قسەم لە گەڵ مام کاوێس دەکرد، سەلاح شینە کە لە شەڕەکە شکابوو، هات، کە مام کاوێسی ئاوا بینی، گوتی: دەی کەرتی چوار مام کاوێس بکوژن! بەو قسەی سەلاح شینە زۆر عاجز بووم و سەیرێکم کردو بەدەنگێکی بەرز بە پێشمەرگەکانی خۆمانم گوت: هەر کەسێک مام کاوێس بکوژێت، یەکسەر بیکوژنەوە جا هەر کەسێک

بێت! گوتم: تەنها پیاوی (حیز و خوێڕی و ترسنۆک دیل دەکوژێت!) کە سلاح شینە ئەو قسەیەی بیست، بێدەنگ بوو قسەی دیکەی نەکرد.

داخەکەم، مام کاوێس و عەبدوڵلا فەقێ و ئەبو سەعید کە بە ڕەگەز عەرەب بوو لەگەڵ کاوەی جەمال هیرانی، لەو شەڕەدا شەهید بوون.

پرسیاری (ئەو شەڕە بۆچی؟!) هێندەی مەرگت بەئازار بوو؟
ئەو عەوداڵ و گەڕیدەی دوای یەکسانی و خۆرەتاو بوو،
بیروەریت برینێکی هێندە قوڵە چیبکەم قەتماغە ناگرێ،
ئەو ئارزووە سادەیەی تۆ،
هەتا دواپشووی ژیانم ڕۆژ نیە بەرۆکم نەگرێ،
ئێستا دڵم پێشانگایە، وێنەو یادەکانی ئێوە
بەدیوارو بە بەرمیچی ئەو حوجرەیەم هەڵواسرایە،
من چوار مەشقی بۆی دانیشتووم لە ناوەڕاست،
بەس ئەوەند جێتان دەهێڵم،
بۆ حەملەی داری بەیانیان،
یان بۆ پاسەوانی و کەمین یان خەفەریات،
ڕۆژ نیە من چەوری نەکەم تفەنگ و مەخزنەکانم،
تا بۆ نسکێنەی ئێوارە بانگم دەکەن،
لەگەڵتانم،
هاوڕێی ڕۆژە سەختەکانم،
لە گەڵتانم...

## تورەبوونێکی بە ڕووکەش، لەنێو زەردەخەنەی ناخدا

خۆزگە منیش بمتوانیبا بۆ یەک ڕۆژ، حاجی دەهام بم، خەرمانێک لە بەرائەتو خۆشەویستی لە ناخێکی سپیدا پەنهان دابوو. لەجیاتی لۆمەی بەرامبەر، دەکەوتە سەرزەنشتی خۆی!

کۆتایی مانگی ١٠ی ١٩٨٣، لە بارەگای ڕێزانی ناوچەی بارزان، کە ئەو کاتە برادەرانی سۆسیالیستیش، وەک بورهان بلەیی‌و عەولابۆرو چەند ئامیر هەرێمێکی دیکەیش، لەوێ بارەگایان خستبوو. ئێمە کە ژمارەمان چواردە پێشمەرگە بووین، بە ئەرکێکی پێشمەرگانە دەبوایە بچینە ئەوبەری زێی بادینان ناوچەی زێباریان. نیوەڕۆکەی، شەهید عەلی حاجی نادرو کاک مەحموودی برای، کە دوو مەلەوانی لەزەبر بوون، چووبوونە ئەوبەری زێیەکە، بەمەلەکردن یەک گونیە تەماتەیان هێنابوو، بۆ نیوەڕۆ کردیان بە شلە لەگەڵ برنج تێرمان خوارد کە دەمێک بوو شلەی تەماتەمان نەخواردبوو. لە ماڵی مام حەمەدەمین سرێشمەییمان پرسی: ئەگەر بمانەوێت لەزێی بادینان بپەڕینەوە، بە کوێدا بپەڕینەوە؟ گوتیان: ئەو نێوە نە بەلەم‌و نە کەڵەکو چووپی لێ نیە پێی بپەڕنەوە، مەگەر بچنە بەرامبەری بلێ، لەوێ (برێک) بوارێک هەیە ئاوەکەی لە پشتێنتان قوڵترە، بپەڕنەوە. ئەو ڕۆژە، هەرچی دەمانبینی پرسیاری پەڕینەوەمان لێدەکرد، هەموویان هەر ئەو شوێنەیان بۆ دەستنیشان دەکردین.

ئەو شەوەمان لە ڕێزان ڕۆژکردەوە، بەیانی نان‌و چامان خوارد، خۆمان چوست‌و چالاک کردووە، بەڕێکەوتین، هێسترێکمان پێبوو، هەندێک شەکرو چاو فیشەک‌و نانمان لە تێرێک لێبارکردبوو. لە پردی ڕێزان، کە ئاوی چامەو شیروانمەزن و کانیبۆتی بە گەلی سولێ پێدا دێتەخوار، پەڕینەوە. چووینە گوندی بلێی بارزان، تەنها یەک

لاخانووی لێمابوو، ئەگەرنا هەمووی بەسەریەكدا خاپوور كرابوو. چەند هەنگاوێك لە سەروو بلێ، بوارەكەمان دۆزیەوە.

لەدەم زێیەكە سەیرێكی یەكترمان كرد، كە ئەم هاوڕێیانە بووین: شەهید عەونی، بەداخەوە لە دوای ئەنفال لە سێدارە درا، حاجی دەهام، غەفە، شاخەوانەسووری ئامۆزای شەهید عەونی، فوڕات - گەنجێكی باكووری كوردستان بوو، ئاشتی، ئاری شەقلاوەیی، شێخ مەحمود، ڕێبوار، بەداخەوە لەسێدارە درا، سەنگەر مەسیحی - بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ دەركراو پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد كرا، ئاسۆی عەلی كوتك و مـن (حازم عەلی كوتك). سەنگەر، گۆرانیەكانی تایەر تۆفیقی بۆ دەگوتین، زۆر خۆش دەیگوت. دوو هاوڕێی دیكەمان لەگەڵ بوون، بەداخەوە ناویانم لەیاد نیە، ئەگەرنا بێ مەبەستە كە ناویان نەنوسراوە.

بەهۆی ئەوەی لە دوو ڕۆژی پێشوو باران باریبوو، ئاوی زێیەكە شلوێ بوو، بۆیە نەماندەتوانی قوڵایی ئاوەكە مەزەندە بكەین. شەرواڵەكانمان داكەند، كە هیچمان دەرپێ قوڵەمان لە پێدانەبوو، دەلینگی شەڵوارەكانمان بەست ڕەختو گۆرەوی‌و پێڵاو، هەموومان خستە نێو شەلوارەكانمان، دۆخینی نیفۆمان توند گرێداو بە پشتێن لەسەر ملی خۆمان بەست، تفەنگەكانمان لە ملی كرد، هەموومان هەتاوەكو سەرووی پشتێنمان ڕووت بووین. دەستی یەكترمان توند گرت، ملمان لەبەر ملی شەپۆلان نا، ئەوەی دواوە فورات بوو، جڵەوی هێسترەكەی لە دوای هەموان ڕادەكێشا. ئاوەكە، لە هەندێك شوێن دەهات هەڵمانبقەنێ، بەڵام خۆمان بەیەكتری دەگرتەوە، بەهیچ شێوەیەك دەستمان لەیەكتری بەرنەدەدا. حاجی دەهام باڵای لە هەمومان بەرزتربوو، غەفەش باڵای لە هەموومان كورتتر بوو، هەر زۆر كورتەباڵا بوو، ئەگەر لە دەستەچەپی حاجی دەهامی

بوەستایە، وەک ژمارە ١٠ی بوون! غەفە، دەم نا دەم دەیگوت هاوڕێ حازم من ناخنکێم؟ منیش دەمگوت ئەو کاتە تۆ دەخنکێی ئەگەر ئاو گەیشتە گونی حاجی دەهامی، چونکە لووتت لە ئاستی گونی حاجی دەهامییە! غەفەش زوو زوو سەیری ئەو ئەندازەی دەکرد بۆم دیاری کردبوو! ئەوەش حاجی دەهامی توڕە دەکرد، چونکە مرۆڤێکی زۆر شەرمن‌و پارێزبەند (موحافزکار) بوو، ئەو جۆرە شۆخیانەی پێ خۆش نەبوو. کاتێک گەیشتینە ئەوبەری ئاوەکە، بەدەم لەبەرکردنی جلوپێڵاوەکانمان، حاجی لەسەر بەردێک دانیشتبوو پشتی لە ئێمەکردبوو، وەک تووڕەبوونێک بۆڵەبۆڵی بوو، کە چۆن دەبێ من قسەی وا بکەم و باسی ئەو ئەندامەی جەستەی بکەم! ئاخر منیش کەم حاجیم خۆش نەدەویست، کە توڕەبونی ئازاری دەدام. بەڵام کە سەیری دەموچاوم دەکرد تووڕەبوونەکە ڕووکەش بوو، زەردەخەنەی ناخە سپیەکەی ئومێدی بپێدەخشیم. بە هەرحاڵ، بەڕێکەوتین، یەک لە دوای یەک بە مەودای چەند هەنگاوێک. لەبەر تووڕەبوونەکەی حاجی دەهام، کەسمان قسەمان نەدەکرد. ئەو مانگرتنە لە قسەکردن، ئازاری حاجی دەهامی دەدا، کە بە هۆی تووڕەبوونی ئەوە نە گۆرانییەک نە قسەیەک دیاربوو، چیدی بەرگەی نەگرت، گەیشتینە ڕاستی گوندێکی کاولکراو بەناوی زۆرەکڤان‌و گوندی بیرەکەپران، لەناکاو، بەتیلەی چاو دیتم حاجی دەهام لە پشتەوەڕا بەغار دەهات خۆی بگەیەنێتە من، منیش خۆم لە گێلی دا کە گوایا ئاگام لێ نیە! هەر ئەوەندەم زانی لە پشتڕا ئامێزی لێدام‌و ماچیکردم گوتی: ناتوانم لە کەستان تووڕەبم، ئەگەر یەکتان شەهید بن، خوا نەخواستە، من بەزگ دەدەم‌و دەمرم! ئەو چەند قسە نیوەچڵ‌و هێنکەبڕاوانەی، ناخێکی سپی نیشان دەدام!

ئێستاش لەماڵی ئێمەو براو ئامۆزاکانم ئەگەر یەکێک هەموو

ئیشوکارەکان بکاتو دوور بێت لە خۆپەرستی، پێیدەڵێین بۆ بەتەنها هەموو ئیشەکان بە ئەستۆ دەگری خۆ نەبویتە حاجی دەهام؟

زستانی ۲۰۲۰ لە هەولێر لە ماڵی هێمن زەندی خوارزام بووم، کاتێک نەوتیان بۆ هێنا، تانکی سەربانەکەی پڕ بکەنەوە، گوتم: هێمن با بچین یارمەتی گوڵچینی هاوسەرت بدەین، کورم ئەو ژنە نەخۆشەو ئەوە کاری ئەو نیە! هێمن گوتی خارە لێگەڕێ وەک حاجی دەهامی لەمەڕ ئێوە ئیشەکان هەمووی بەخۆی دەیکات! گوتم: هێمن تۆ چۆن حاجی دەهامی دەناسی؟ گوتی لەسەر زاری خارە جەنگی و تۆ و هەردیو ئەوانی دیکە!

بۆیە دەڵێم، حاجی دەهامبون، ئاسان نیە، قوربانیی دەوێ!

## نەورۆزی شاخ

نەورۆزی ساڵی ۱۹۸٤، وەک وێنەو تابلۆیەکی جاویدانی لە هزرمدا تۆمارە، لە قوڵایی ڕۆحمدا جێگای گرتووە، لە یاداوەریم نابێتەوە.

نەورۆز، ڕووگەو ڕەمزی وردوخاشکردنی تەخت و تاراجی زۆرداریيە، ملانێی ئاهورامزدە لە گەڵ ئەهریمەن، پەیامێکە بۆ ئەوانەی عەوداڵ و گەڕیدەی دوای یەکسانیین. نەورۆز، بەرەنگارییە لە گەڵ زوڵم و ستەم، خەباتە لە دژی ئەو زالم و زۆردەستانەی دەیانەوێ، تیرێژی کلاوڕۆژنەکانمان تاریک بکەن، ئاو سەر بڕن، هەناسەکان بخنکێنن، لەدایکبوونمان قەمتەرکەن! نەورۆز، لە ماک و بنچینەدا نەعرەتەو فریاد و خۆڕاپسکاندنە بۆ پچڕاندنی زنجیر و سندمی کۆیلایەتی بەرەو ئازادی و دادپەروەری. گەشکردنی ئاگری نەورۆز، ئەمەکدارییە بۆ خوێنی شەهیدان، بەیەکەوە گرێدان و شەتەکدانی توانای هەرچوار پارچەی کوردستانە.

یەکەم ڕۆژی بەهارە و جەژنی نەورۆزی کوردانە، ئەو قەدپاڵ و دۆڵانە خەملیون، وەک مەخمەری ئاوریشمی سەوز ڕاخراوە، بە سۆزەی بای بەیان لێوی چەقەڵەی دارەکان دەپشکووت، وەک بیانەوێ جەژنەپیرۆزە لە پێشمەرگە بکەن!

بۆنی حاجیلەو گوڵاڵەو کنێر، خانە هەستیارەکانی بۆنکردنیان تەژی دەکرد، مێروولە لە شارەکانیان دەهاتنەدەر، دار فستقەکەی واری شێخ عوسمان بارزانی، خەملیبوو بە گوڵە فستق، وەک شۆڕەژنی کورد سەرپۆشێکی وەنەوشەیی پۆشیبوو. شاتووەکە لە بەهاری بلوغی خۆیدا دەپشکووت، دارقەزوان و داربەڕووەکان، هەریەکەیان چەند جۆری بولبول و پاساری بەسەرەوە نیشتبوو، هەریەکەیان لە ئاوازێک مژدەی بەهار و نەورۆز و لە دایکبوونێکی نوێیان، بە دەوروبەر ڕادەگەیاند. دڵۆپەخوناو و ئاونگ لەسەر کوڵمی گوڵاڵەو کەنێر، وەک ئاقیق و کریستاڵ دەدرەوشایەوە،٠ کەوەکان بە پێکووڕە لەبەرخوناو و تەڕی گیاوگۆڵ، خۆیان هەڵدەدایە سەر تاشەبەردەکان و غوڕڕەیان گەرم دەکرد، قاسپەیان لەگەڵ خووڕەی جۆگاوەکانی ئەو بەهارە ئاوێزان دەکرد. ئای چ سیمفۆنیایەکی شیرین و دڵگیرە، ڕۆحی مرۆڤی وە سەما دەخست! هیوامان دەخواست، نزامان دەکرد، ئەو ڕۆژە تۆپەکانی سەر چیای پێرس مەکس بن، نەبادا وەک ڕۆژانی بەرێ ببنە وەیشوومە، لیزگەی مرواری و یاقووتی گەردنی گاتا و ئایەتەکانمان بپسێنن! ئەگریجەی ڕکوعی کەنێر بسووتێنن، خۆلبارانی باڕووتی ڕەش بەسەر پەرچەم و گەندەمووی لاجانگی حاجیلەو گوڵەهێرۆدا بپرژێنن!

ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵەمان، لە بناری چیای شیرنی دەڤەری بارزان بوو، ئەو ساڵانەی تەنها پێشمەرگەکانی شوعی و چەند پێشمەرگەی سۆسیالیستی لێبوو. بەو توانستە کەمەی هەمانبوو،

توانیمـان ئاهـەنگێکی خنجیلانـە ڕێک بخـەین، خاوەنـداری لـە جـەژنی نەتـەوەیی نـەورۆز بکـەین. هـاوڕێ عـەزیز مـحەمەد و سـەید کاکـە و مامۆستا ئەمین لەگەڵ چەند خانەوادەیەکی شـەقڵاوە و هـەولێر ئامـادە بـوون. مامۆسـتا بـەڵێن و حـاکم بۆتـان و ئـەبو جـەنان ئاهەنگەکـەیان بـەڕێوەدەبـرد. شـەهید مـحەمەد حـەلاق لە شـانۆگەرییەکەدا دەوری کاوەی ئاسنگەری دەبینی. ئاسۆی مام علی و چەند هاوڕێیەک ئەکتـەر بوون. هاوڕێ ئەبو سەعید شیعری عـەرەبی خۆێندەوە. ئـەبو مـیلاد و ئەردەلان گۆرانیان چڕی. داوای لێبووردن لەو کەسانە دەکەم ناوم لـە یــاد نــەماون، چونکــە ٣٧ ســاڵ بەســەردا تێپــەڕیووە، ئەرشــیفی یادەوەریـەکانی زەیـنم هـەر ئەوەنـدە بڕەدەکـا! دەنـا ناونەهێنانیـان بـێ مەبەسـت بـووە. توانیمـان پێشـمەرگەو هـاوڵاتی ئاوێتـە یـەکتر بکـەین، تابلۆیەک بە ڕوحییەتی کاوەی ئاسنگەر و خانۆی لەپزێڕین بئافرێنین. ئەوەی مایەی دڵخۆشـی بوو، برایانی زێبـاری و ڕێکـانی و نێرۆیـی و بارزانی و سورچی، بەشدار بوون بەبێ جیاوازی. نـەورۆز دەرفەتێکـە بـۆ گرێـدانی خـەباتی ڕەوای گەلەکـەمان لـە هـەرچوار پارچـەکراوی کوردسـتان. بەداخـەوە لـە دەسـەڵاتی باشـوور، ئـەو هەوڵـە لـەلایـەن پارتەکان نابینرێ، نایانەوێ خاوەنداری لـەو جەژنـە نەتەوەییـە و هـیچ بۆنەیـەکی نەتەوەییـە هاوبەشـەکان بکـەن، بـەلکو بـە فیتـی داگیرکـەران دەیانـەوێ خاڵـە هاوبەشـەکان لـە یـەکتر بتـرازێنن و بیسـڕنەوە. وەک بینیمــان لــە ڕابــردوو هــەوڵێکی نــەگریس هــەبوو، بــۆ نەهێشــتن و شــێواندنی ســروودی ئــەی ڕەقیــب، کــە هــەرچوار پارچەکراوەکــە لەســەری کـۆکن و بەیەکـەوەمان گرێـدەدات. ئـەو خاڵـە هاوبەشـانە یەکیەتی نەتەوەییمان توندوتۆڵ و تۆکمە دەکات. خاوەنداری نـەکردن لـە نـەورۆز، دەسـتبەردانە لـە مـافی ڕەوای گەلەکـەمان، بـەجێکردنی هەوڵی داگیرکەرانە. لە دوای ئەو ئاهەنگە، هەنـدێک لـە هاوڕێیان، بـەو

ئاهەنگەیان دەگوت(حەفلە) لێ خەڵکی ناوچەکە، بەشێوەیەک سەرو گوێلاکی ئەو وشە عەرەبیەیان شکاندبوو، بتبردبوایە بۆ عەرەبستانی سعودیش نەیاندەناسییەوە. لە ناوچەکە دەیانگوت: حەپلەیەکی خۆش بوو، خودێ هەلەکادی شیوعی حەپلەی بکەن ئەم هەمی دێ حازر بین، حەپلەی شیوعیان گەلەکی بسەبرە!

## مبادەرە

چیای شیرین وەک باوکێکی کەنەفتو بەساڵداچوو، ئامێزی میهرەبانی بۆ بارزان گرتۆتەوەو خۆی بەسەردا هێناوە. ماوەی ساڵێک دەبوو، لە بیرکابەستری هەواری مەلا مستەفای بارزانی، لە بارەگای لقی قەرەچووغ، لە خزمەتی پیاوە سپیەکە هاوڕێ حاجی جەمال، بە گەنجێکی خوێنشیرینو ڕۆحسوک ئاشنابووم، ناوی بورهان مەخموری بوو، تەمەنی هەر پازدە ساڵ دەبوو. بەداخەوە، پێم وانیە زۆربەی بەرپرسان تەفسیری خەونە ڕەنگاڵەییەکانی گەنجێکی ئاوا بە زیبکو زاکونیان ڕاڤە کردبێتو چووبنە قوڵایی مەرامەکانی بوون بە پێشمەرگەی چەندان گەنجی لەو شێوەیە.

بارەگای مەکتەبی سیاسی لەوێ بوو، چەند سەد مەترێک لە کانی بیرکابەستری دوورکەوتبوونەوە، هاوڕێیان عەزیز محەمەدو ئەبوفاروق و چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی لەو بارەگایە بوون.

لقێکی پێشمەرگە، پاسەوانیو پارێزگارییان لە مەکتەبی سیاسی دەکرد. ئەو پێشمەرگانەی لەیادم مابنو زەینم یارمەتیم بدات، هاوڕێیان: حاجی جەمال، ئەبو ئەحرار، عەولا پۆلا، سیامەندی حەمەدە گەورەی، ڕیاز، شەهید بلە، ئەرکان، حەمە، بورهان مەخموریو چەند پێشمەرگەی دیکە. ئەو هاوینە، چوار فڕۆکەی جەنگی جۆری سیخۆی

ڕووسی سەر بە سوپای عێراقی، زۆر بەچڕی بۆردومانی گوندی بازێیان کرد. بەوهۆیەوە بارەگاکانمان چەند سەت مەترێک لە دووری کانیاوەکان دادەنا، بۆ خۆ پاراستن لە زیانی بەردوومانەکان. لەو ناوچەیە گرمەی هەر تۆپێکو کەوتنەخوارەوەی هەر مووشەکێک، لەدەستچوونی قوتی منداڵە هەژارەکان بوو لە سوتانی کەنگرۆکو قەزوانەکان، قرچەی سووتانی جەرگی دایکێک بوو، ڕەشپۆشکردنی چەند ژنە کوردێک بوو.

هاوڕێ حاجی جەمال، کە بەرپرسیاریەتی هەبوو، بەرلەوەی سیوادی بەیانی بداتو دونیا ڕووناک بێت، لە خەو هەڵدەستاو ئاگری دەکردەوە بۆ چالێنانو، بە گفت و لفتێکی خۆش هاوڕێیانی خەبەر دەکردەوە و بەیانیباشی لێدەکردن، بۆ ئەوەی بەر لە بۆردومانی تۆپو فڕۆکە، لە خەو ڕابن و خۆیان ببەستنو ئامادەبن.

هەروەها، حاجی جەمال هەمیشە دەستپێشخەر بوو بۆ دارهێنانو کاری نێو بارەگا، بۆیە هاوڕێیان کاتێک حاجی جەمالیان ئاوا دەبینی، شەرمیان لێدەکردو ناچار دەبوون ئەوانیش بەو ئەرکانە ڕابنو چاوی لێبکەن. بورهان، دەیبینی هەر نێوە نێوە هاوڕێیان کۆدەبنەوەو قسە دەکەن، بەڵام بورهان بەشدار ناکەنو زۆرجاریش پێیدەڵێن بێزەحمەت مەیە بۆ لامان ئێمە کاری نهێنیمان هەیە. ئەویش خۆی لەوان بە دڵسۆزتر دەزانیٚ، هەرچەندە ئەو بەشداری پێنەکردنە بۆی دەبێتە جێگای سەرسوڕمانو پرسیار!

بورهان، ڕۆژێک لە چەند هاوڕێیەک دەپرسی: دەبینم ئێوە کۆدەبنەوەو قسەدەکەن لەگەڵ یەکتری، هۆکار چییە لە منی دەشارنەوەو ناهێڵن لە لاتان دابنشیمو بەشداری قسەو باسەکان بکەم؟ خۆ خوانەخواستە گومانم لەسەر نییە ئەو قسانە لە من دەشارنەوە؟ لە وەڵامدا پێیدەڵێن تۆ تەنها پێشمەرگەی، بەڵام حیزبی

نی، ئەوەی حیزبی نەبێتو لە ڕێکخستنەکاندا کارنەکات، ناتوانێ لەو کۆبونەوانە بەشداربێت! بورهان دەڵێ بەخوای هەتا ئێستا ئەمن ئەو شتەم نەزانییە، کە ئەمن حیزبی نیم، هەوکە پێمبڵێن ئەمن چۆن خۆم بکەمە حیزبی؟ هاوڕێیان پێیدەڵێن: ئێستا ئەتو دۆستی حیزبی، دەتوانی بچیە نێو سیاسەت و دەشتوانی نەچیە نێو سیاسەت! بورهان دەڵێ: ئەوجا سیاسەتو حیزب چیە! خۆ بە منیش دەکرێ! هاوڕێیان دەڵێن: دەبێ بتپاڵێوین بۆ ئەوەی لە دوای شەش مانگ ئەگەر هیچ موشکیلاتت نەبێ، دەبیە ئەندامی حیزبی! ئەویش دەڵێ: دە بمنووسن! ئەوانیش دەڵێن: دەبێت بەخۆت ڕاپۆرتێک بنووسیو داوا بکەی! بورهان بەهاوکاری هاوڕێیان ڕاپۆرتێک دەنووسێو دەیداتە ڕابەر سیاسیی لق. پێیدەڵێن ئەو ماوەی حیزب چاوی لەسەرت دەبێ، بزانی هەڵسوکەوتت لەنێو بارەگاو هاوڕێیان چۆنە؟

بورهان، لەوە بەدوا لەکۆبونەوە گشتیەکان بەشداری دەکات وەک گوێگر، هەموو جارێ دەڵێ: ئەرێ ئەمن زۆرم ماوە ببمە ئەندام؟ هاوڕێیان دەڵێن: ئەگەر بتەوێ ببیە ئەندامو ئەو ماوەیە زوو ببڕی، دەبێت هەر زوو زوو مبادەرە (دەستپێشخەری) بکەی! بورهان دەڵێ: بەخوای ئەمن نازانم مبادەرە هەر کوشەو چۆنیشە! هاوڕێیان دەڵێن: ئەگەر کارێک هاتەپێش، خۆبەخشانە دەبێ بڵێی من ئەو کارە دەکەم، ئەوە هەستکردنە بە بەرپرسیاریەتی! بورهان دەڵێ: ئەوجا ئەگەر وایە لە من گەڕێن بزانن دێڵم مبادەرە وەبەرکەستان بکەوێ! پیاوم دەوێ لەبارەی مبادەرەی شانم لە شانی بدات!

بورهان هێندە بەپەلەبوو تا دەبێتە ئەندامی حیزبی، بۆ هەموو ئیشێک دەستی بەرز دەکاتەوەو دەڵێ ئەمن مبادەرە دەکەم. هەموو ڕۆژێک نێو بارەگا پاک دەکاتەوەو داری وشک دەشکێنێو مەنجەڵو قاپەکان دەشواو هەویری دەشێلێو بە دوو تەنەکان لە کانیێ ئاوی

دێنێ. دەستپێشخەریەکی لیوانرێژ لە بەرائەتو پاکیو خۆنەویستی پێشکەش دەکات!

ئێوارەیەو تیشکی خۆر خۆی لە گەردنی چیای شیرین وەرپێچاوەو دەیەوێت دوایین ماچی نارنجی لە لێوی تەڕی کانی بیرکابەستری بکات. حاجی جەمال دەڵێت: هاوڕێیان پۆست (بەرید)ی حیزبی هاتووە لە مەکتەب سیاسی، ئێستا گەیشتە دەستمان، بەریدی لقی کۆیەش هاتۆتە لای ئێمە بۆ ئەوەی بۆیان ڕەوانە بکەین. کێ ئامادەیە مبادەرە بکات ئەو بەریدە بگەیەنێتە دەستی هاوڕێ محەمەد حەلاق؟ بورهان وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، هەرکە گوێی لە وشەی مبادەرە دەبێت دیسان دەستی بەرزدەکاتەوەو دەڵێ: هاوڕێ من مبادەرە دەکەم! هاوڕێیانیش دەڵێن زۆرباشە. بەو ئێوارە درەنگە خۆی دەبەستێو تفەنگی دەست دەداتێو کۆڵەپشتی پڕ لە ئەدەبیاتو نامەو بەرید لە پشتی هەڵدەداو دەکەوتەڕێ. بەو تولە ڕێگایەی قەدپاڵی چیای شیرنێ، سەربەرەژێر دێتەخوارێ، دەگاتە نێو ئەو دۆڵەی پشتی گوندی هەمدوولا کە لێڕەوارێکی زۆر چڕە، تاریکی باڵی بەسەر ئەو نێوە دەکێشێ.

دیارە لەوکاتەی بە پێچەکانی ئەو دۆڵەدا دەچێتەخوارێ، کەیفی سازدەبێ کە خوا ئەو مبادەرەی بە نەسیب کردووە! لە چڕی دارەکانو تاریکیو تنۆکی ئەو دۆڵە ترسێکی لێدەنیشێو دەست بە گۆرانی محەمەد جەزای دەکات. بەو دەنگە ناسازەی کەسێک نییە پێیبڵێ کڕبە! ئەوە کەی دەنگە! دەڵێی میزی بە تەنەکەی بەتاڵدا دەکەی! دەیەوێ وا نیشان بدات کە ناترسێ!

بورهان گوتی: کاتێک گەیشتمە لای گۆڕستانەکە، ئەو هەموو دارە گەورانە ترسێکیان لە هزرمدا چاند، تفەنگم لە شانم هێنا خوارێو فیشەکم لێخوڕییە بەرتفەنگێ. بە منداڵی هێندەیان لە هزریدا چاندبووم

کە مردوو زیندوو دەبنەوەو دەست لە زیندووەکان دەوەشێنن، زۆر کەس بەو هۆیەوە شێت بووە! غیرەت دەداتە بەرخۆی و لەبەرخۆیەوە دەڵێ: چۆن دەبێت پێشمەرگە بترسێ؟ لەو چرکەساتە هەستیارەدا، دوو تفەنگان بە گۆڕستانەکەوە دەنێ و سوێند لە مردووەکان دەخوات، هەرچی خۆی قیت بکاتەوەو بیەوێ زیانم پێبگەیەنێ، دەبێت تەختی بکەم! ئەوە مەیدان، کام مەیت خۆی پێ پیاوەو قارەمانە، با سەری قیت بکاتەوەو بزانێ چۆن وەک سەگ دەیتۆپێنم! گۆڕستانەکە تێپەڕدەکات و هەر گورگەئاوڕان دەداتەوە بزانێ کەسی بەدواوەیە؟ لەناکاو گوێی لە مرخەمرخی ڕەوەبەرازێکی دەبێت، لەو شەوە تاریکە ئەنگوستەچاوە بەتەنیشتیدا تێپەڕ دەبن. تفەنگێکیش بەوانەوە دەنێ! بەهەزار ناری عەلی، بە پشتی بارزاندا تێپەڕدەبێت، دەگاتە خوار گوندی هۆستان، بارەگای حیزبی سۆسیالیست لەسەر ڕێگایە، بەڵام ئەو، ڕێگای هەڵەکردووەو بەنێو لێرەواریدا دەڕوات. گوندی هۆستان تەنها ماڵی مام خواجەو ماڵێکی دیکەی لێبوو.

لە خوارووی گوندی هۆستان، کانیاوێکی لێبوو، پێیاندەگوت کانی کفرێ، هەرچەندە ئاوی زۆر کەم بوو، ئێمە پێنجسەد مەترێک لە دووری کانیەکە کەپرمان کردبوو. بەرلەوەی بگەیتە کانی کفرێ، لەلای بارزانڕا لێرەوارێکی زۆر چڕە، لە داری بەڕوو و مازوو و گێوژ. بورهان ڕێگای لێ وون دەبێت و سەر دەرناکات، دەزانێ ڕێگاکەی ون کردووە. لەوکاتەدا لە کەلێنی دارەکان، تروسکایی ئاگرێکی کز بەدی دەکات. ئەو تروسکاییە بۆی دەبێتە جێگای ئومێدو ڕووی تێدەکات. بۆ ئەوەی دڵنیاببێتەوە لە دروستی ڕێگاکەی بچێتە سەر ئەو ڕێگایەی دەیگەیەنێتە بارەگای لقی کۆیە لای محەمەد حەلاق و هاوڕێیانی.

زۆربەی شەوان لە دوای نانی شێوان، لە کەپرەکە دووردەکەوتمەوە لەسەر تاتەبەردێک ڕادەکشام، چاوم لە ئاسمان دەبڕی تەماشای ئەستێرەکانم دەکردو لەنێو ئەستێرەکاندا گەلاوێژم دەدی پڕشنگی داوێ، چێژم لە تەنهاییو وردبوونەوە لە ئەستێران دەدی. لەو شەوە تاریکو تنوکە ئەنگوستەچاوانەدا کاتێک لە ئاسمانێ ڕادەمام، لەبەرخۆم دەمگوت ئەو ئاسمانە هی هەموومانە، ئەگەر وایە بۆ دەنگی چەک، دەنگی دارمانو مەرگ مەکس ناکەین؟! ئەو شەوەش، لەسەر بەردێک دانیشتبووم هەستم بە نزیکبوونەوەی کەسێک دەکرد، گوێم لە چرپەی پێی بوو هەر زوو زانیم ئەو کەسە چەکدارە، زرینگەو چرکەچرکی ئاوەزێنەی قایشی تفەنگەکەیو چرکەی مەخزەنی کلاشینکۆفەکەی وایان پێدەگوتم. کاتێک نزیک ببوەوە هیچکام لەو بزنەڕێگایانەی نەگرتبوو کە بۆ لای کەپرەکانی ئێمە دەهات، بەڵکو بە لاڕێدا دەهات. ئەوەش گومانی مرۆڤێکی خراپەکاری لەلا دروست کردم، بۆیە خۆم لە پەنای بەردەکە قاییم کرد، لێگەڕام هەتا زۆر لێم نزیک بوویەوە بۆ ئەوەی دەرفەتی هەڵاتنی نەمێنێ بۆ دواوە. کەسەکە زەینی هەر لەسەر تروسکە ئاگرەکە بوو، بێئاگا لەوەی کەسێک خۆی بۆ لە کەمین ناوە، لەناکاو بە دەنگێکی گڕ لەگەڵ تفەنگ ڕاکێشان گوتم: کێی زەلام؟ نەجوڵێی ئەگەرنا کوژراویێ! دیارە بۆ بورهان چاوەڕواننەکراو بوو، گوتی: پێشمەرگەم. گوتم: نهێنی شەو؟ گوتی: نهێنی شەوم بیرچۆتەوە. گوتم: وەرە پێش! هاتە پێش، دیاربوو بورهان دەنگی منی ناسیبوو، گوتی هاوڕێ حازم منم، بورهان مەخموری. کە هاتەلام، بەتاقی تەنهابوو، کۆڵەپشتێکی بە پشتیەوە بوو، منیش لەو دەمودەستە گومانم پەیداکرد کە بورهان

دەیەوێت تەسلیم بە ڕژێم بێتەوە. گوتم: بورهان کوڕە وەرە ڕاستم پێ بڵێ، بابی خۆم دەتەوێ تەسلیم ببیەوە؟ وەک پێم بڵێ ئاشێڕ[1] لە خەیاڵەکی و ئاشەوان لە خەیاڵەکی، لێم زیت بۆوە گوتی: چۆن تەسلیم دەبمەوە ئەمن ئەوە مبادەرەم کردبیە بۆ ئەوەی زوو ببمە ئەندامی حیزب، ئەوە بەریدی حیزبە بۆ لقی کۆیە! دەستێکم گەیاندە کۆڵەپشتەکەی بۆ دڵنیایی، ڕاستی گوت، هەمووی ئەدەبیاتو نامەو کاغەزبوو. کە باسی مبادەرەی کرد سەرم باداو پێکەنینم هات بۆ ئەو مبادەرە ناوەختو سەقەتەی هاوڕێ بورهانیو گوتم: ویژدانیان نییە، ئەی خوا کوێرتان کاتوماڵتان کاول بکات، ئاخر چۆن دڵتان هات بەو شەوەی بەتەنها بە نەشارەزایی، بورهانی بەڕێ بکەن! ئاخر تەمەنی زۆر منداڵ بوو. گوتم وەرە بابە ئەوە ڕێگای لقی کۆیە. بردمە سەر ڕێگاکەو گوتم: هەر ئەو بستووە سەرکەوە لقی کۆیەیە، ئەگەر دووربایە لەگەڵت دەهاتم! بورهان مبادەرەکەی سەرکەوتوانە ئەنجامداو ئەو شەوە لە لقی کۆیە لای محەمەد حەلاق و هاوڕێیان مایەوەو بەیانی گەڕایەوە بیرکابەستری. لە دوای چاوەڕوانییەکی زۆرو لە پای ئەو هەموو مبادەرەی هاوڕێ بورهان، خوا دەرگای خێرانی لێکردەوەو گزنگی هیوا لە ئاسۆی ژیانی ئەنگوت، کە پێی وابوو زیاتر ڕووناکی بەرێرەوی تێکۆشانی دەبەخشێ، شەرەفی ئەندامێتی لە حیزبی شیوعی پێ بەخشرا.

بەپێشنیاری شەهیدی فەرماندە بلە، بڕیار دەدەن ئاهەنگێک بۆ بوون بە ئەندامی بورهان بگێڕن، ئەو شەوە لە قەدپاڵی چیای شیرین، تەنەکەو دۆلکەی بەتاڵی ماستیو مەنجەڵ دەکەنە ئامێری مۆزیکو تەپڵ لێدان. بورهان کاتێک دەبینێ ئاهەنگو گۆرانی بۆ دەڵێن وا

[1]- ئاشێڕ: ئەو کەسەیە کە باراش (بارەگەنم) دەباتە ئاش بۆ هاڕین.

دەزانێ تازە لە دایکی خۆی بەوەلەد بووە! هێندە کەیفخۆش دەبێت، کە بەرهەمی ئەو هەموو مبادەرەی بە درێژایی ٦ شەش مانگ کردوویەتی، ئێستا دەیچنێتەوە، ئیدی لە کۆبونەوەکان هەڵناوێردرێ!

یەکەم کۆبونەوە، بورهان تەنها گوێ دەگرێ، خاڵی سیاسیو سەربازیو ئیداری هەمووی باس دەکەن، بەر لە کۆتایی کۆبوونەوەکە دەپرسن کێ پرسیاری هەیە، بورهان نووقەی ناکات، دەترسێ پرسیارێک بکات یان شتێک بڵێ پەیوەندی بە سیاسەتو حیزبایەتی و نێوەڕۆکی کۆبونەوەکەوە نەبێتو هاوڕێیان گاڵتەی پێبکەنو پێی پێبکەنن، بۆیە بێدەنگی پێ باشتر دەبێت. ئەو، هەر بە بۆچوونی خۆی وای مەزەندە کردبوو پێی پێبکەنن.

کۆبونەوەی دووەم، بورهان دەبینێ باسی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو بەلشەفیکو لینینو ستالینو جوڵانەوەی شیوعیەت لە جیهان بە پێشەنگایەتی یەکیەتی سۆڤیەت، دەکەن، بورهان گوتی: دیاربوو ئەبو ئەحرارو ڕیازو هاوڕێیانی دیکە، زۆر شارەزابوون لە مێژووەکانو شرۆڤەی ڕووداوەکانو شییان دەکردەوە زۆر بە باشی لێکیان وەردەگرتەوە، وەک بولبول باسی (نەزعی سیلاحی نەوەوی) داماڵینی چەکی ناوەکیان دەکرد، بەڵام من فڕی لێ تێنەدەگەیشتم وامدەزانی گوێزانم بۆ دەژمێرن! گوتیان هاوڕێیان! لە کۆبونەوە دەبێت هاوڕێیان موشارەکە (بەشداری) بکەن لە قسان و پرسیاریان هەبێت. منیش لە دڵی خۆم گوتم خوایە ئەمن مبادەرەم هێندە بە حاڵەکی خۆش تەواوکرد، ئەو جارە نۆرەی مشارەکەیە! گوتم: چۆن مشارەکە بکەین؟ هاوڕێیان گوتیان: پرسیار یان شیکردنەوەی بابەتێک بکەی. بورهان گوتی: ئەو پرسیارە دەمێک بوو مێشکی دەکۆڵیم لە زەینم دەخولایەوە دەستم بەرزکردەوە لەبەدبەختی من هەر زوو گوتیان هاوڕێیان گوێ بگرن، هاوڕێ بورهان قسان دەکاتو مداخەلەی هەیە. پێیان وابوو

بیرمەندێکی هزریی مارکسی قسەیان بۆ دەکات، یان وەک لالێک بە موعجیزە فێری قسەبووبێ، سەرنجیان خستە سەرم، هاوڕێیان هەموو جەستەیان بوو بە گوێ. گوتیان فەرموو هاوڕێ بورهان! منیش بەناخێری گیانم نەمهێناو نەمبرد گوتم: پرسیارەکم هەیە. گوتیان: فەرموو! گوتم: ئێوە دەڵێن یەکیەتی سۆڤیەت ڕزگارکەری گەلانی بندەستەو پشتیوانی چەوساوەو مافخوراوانە، ئەگەر ئەو قسە ڕاستە لۆ سۆڤیەت چەکی دەداتە سەدام حسێنیو ڕۆژانە ئێمە بە سیخۆی ڕووسیو چەکی ڕوسی بۆردوومان دەکرێینو دەکوژرێین! ئەوە نییە ئێمە گەلێکی مافخوراوو بندەستو چەوساوەین، بۆ یارمەتی ئێمە نادات؟ بە پێچەوانەوە یارمەتی سەدامی دیکتاتۆر دەدات! هەر ئەوەندەم خۆشبوو تاوەکو لە پرسیارو ڕەخنەکەم بوومەوە، وەک دارم لە شارە زەنگەسۆرەی وەردابێتو لەخۆم وروژاندبن، هاوڕێ ئەبو ئەحرار دەیگوت ڕاوەستن من وەلامی دەدەمەوە، ڕیاز دەیگوت نا من وەلامی دەدەمەوە، هاوڕێیانی دیکەش بەهەمان شێوە. هەستم لەخۆم ڕاگرت بەتەنها کەوتوومە سەنگەرێک لەبەرامبەر هەموو هاوڕێیان! هاوڕێیان گوتیان: یەکیەتی سۆڤیەت بۆیە چەکی دەداتە سەدامی، دەیەوێت تەوازن قوە (هاوسەنگی هێز) لەناوچەکە ڕابگری. منیش گوتم ئەوجا تەوازن قوە چیە! وەڵڵا ئەمن پێم هیچ نییە! هەر نازانم ئێوە باسی چی دەکەن! ئەوجا (تەوازن قووە) چ پەیوەندی بە پێشمەرگەوە هەیە!؟ هاوڕێیان گوتیان: تەوازن قوە یانی ئەگەر لە شەڕی ئێرانو عێراق بزانن عێراق دەشکێ ئەوە سۆڤیەت چەکی بە عێراق دەفرۆشێ و یارمەتی دەدات، ئەگەر زانیش ئێران دەشکێ ئەوە چەکی بە ئێران دەفرۆشێ! بورهانیش بێ ئەوەی بزانێ تەوازن قوە چیەو مانای چیە، دەڵێ: ئەوجا ئەوە کەنگێ تەوازن قووەیە وەڵڵا ئەوە تجارەتی چەک فرۆشتنە! بورهان گوتی: هەر

كەباسی تجارەتم كرد بەو قسەی هەر یەكجاری گووم لە ئیشەكەی كرد! هاورێیان گوتیان ئەگەر وابێت ئەتۆ یەكیەتی سۆڤیەت بە تاجیری شەڕ ئەژمار دەكەی! منیش گوتم ئەرێ وەڵڵا دەق وایە! بەسەری تۆ لە كۆبونەوە دەریانكردم، گوتیان ئەوە خەلەلی فكری هەیەو سیاسەتی حیزب و ئومەمییەت هەزم ناكات، دەبێت تەسقیف بكرێ!

بەداخەوە، ئەو ئومەمییەتە تاكلایەنەو ئایدۆلۆژیە كلۆمكراو و قفلدراوە، كە خۆی لە هزرو هەڵسوكەوتی هەندێك لە هاورێیان هالآندبوو، وای لێكردبوون لە دەرەوەی خۆیانو بیركردنەوەیان كەسێكی لەخۆیان جیاواز قبوڵ نەكەن، ڕەخنەگرتن لە سیاسەتەكانی سۆڤیەت ئەوكات هێڵی سور بوو، بە هیچ شێوەیەك قابیلی قبوڵ نەبوو، هاودەنگیو ئومەمیەتی ساختە، تەنها ڕستێك جیكایەتی وەهمی بوون، مێشكی ئێمەی پێ ئاژنین دەكرا!

## مەزنە مرۆڤ

مانگی ١٠ی ١٩٨٣، چەند ڕۆژێك بوو بارگەو بنەمان لە بارزانو ڕێزانو دەوروبەری، خستبوو. بارانێك باری، وەك لە چەند نووسینێكی دیكەش باسمكردووە، بۆنی یەكەم بارانی ساڵم زۆر پێ خۆشە كە نەرم نەرم دادەبارێتە سەر قەسەڵو خۆڵەپۆتی بزنەرێگاو گردیلەی سەر شارە مێروولەكان. زۆر حەز دەكەم لەوكاتەدا لە دەرەوە بمو پڕ بە سیەكانم بۆنی ئەو بارانە بكەم، تاوەكو خانە هەستیارەكانی بۆنكردنمیان لێ پڕدەكەم. ئەو بارانە بەرێی پێشمەرگەی نەرمكردبوو بۆ ڕۆیشتن. ئێمە چەند پێشمەرگەیەك، لە بارزان بەرەو ڕێزان بەرێكەوتین، دوو پیاوی بارزانی كە لە برا

قورشیدیەکان بوون، قورشیدیەکان باڵێکی بارزانیەکانن، لە قوشتەپە هاموشۆی لای باوکمیان دەکرد، ئەو دوو پیاوە قورشیدیە دیارە بەخت یاوەریان بوو لە ئەنفالی بارزانییەکانی قوشتەپە ڕزگاریان ببوو، بە ئەسڵ خەڵکی گوندی شرێ بوون، شرێ کەوتۆتە ئەوبەری زێی بادینان بەرامبەر ڕێزان، لەو ڕێ ڕۆیشتنە بووینە هاوڕێی ڕێگاکەمان بۆ ڕێزان. دیاربوو، چونکە ئێمە لە بارزان بووین، دەیانویست بێنە بارزان نیشتەجێ بن، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە لە چیای پێرس دوو تیشەشاخی بەرز هەبوو بەناوی بووکو زاوا، ڕەبییەکانی سوپای عێراقی لەسەری جێگیربوون‌و لەسەر ئەو دوو تیشە هەڵتۆقیبون، ڕۆژانە بارزان‌و دەوروبەریان تۆپباران دەکرد. بۆیە بڕیاریاندا بچنەوە لە شرێ نیشتەجێ بن کە زێدی باب و کاڵان[1] بوو. پاش ئەو ڕێککەوتە، زۆرجار دەچووم بۆ شرێ. بانووی شرێ، بەهاران دەبووە یەک پارچە گوڵە نێرگز، بۆنی دەمار بە دەمار دەڕۆیشت. کۆچەرەکانی سورچی‌و هەرکی کە مەڕدار بوون، دەهاتنە ئەو بانووە بۆ چەراندنی[2] مەڕوماڵاتیان، بەڵام بەداخەوە زۆرجار بەهۆی تۆپباران مەڕی زۆریان لێ دەکوژران‌و ڕەشماڵەکانیان گڕی تێبەر دەدرا .

ئەو دوو پیاوە، زۆر شارەزای ڕێگاو ناوچەکە بوون، گوتیان بە ڕێگای ئۆتۆمبێل، بەهۆی پێچەکانەوە، دوور دەکاتەوە. واچاکە قەدبڕ بڕۆین. ئیدی بەدەستەچەپی ڕێگا کە ملمان لە گردێکی ڕووتەن نا، بەڵام چەند دارەبەنێکی لێبوو کە لە فستق موتربە کرابوون. یەکیان گوتی ساردواێک وەک سارنج[3] لێرە هەیە، با پشوویەک بدەین‌و ئەگەر

---

١- باب و کاڵ: باب و کوڕ، باو و باپیران.

٢- چەراندن: لەوەڕاندن.

٣- شوێنی گلدانەوەی ئاو، کە سەری گیرابێت وەک کانییەک، گۆمیلکەیەک، بۆ ئەوەی سارد بێت.

ئاوی تێدا مابێت ئاو بخۆینەوە. لە دەوری سارداوەکە دانیشتین، یەک لە بارزانیەکان کە بەتەمەندا چووبوو گوتی: ئەو غەرەبەردە[1] دەبینن لەسەر ئەو گردە ڕووتەنە؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی چیرۆکی ئەو داستانەتان بۆ دەگێڕمەوە کە حسێنی حەمەد ئاغای مێرگەسۆری لێرە تانکەکانی حکومەتی بەغدا و جاشەکانی زێباری شەهیدیان کرد. منیش هەموو گیانم ببوو بە گوێ بۆ ئەرشیفکردنی ئەو چیرۆکە. ئەو پیاوە پیرە بارزانیە، لە سەر بەردێک هەڵکورمابوو، وەک پیرەهەڵۆیەک لۆچ و کوریشکی پڕزووی دەوری چاوی، ئازاری ڕۆژگارێکی زۆر مەلعوونیان لە گنجەکانیاندا حەشار دابوو! چاوەکانی هێندەیان ئەشکی سوور هەڵڕشتبوو، بەحاڵ لە بنەبانی قەپێلکەچاوی وەک ئەلماس دەتروسکایەوە. زەمەن ئاسەواری نەهامەتیەکانی خۆی لەسەر ڕوخساری جێهێشتبوو. قەڵشەکانی لەپی دەستی، گەواهیدەر بوون بۆ پەیداکردنی نانی حەلال بۆ منداڵەکانی. ئەو مندالانەی لە وەیشوومەی ڕەشی ئەنفال فاشیستەکانی بەعس، لەگەڵ خۆیان لوولیاندان بۆ هەتا هەتایە نەیدیتنەوە! تەتەڵەی لێوەکانی چیرۆکی زەمەنێکی یەکجار دووریان بۆ دەگێڕاینەوە. شەتوگێربوونی باڵەکانی، شایەتی ئەوەیان دەدا وەک هەڵۆ و شمقار بۆ ترۆپکی دوندە بەرزەکان زۆری خۆ هەڵکوتابوو. دیاربوو دەیویست چیرۆکی فیداکاری مێرخاسێکی کورد بۆ ئێمەی گەنج بگێڕێتەوە. نێوەنێوەش سەرنجی دەوروبەری خۆی دەدا بۆ دڵنیابوون لە گوێگرتنی ئێمە. بەردەوام بوو لە گێڕانەوە، بە دەم پێچانەوەی سیغارێک بە دەستە لەرزۆکەکانی، لەگەڵ یەکەم هەڵمژینی دوکەڵی سیغارەکەی وەک مارمژ[2]، بەڵام هەرچەندی چاوەڕوان بووم دووکەڵەکە لە سیەکانی

---

١- غەرەبەرد: کەڵەکەبەرد، چیلەبەرد.

٢- مارمژ: کەسێک کە ژەهری شوێنی مار پێوەدان دەمژێ، بەمەبەستی ڕاکێشانی ژەهرەکە و

نەهاتە دەرەوەو لەوێ پەنگی خواردەوە. ئاخێک لەگەڵ پاشماوەی دوکەڵەکە لە ناخیدا هاتە دەرەوەو گوتی: ئای کوڕینە ئەگەر وەک من دەتانزانی حسینی حەمەدئاغای مێرگەسۆری چ مێرخاسێک بوو! کاتێک شێخ ئەحمەد بارزانی بە حسینی حەمەد ئاغای دەڵێ: لەگەڵ مەلا مستەفای برۆنە پێش ئەو هێزەی حکومەت و جاشە زێبارییەکان، ڕێگەیان نەدەن بگەنە بارزان و بیسووتێنن. حسین دەڵێ: ئەزبەنی! ئەگەر دوکەڵ لە بارزان هەستا و سووتێندرا، جەنابت دڵنیابە حسینی حەمەداغای لە ژیاندا نەماوە!

گوتی، کاتێک تانکەکانی حکومەتی بەغدا گەیشتنە ڕێزان، بۆ سەنگەر دابەشکردن و دامەزران، مەلا مستەفای بارزانی لە بێداروون دادەمەزرێ و بە حسێنی حەمەد ئاغاشی گوتبوو: حسێن تۆ لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵتن، لە ملێ ساریجێ[1] دامەزرێن پێش لە تانکەکان بگرن نەگەنە نێو بارزان. حسێن دادەمەزرێو ئەژنۆی خۆی دەبەستێ، هاوڕێکانی پێیدەڵێن: کاک حسێن لەو گردە ڕووتەنەی کوا بە تفەنگی برنۆ شەڕی ئەو تانکانە دەکرێو پێشیان پێدەگیرێ پێشڕەوی نەکەن؟ شاخێک لێرە نییە بەرگری لە پەنایدا بکەین! حسێنی دەڵێ: من باش دەزانم بارزانی منی بۆ دوو چارەنوس لێرە داناوە، ئەگەرنا هێندە نەشارەزا نییە لە ڕووی سەربازی نەزانێ لێرە شەڕی تانک بە برنۆ ناکرێ، یەکەمیان ئەگەر سەنگەرەکەم چۆڵکرد، لە مەجلیسان بە چاومدا بداتەوە بڵێ تۆ هەڵاتی، ئەگەر سەنگەرت بەرنەدابوایە تانکەکان نەدەگەیشتنە بارزان، ئەوەش بۆ من هەموو ڕۆژێک مردنێکە! دووەمیان ئەگەر ڕانەکەمو سەنگەر بەرنەدەم، تانکەکان بەسەرم دەکەون و دەمکوژن. بەڵام من بۆیە ئەژنۆی خۆم بەستووە،

---

ڕزگارکردنی مارپێوەدراو لە مردن.

[1]- ملێ ساریجێ: ملەی ساریجێ. کلکەی ساریجێ.

ڕێگای دووەم هەڵدەبژێرم، مردنم زۆر لا شەرافەتمەندانەترە لەوەی سەرم لەبەرخۆم بنێم لە مەجلیسان و بە چاومدا بدرێتەوە، وە خۆشم بەڵێنم بە شێخ ئەحمەد داوە ڕێگری بکەم لە سووتاندنی بارزان.

پیاوە بەتەمەنەکە بەردەوام بوو لەو گێرانەوەیەو بە هەناسەیەکی ساردەوە گوتی: ئەو بەردانەی بەخوێنی خۆی سوورکردو تانکەکان گەیشتنەسەری.

بەڕاستی چیرۆکی شەهیدبوونی حوسێنی حەمەد ئاغای مێرگەسۆرێم وا بە وردیو بەڕێوجێ، نەدەزانی. گوتم ئای خودایە کورد مرۆڤی چەند بەوەج و مێرخاسو مەزنی هەبووە، ئامادەبووە خۆی بداتە کوشتن نەک لە پاشان باسی بەترسنۆک بکرێ. خەمبارم کە ئەو هەموو داستانە لێوانلێو لە شانازییە کەسێک نایاننوسێتەوەو خاوەنداریتیان لێ ناکات!

## یەکسانی

پایزی ١٩٨٤

یادی ئەو ڕۆژانە ئەرکەکان بە ئەندازەی بەرپرسیاریەتیەکان بوون، بەخێر... لەوان ڕۆژان، باری گران لە سەرپشتی بەرپرسان بوو. کاتێک شێخ محەمەد خالید بارزانی و پارتی، پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی و سۆشیالستیان، بە بیانووی ئەوەی ناوچەی بارزان، شوێنێکی پیرۆزەو نابێت پێشمەرگەی تێدا بژیێت، شاخبەدەر کرد، بەناچاری خەریکی بارەگا دروستکردن بووین لە (گەلی خەڵک) گوندی کافێ ناوچەی زێبارەتی. سێ وەستامان هەبوون، شەهید بلە، خوا لێخۆشبوو هاوڕێ مچە، هاوڕێ جەنگی. ئەوان، فەرماندەو بڕیاردەر بوون بۆ ئەرکدارکردنی هەمووان لە کاتی خۆڵەبانکردنی

چێشتخانەی بارەگای کەرتی هەولێر. وەستا جەنگی دەستوور دەدات خۆڵەکە لەکوێ ڕۆبکەن، محسین یاسین بەرپرسی بەتالیۆن، بە گونیە و بە پشتی خۆی خۆڵەکە دەکێشێ. ئەوێ ڕۆژێ، دەبێ چ ئەوینێکی ئەزەلی و ئامانجێکی گەورەو پیرۆز، عەرەبێکی باشووری و مەسیحیەکی عەنکاوەو، ڕووستاییەک و، دوو هەولێری لەسەر ئەوبانە سێ بە چوارە کۆی کردبنەوە لەو گەلیە تەنگەبەرە؟!

دەمەوێت مونعیمتان پێ بناسێنم، ئەو پیاوە ڕەشئەسمەرە باڵابەرزەی شانبەشانی شەهید سەعدوون دەیانویست گاتا و سرودی (**هل وطن شركة لاكراد والعرب**) فێری منداڵانی کورد بکەن، هاتبوون داری بەڕوو و داری خورما لە یەکتر مووتوربە بکەن، هاتبوون بەردی تخوبەکان وردوخاش بکەن، هاتبوون ئەو شوناسنامانەی مەزهەبیان لەسەر نووسرابوو دڕ دڕ بکەن. ئەو سەردەمانە، هیوا گەش بوو، لە ناخمدا پەڵەی دابوو، ڕوح و جەستەم لەنێو کۆڕی ڕەفیقانا لە زیکردابوو. لە تاریکایی شەوێکی ئەنگوستەچاودا، تۆ هەڵهاتی. من ئەو چەپەم، گەنجیی خۆم کردە قوربانی چرۆیەکت، چیبکەم ئێستا ئەو چەترە نیت خۆم لە سایەت ببینمەوە! بە یادی سەدەی ڕابردوو لەگەڵتدا تێهەڵبچمەوە، چیتر تۆ ئەو سەبەتە نیت هێلکەی خۆمت تێدا دانێم تا دەترووکێن، ئەوەی ڕۆژێک موریدی تەریقەتت بوو ئێستاش لە خۆم خۆشتر دەوێن، ئێستا تۆ وەک دوکاندارێکی بێ کڕیار، دۆش داماوی، دەمت لە ڕابردوو ناوە وەک مێشهەنگوین دەیخۆیتەوە، ئاخۆ چەندانی وەک من نیگای چاوی بێ سۆمایان بڕیوەتە دەم و فڵچی کاوێژکارو وتەگێڕو باوەڕ شۆڕت، کە بوونە پینەچی و ئاوقات، بۆ مافیاو دزەکانی دەستەڵات. ئێستا، وەکو بەرێ برم پێت ناشکێ، ئێستا هەر ئەوەندەم لەدەست دێ، سەری کاسی سەرسوڕمانم بلەقێنم! باوەڕ بە چاوانم ناکەم، گوێم هیچ

تەڵقینێک نابیستێ. گەر دەمزانی گوێیەکانم ئەو نەغمەیەت لێدەبیستێ، مسرێژم دەکردن، گەر دەمزانی بەو چاوانەم ڕۆژگاری ئێستا دەبینم، بێ دوودڵی، هەردووکیانم دەردەهێنا!

## سەراوبن

ساڵی ١٩٨٥، بارەگامان لە (گەلی خەڵک) ناوچەی کافێی بناری گارە بوو. لوتکەکانی گارە و مەتین، تازە سەرپۆشی زیوینیان پۆشیبوو. سیرەی هەڵۆکانی لوتکەی گارە، هۆشداری وەرزی سەرمایان بە بێچوەکانیان دەدا. هەناسەی ئاوی سەربوورکێ، هەڵمی لێهەڵدەستا، دەستی ڕێگایەکی دووری گرتبوو، بێ هەدادان ملی نابوو بە (گەلی نێ)، شانی لە شانی (چەمشریت) و (چەمی چاڵێ) بەسوو، خۆی لە دامێنی چیای گارە وەردەسوڕاند، بەرلەوەی لەگەڵ شەپۆلەکانی ئاوی غازری ئاوێزانی یەکتر بن، وەکو ئەسپێکی سەرکەش هەڵدەستایەوە سەرپاشوو، بە حیلەیەک بوونی پێشمەرگەی لەو سەرەوە بە چیای مەقلوبی شێخان ڕادەگەیاند. دوکەڵی لوولە سۆپاکان، ئاسمانی گوندی کافێ و بیرکەکۆریان شین شین هەڵگێڕابوو. بۆنی سووتانی دارەبەن و داربەڕوو لەو دۆڵە داوێستابوو، ئومێدی ئاگرو دووی بە سەرمابوو و کەسیرەکان دەبەخشی. ژێر ساپیتە و نوای بارەگامان پڕ لە داری قەڵاشکەری کردبوو. وەک ئەندامانی یەک خێزان، لە یەک هۆڵی گەورە لە کاتی ڕاکشان بۆ خەوتن، وەک جگەرەی پاکەت فلتەرەکانمان لە یەک لایە. لە پێکهاتەی ئەو خێزانە، کورد، عەرەب، تورکمان، مەسیحی، ئێزیدی جێگایان گرتبوو. تاکو کاتی خەوتن بە گۆرانی هاوڕێ هەژار ڕۆستی و ئەبو میلاد و دلاوەر لە لایەک و، بەزمی هاوڕێ خەیری و فەهد پۆلا لەلایەکی دیکە، بەسەردەبرد. ئێمە

بێئاگا لەوەی تەنها بەشی ئێمە پاراستنی نیشتیمانە، وەک (مەحموود دەروێش) دەڵێ: نیشتیمان بۆ دەوڵەمەندەکان، نیشتیمانپەروەری بۆ هەژاران!

هۆڵەکە زۆر درێژ و پان بوو، دوو ڕیز پێشمەرگە، هەر ڕیزەی سەرمان بە لای دیوار دەکرد، پێیینگانمان لە لای یەکتر بوو. هاوڕێ هاواری برام لە تەنیشت من خەوتبوو، دوای نیوەی شەو بوو، زۆر بە تەنگاوی بانگی کردم: هەستە! منیش گوتم: پاسەوانی خۆم سەر لە ئێوارێ گرتووە! گوتی: بۆ پاسەوانیم نییە، سەیری خۆت بکە سەراوبن خەوتووی، پێت هێناوەتە لای سەری هاوڕێیان! هەستام کە سەیرم کرد تەنها هاوار لەگەڵ گەوزداندا سووڕاوە، ئێمە هەموو سەرمان لە لای دیوارەکەیە. منیش بانگی هاوڕێیانم کرد گوتم هەستن! هاوڕێیان گوتیان چی قەوماوە!؟ گوتم: شەرعی بەینی من و هاوڕێ هاواری بکەن، ئەو بەمن دەڵێ سەراوبن نوستووی، کەچی خۆی سەراوبنە! بەو نیوەشەوە بوو بەپێکەنین، هاوار لە هەموان زیاتر پێدەکەنی.

ئەو بابەتەم بۆیە وەبیرهاتەوە، هەر حیزبێکی باشووری وڵات، کە دێتە گۆ، دەڵێ هەموو حیزبەکانی دیکە سەراوبن سیاسەت دەکەن، تەنها حیزبی ئێمە نەبێت!

## پۆلا ڕواندزی

پێشمەرگەیەکی نابیست و لاڵ، بەلام زیرەک، چاپوک، هەستیار، بەئاگا زۆر لێزانانە بە زمانی جەستەو ئاماژە، هەندی بلێی یەکو دوو، بەرامبەرەکەی حالی دەکرد، بارودۆخی سیاسی شرۆڤە دەکرد و ڕای خۆی دەردەبڕی. بارەگا بۆ هەر شوێنێک بگوازرابوایەوە، پۆلا تەندوری دادەمەزراند بۆ نانکردن. کەم پێشمەرگە هەبووە نانی گەرمی دەستی پۆلای نەخواردبێت، بەلام هەرگیز وەک ئەو بەرپرسانەی ئێستا ئامادە نەبوو یەک نانی زیادە لەسەر بەشی یەکی دیکە، بدات بە پێشمەرگەیەک!

لێم دەپرسی: هاوڕێ تۆ چۆن بووی بە پێشمەرگەی حیزبی شیوعی؟ بە ئاماژە و زمانی جەستە یا بە نووسین لەسەر زەوی، دەیگوت: لە کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکان، دەچوومە بارەگای پێشمەرگەکانی پارتی،

زۆربەیان گاڵتەیان پێدەکردم دەیانگوت: مینەکەڕ هات. کە دەچوومە بارەگای بەرسرین و حافیزی حیزبی شیوعی، دەیانگوت: بچۆ حەمام گەرمە خۆت بشۆ، فرچەی ددان و تیغ و سابوونیان دەدامێ، لەگەڵ خۆیان نانیان دەدامێ، کەس بۆی نەبوو بە مینەکەڕ بانگم بکات، بۆیە بووم بە پێشمەرگەی ئەو حیزبە و ناویاننام فەهد پۆلا، منیش لەوساوە نانی گەرم بۆ پێشمەرگە دەکەم، مینەکەڕیان لە یەخەی کردمەوە کە زۆر پێی دڵتەنگ دەبووم.

پۆلا، زۆر کاریگەری شەهید خدر حوسێن ڕواندزی لەسەر بوو، کاتێک دەستی چەپی بەرزدەکردەوە و دەیلەرزاند بۆ ئەوەی سەعاتە بە زنجیرەکەی بێنێتە سەرەوەی باسکی، ئەوە هێمای خدر حوسێن بوو. مەلەوانێکی لە زەبر بوو. لە ڕێزان و بارزان چوین بۆ (گەلی

سولێ) نارنجۆکی دەنگیمان بۆ ڕاوەماسی خستە ڕووباری، دنیا ساردبوو، ماسی سەرئاو نەدەکەوت، پۆلا خۆی فجوق دەکردە نێو ئاوەکە، لە بنی ئاوەکە لە قولایی سێ مەتر، سێ ماسی دەردەهێنا، ماسیەک بەددانی دوو ماسیش بە دەستەکانی، بۆ ئێمەی هەڵدەدا دەرەوە. ئێستاش لەبەرچاومە سەری ڕادەوەشاند بۆ ئەوەی ئاوی لە قژ و دەموچاوی بتەکێنێ.

لە بارەگای گەلی خەلک لە کافێ، شەوان کاتێک چرامان نزم دەکرد بۆ خەوتن، من و هاوڕێ خەیری بە هاوڕێیانمان دەگوت: هەمووتان لەژێر پەتۆکانتان هەستنە سەرپێ و ڕەختەکانتان ببەستن و تفەنگ بە دەستەوە ڕاکەن بۆ دەرەوە،٠ بزانین پۆلا چی دەکات و، دەست دەکاتەوە؟ بەلام پۆلا هێندە زرنگ و وشیاربوو، تەنها ئەو لە شوێنی خۆی نەدەجوولا و گوپی پڕ با دەکرد و پەنجەکانی لێدەدا، بە ئاماژەی یانی درۆ دەکەن! ئەگەر دوو کەس باسی ئەویان بکردبوایە، پەنجەی بۆ هەردولا دەجولاند، دەیگوت مارە!

لە ئاهەنگی جەژنی نەورۆز و یەکی ئایار و بۆنە نیشتیمانیەکان، پۆلا قسە و پێهەڵدان و هوتافی تایبەت بە خۆی هەبوو، کاتێک دڵسۆزی بۆ نیشتیمان لە دەروونی بەکوڵ دەهات، هەڵدەستا بە زمانی جەستە و ئاماژە ڕای خۆی دەردەبڕی، بانگی یەکریزی و تەبایی و یەکگرتنی بۆ هەمو پارتە سیاسیەکان دەکرد. لە زۆر کەسی زماندرێژ و هیچ لە باردانەبوو، باشتر هەمومانی حاڵی دەکرد٠: بە ئاماژە دەستی بۆ خەنجەری بەرپشتێنی دەبرد، ئەوە هێمای مەلا مستەفاو پارتی بوو. بە ئاماژەی دوو پەنجەی، چاویلکەڕاست کردن، ئەوە هێمای مام جەلال و یەکیەتی بوو. ئاماژەی پەنجەی بۆ ماسولوکەی قۆڵی وەک دەرزی لێدان، ئەوە هێمای دکتۆر مەحموودو سۆسیالیست بوو. ئاماژەی گرتنی ڕیش و چەناگەی، ئەوە هێمای لینین و حیزبی

شیوعی بوو. بەو دواییە پارتێكی دیشی بۆ زیاد بوو، ئاماژەی سڕینی ئارەقەی نێوچاوانی هێمای زەحمەتكێشان بوو.

هەردوک دەستی لەنێو یەكتر دەگوشی و بەرزی دەكردەوە، وەک تكایەک لەوانەی سەرەوە بۆ یەككرتن و برایەتی. بەڵام دیاربوو ئەو فریادە خنكێندراو و نییەتە بسمیلكراوەی پۆلا، لەگەڵ ئاواتەكانی نەهاتە دی. حیزبەكانی باشوور، كەمئەندام و كەڕ و لاڵ بوون. گوێیان لەو داخوازیەی پۆلا نەگرت. بۆ تاقە جارێک دەنگی نەگەیشتە سەركردە كەڕولاڵەكانی پاوانخوازی و خۆنەبوون و یەكتر كرۆشتن. هەروەک چۆن جوانی و تەمەنی گەنجی، كرد بە داری قەلاشكەری، بۆ سووركردنەوەی تەندووری بارەگاكانی پێشمەرگە. ئەو ئاوات و داواكاریەشی بۆ یەككرتن، بێ بەزەییانە لە نێو ئاوردانی براكوژی و دووبەرەكیدا كرا بە قەرەبرووت.

پۆلا شەهید نەبوو، بەڵام بەداخەوە ئێستا باری تەندروستیی ناجێگیرە!.

## زریکەی هەواڵێک کە نانوسرێتەوە

شەهید عەلی حاجی نادر... شەهیدبوونت ناخی ئەنجن ئەنجن کردم، بیرەوەریت گۆڕەشاری ڕوحم دەدات. من دەزانم یادو ناوت بە قەڵەم و لەسەر دووتوێی پەڕەی کاغەز قەت نانوسرێ، دەبێ پیتەکانی ناوت، لە ئاڵتوون و بڕۆنز دابڕێژرێ!

نازانم چی بنووسم لایق بە کەسایەتیی بەوەج و بە هەیبەت و بەسامت بێ، شایانی دەستوتفەنگ و ڕاماڵی پڵنگئاسات بێ!

ناتوانم من لەیادتکەم، تا ئەو ڕۆژەی نێوچەوانم لە بەردی ئەلحەدم نەدەم!

یادەکانت تیشکی خۆرن من ناتوانم تیرێژ تیرێژ بیگێڕمەوە، چونکە هەموو بەندی لەشم وەکو بەفر لەبەردەمتدا دڵۆپ دڵۆپ دەتوێنەوە.

یەکەمڕۆژی بەرەنگاری و یاخیبوونت، لە چوارقوڕنە، لەو کاتەبوو کابووس و دێوەزمەی بەعس باڵی ڕەشی بەسەر وڵاتدا کێشابوو.

عەیامێکە نوزەی کزەبایەکی سپێدە لە هیچ لایەکەوە نایە، هەوری ڕەشی بێئومێدی زگی بە ئەرزەوە نایەوە، کتێبی قوتابخانەکان، بازاڕ، مزگەوت، دیواری قاوەخانەکان، لە خمخانەو ڕەنگی ڕەشی بە بەعسیبوون هەڵکێشرایە!

ساڵ ساڵی ٧٨ بوو، بە چواردەخۆری بەرپشتت، زەندەق و نەترەی پیاوانی بەعست دەبرد!

لەسەر دەستی جوتیارێکی زەحمەتکێشدا، شکۆی بەعسیەکان شکا، کە شەو داهات، شریقەی تفەنگی بڕنۆ بانگەوازی بەرەنگاری بەگوێی خەڵکی شاردا دەدا.

لەو شەوەوە ئومێد لە ناخی هەژاران چرۆ دەکا. ئێوە زەینێ خۆ بدەنێ، کورد مرۆڤی چەند مەردی هەیە!

لەبیرمە هاوینی ١٩٨٣ لە شەڕی خۆبەخۆ، لە کونەکۆتری قەندیل، کاتێک (شەهید نازمی حەمەی سلێمان)ی یەکێتی، بە هاوڕێ شاخەوان حەساری دەڵێت: جیهازی بێتەل بدە عەلی حاجی، با قسەی لەگەڵ بکەم! هاوڕێ شاخەوان پێیدەڵێ: نایدەمە هاوڕێ عەلی، چونکە دوێنێ پێشمەرگەیەکتان جنێوی بە هاوڕێ عەلی دا. نازمی حەمەی سلێمان دەڵێ: ڕاستە ئێمە لەبەرامبەر یەکتردا شەڕ دەکەین، بەڵام هەر کەسێک قسەی نالایەق بە هاوڕێ عەلی حاجی بڵێت، هێشتا لە دایکی خۆی نەبووە، گەر بزانم کێیە، بۆ حەوت پشتی تەمبێی دەکەم!

بەداخەوە نازمی حەمەی سلێمان لە شەڕی قەندیل شەهید بوو.

تەماشا کەن سەرکردەکان، چەند پیاوی بەوەج و مەردی وەک عەلی حاجی نادرو نازمی حەمەی سلێمانیان کردە قوربانی بیری تەسکی پاوانخوازیی خۆیان!

هاوڕێ مەحموود حاجی گوتەنی یادی بەخێر، بەسەری تۆ کا عەلی، قەت جارێکم لێنەبیستی بڵێی بڕۆن منیش وا دێم، هەمیشە دەتگوت وەرنەدوام! لەبیرمە ئێوارە بوو، هەندێک ناپاک، لەو چەقەڵە شاخەی بەرامبەری ڕێزان، تەقەیان لە چەند پێشمەرگەیەک کرد، وەک شێر لە بێشەی ڕاپسکێ، خۆت بە ئاوی ساردی زێیەکە دادا، گوتت: وەرنەدوام، ئێرە بڕە، ناهێڵم کەستان بخنکێت، زوو بگەینە گوندی ئاڵکان بەڵکو لەوێ بیانگرین!

چ شانازیەکی گەورە بوو، پێم لەجێی پێی تۆ دادەنا! کێ وەک منی بۆ دەڕەخسێت، قەڵغان و زرێی پۆڵایین لە پێشی بێت، شوێن پێکانت هێزی بالاکردنم بوو! تاسەت دەکەم، چەند تامەزرۆی دیدارتم شەهیدەکەم!

١٩٨٣/١١/٢٨... ئێرە گوندی هەنارەیە، جێی تۆماری داستانێکی کەموێنەیە، لەسەردەستی ٦٠ پێشمەرگە، بەڵێن بەسەرکردە دەدەن، تا

کۆتایی، یاری بەپۆلووی ئاگری مەرگ بکەن!

سەرکردەبوون بەهرەیە، پێشەنگایەتیکردن هونەرە. خاڵەکانی بوون بەسەرۆک لە کاک عەلیدا لە لوتکەدایە. لەگەڵ یەکەم دەستڕێژی بیکەیسی، بێدەنگی ئەو سپێدەیەی گوندی (هەنارە) دەقەڵێشێ. هاوڕێ عەلی، لە بڵیندگۆی مزگەوت بانگ لە پێشمەرگەکان دەکات: قوربانتان بم، باش دامەزرێن، بیانکوژن!

کاتێک شەڕ گەرم دەبێت، هەزاران جاش و سەربازو دەیان تانک و تۆپ و ۱۳ هەلیکۆپتەرو چەند فڕۆکەی پیلاتۆز، ئەو گوندە بۆردوومان دەکەن و دایدەبێژن. هاوڕێ عەلی داوا لە خەڵکی گوند دەکا، بۆ سەلامەتی خۆتان گوندەکە چۆڵ بکەن، ئێمە ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو هێزە نابەرابەرە یەکلایی دەکەینەوە. داوا لە جاش و سەربازەکان دەکات، خۆتان بەدەستەوە بدەن، سەنگەری خیانەت جێبهێڵن. دەبێ ئەمڕۆ لەو مەیدانە بیسەلمێنین کێیە بەرخ و، کێ بەرانە!

لەوساتە وەختە هەستیارە، بە محەمەد ئەبوشوارب دەڵێ: بڕۆ دوو سێ حەیرانی سەرچیایی بەسەر پیرەهەولێرا شۆڕکەوە!

ئەو داستانە کەموێنەیە، بەخوێنی ئاڵی پێشمەرگەیەکی بە ڕەگەز عەرەبی شاری بەسڕا، بە ناوی شەهید ئەبو شوهدی و ۱۱ بریندار، تۆمار دەکرێ.

پێشمەرگە کەڵک لە تاریکایی شەو وەردەگرن، هەروەک حسن زیرەک دەڵێت: شەو قەلای مێردانە شەو. ۱۱ بریندارەکە بەو گوێدێژانەی گوند دەگوێزرێنەوە. دڕ بەهێزی دووژمن دەدەن، بەرەو دەشتی کۆیە دەرباز دەبن.

بە هەلی دەزانم لێرەوە دڵگرانی خۆم نیشان دەم، کە بە بێچووی ئەو گوێدرێژانەی بریندارەکانیان گواستۆتەوە، بگوترێت جاش!

بۆیە نابێ ئەو ناوە بەڕەوا ببیندرێت بۆ خاین و خۆفرۆشان!

بەداخەوە، ١٩٨٦/٦/٢٧ هەواڵێک کە نانووسرێتەوە، زریکەی هێند بە ئازار بوو، دوای ٣٤ ساڵ ئازارێکەو هێشتا لە گوێمدا دەزرینگێتەوە،
لە گۆڕەشێر گۆڕی شێران،
شەهیبوو دەستقەڵشیووەکەی، چینی جوتیارو ڕەنجدەران،
گلا مەردو سوارچاکی کورد!

## نەخۆشیی هەڵمەت و دکتۆرە ساهیرە

ئەوڕۆژانەی خەباتی پێشمەرگە سادەو ساکارەکان، کتومت لە لە جەوهەر و جوانیی بەفر و هەتاو و تیریژی ڕوناکی کڵاوڕۆژنە و گوڵەگەنمی قەندەهاری دەچوو، دەستی ڕەشی پیسخۆران مێژووی ئالوودە نەکردبووین، تۆفان و گەردەلوولی بەعس، لە تەعریب و تەبعیس و تەهجیر لوولی دابووین بەرەو شاخ، بەرەو گەڕان بەدوای ئاسۆی سپێدەیەکی ڕەنگ شەفەقی.

هاوینی ١٩٨٦، بارەگامان لە ناوچەی کافیی بەری گارەی بوو. کەرتی هەولێر لە گەلی خەڵک بوو. بەهۆی ئەوەی هەموو خزمەکانمان بێزار کردبوو لە هەولێر، هێندەی خێزانەکانمان ڕەوانەی لای ئەوان بکەین، سەرەڕای مەترسی گرتن لەسەریان لە لایەن ڕژێم، بە تۆمەتی داڵدەدانی خێزانی پێشمەرگە، بڕیارماندا هاوینەکەی لە ژێر کەپر ژیان دەکرێ، بۆ ماوەیەک خێزانەکانمان بێن لە نزیک بارەگاکان کەپر دروست بکەین، حاڵیان حاڵی پێشمەرگە!٠ قەدەرێک بوو منداڵەکانم هاتبوون، پەتایەک بڵاوببویەوە، منداڵانی یەکساڵی هەتاوەکو سێساڵی دەیانگرت، زۆریشیان پێی دەمردن. چەند ڕۆژێک بوو هەڵمەتی کوڕم دووچاری ئەو پەتایە هاتبوو، ڕۆژ بە ڕۆژ تەندروستی خراپتر دەبوو. (نایلە)ی خێزانم گوتی: حازم ئەگەر

چارەسەرێکی ئەو کوڕەی نەکەین، وەک جیهانگیری کورم، چۆن لە (کڵێسە[1])ی بەودەستانەم شاردەوە، ئەو کوڕەش ئاوا دەشارمەوە! هەرچەند سەیری نایلەم دەکرد، فرمێسکەکانی لە من دەشاردەوە، نەبادا کاریگەریی لەسەر ورە و خۆڕاگریم دابنێ، یاخود من بە هۆکاری ئەو ژیانە ناهەموارە دابنێ. پاشنیوەڕۆ گوتیان دکتۆر چۆتە ئەو بارەگا کاتییەی، سەر (چیای گرێێ) بەرامبەر ئامێدی. تفەنگەکەم دایە نایلەی، هەڵمەتم لەپشتێ کرد، ملمان بە ڕێگاوەنا. لێ تایەکەی هێندە گەرم بوو، وەک سۆپای پڕ لە پشکۆم بەپشتێوە بێت! جارجار نایلە تفەنگەکەی دەدایەوە من، هەڵمەتی لە پشتێ دەکرد. بەهۆی گەرمیی لەشیەوە، هیچمان نەماندەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر لە پشتێی بکەین. بە هەرحاڵ، بە شاخیدا هەڵزناین گەیشتینە بارەگا. لە سێبەری داربەڕوێک پشووماندا، ئاویان بۆ هێناین، هاوڕێیان دەموچاوی هەڵمەتیان شوشت، گوتیان دکتۆرە ساهیرە ئێستا چۆوە خوارێ. ئێمەش بەرەوخوار بووینەوە، هەرکە گەیشتین، کەپرێکیان بۆ ئێمە چۆڵ کرد، هاواری برام دوو منداڵەکەی دیکەی بۆ هێنایین. دکتۆرە ساهیرەو دکتۆر سادق زۆریان گرنگی پێدا. هەرچەندا دەرمانی منداڵانیان نەبوو، حەب و دەرمانی گەورانیان بۆ دەکرد بە دوو بەش. سێ ڕۆژ ماینەوە بەدیاریەوە، لێ قەت ڕۆژێک لەو ژنەی خۆم گوێم لێنەبوو، من بەهۆکاری ئەو هەموو نەهامەتییە بزانێت، یان گلەیی لە بەختی خۆی بکات، بڵێ بۆ ئێمە لە ژیانی سەردەمی خۆماندا ناژین وەک هەر کەسێکی دیکە!

ڕۆژی سێیەم هەڵمەت داوای ماستی کرد و زۆر باشتر ببوو. لەو کاتەدا بەرامبەر نیشتیمان و گەلەکەم ویژدانم ئاسودەبوو، وەلێ

---

١- کڵێسە: گوندێکە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شارۆچکەی کۆیە.

هەرچەند لە چاوانی نایلەو منداڵەکانم دەڕوانی، کە من هۆکاری ئەو ژیانە سەختەیان بووم، جگە لە سێبەری ونبووی خەتایەک، هیچ شوێنی دیکەم شک نەدەبرد خۆمی لە پەنا حەشار بدەم!

ئێمە لەو دیوی دیوارەکانی خۆشبەختی و حیکمەتەکانی ژیانێکی سەردەمیانە باروبنەمان خستبوو! ئەو یاداوەریانە سەفەرێکن بۆ بەردەرگای یاخیبوونێکی زۆر پیرۆز، تێڕامانی شوێنەواری هەردوو ئەژنۆی ڕکوعێکی پڕاوپڕ لە یەقینی سەرکەوتن!

دکتۆرە ساهیرە باوەشی وەفاداری و مرۆڤدۆستی بۆ ئاوەڵاکردین، جامی لێوڕێژی خۆشەویستی هاوڕێیانە و خۆشەویستی بۆ پیشەکەی، دەڕژاندە سەر ئازارەکانمان. لەوان سەردەمان، خەڵکانێک لێک کۆببوینەوە، هەر هەمووومان هەودای دوای تیشکی خۆر و ئاوازی حەقیقەت و فرچکی ئازادی و یەکسانی و پێکەوەژیان بووین. دکتۆرە ساهیرە، بەو سۆز و گرنگیپێدانەی، دەیویست پێمان بڵێ کاتێک ئێوە خوێنی تەڕی خۆتان دەچۆڕێننەوە نێو ئینجانەی ڕزگاریی گەلێکی ستەملێکراو، لە پێناوی ئازادی و دواڕۆژێکی گەشتر تێدەکۆشن، شایانی لەوەزیاترن ئێمە بۆتانی بکەیین!

دکتۆرە ساهیرە، ئێستا لە حاڵی حازرد کە ئەم چەند دێرە دەنووسم، لە نەخۆشخانەیەکی ستۆکهۆلمی سوید کاری دکتۆی ئەنجام دەدا.

## هۆکێ، گوندی پشیلەکان

سەرەتای مانگی ئازاری ١٩٨٦ بارەگای پێشمەرگەکانی هەولێر لە گەلی خەڵک، ناوچەی کافێ، بەری لای نزاری چیای گارەیە، ئێواران هەر زوو تاریک دادێ. خۆر خەریکە خۆی دەپێچێتەوە و ماڵئاوایی لەو گەلیە دەکات. نانی ئێوارە، بەهۆی نەبوونی چرا و ڕووناکییەوە، دەبێت بە ڕووناکی بخورێ.

پۆلێک پێشمەرگە ئاگادار دەکرێنەوە، بۆ بەیانی بە ئەرکێکی پارێزوانی لە ئەندامێکی لیژنەی مەرکەزی و بەرپرسی هەموو پێشمەرگەی دەشتی هەولێر بە ناوی هاورێ ئەبوسیروان و، بەرپرسی پێشووی بەتالیۆنی پێنج هاورێ کانەبی گەورە و ملازم ڕابەر، بۆ ڕۆیشتن بەرەو بارەگای بەتالیۆنی ٣١ی ئازار لە گوندی ئیروان. ئەو ڕێرۆیشتنە دەبوایە دوازدە گوند تێپەڕێنی، کە زۆربەیان چۆڵ کرابوون.

هاورێ ئەبوسیروان جیا لە هەر بەرپرسێکی سەربازی، نەیدەویست ڕۆلی هیچ کەس پشتگوێ بخات، بۆیە هەر ئێوارەکەی گوتی: هاورێ حازم دەبێت تۆ بەرپرسیاریەتی خواردن و پشوودان و جووڵەکردنی ئەو مەفرەزە بگریە ئەستۆ، کارت بە من و کانەبی و ڕابەر نەبێ و ئەو ڕێرۆیشتنە چۆن ڕێکدەخەی، ئازادی! گوتم! بە چاوان!

نان و چەند قوتوو گۆشت و شەکر و چام لە حاجی دەهام وەرگرت کە ئیدارەمان بوو، کە بەشی دوو ژەم بکات، لە ئێسترەکەی بارەگا پێداویستیەکانم بارکرد. تازە گزەنگی خۆر لوتکەی چیای گارەی ڕادەمووسی و لێوی گەرمی دەخستە سەر ڕەوەزەکان.

بەرێ کەوتین. بە داخەوە بە هۆی ئەوەی سی و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا بوو، ناوی پێشمەرگەکان لە شێروانی برازای ئەبو سیروان

زیاتر کەسم لە یاد نەماوە، بەڵام لە دە کەس زیاتر بووین.

لە گوندی بانێ شۆربووینەوە بۆ گەلی پڵینگان، لەوێ دانیشتین پشوویەک بدەین، ملازم ڕابەر وەک پیشەی هەمیشەیی، بە زەردەخەنەوە متارە ئاوەکەی دەرهێنا و بەرلەوەی خۆی بیخواتەوە فەرمووی لە هەموان کرد. من خوشەویستیی شەهید مەحموودیشم بە ملازم ڕابەری برای بەخشیبوو. شەهید مەحموود چەند ساڵ پێش، لە تەنیشتم شەهید ببوو!

بریارمان دا بۆ فراوین خواردن بچینە گوندی هۆکێ کە چۆڵ کرابوو. چەند ڕۆژێک بەر لە ئێمە دەستەیەک لە پێشمەرگەکانمان کە هاوار و شەهید هەژار و چەند پێشمەرگەیەکی دیکە بوون، چووبوونە گوندی هۆکێ، بەرلەوەی بگەنە نێو گوندی، حەشاماتێک لە پشیلە بە پیریانەوە چووبوون، هاوار و هەژاریش لە گوندی نانیان لەنێو چەند کەندوویەکدا دۆزیبۆوەو بۆ پشیلەکانیان ڕۆکردبوو. دەمێک بوو هەواڵگیری سەربازی سوپای عیراق بە چاوساغی سەرۆکجاشەکانی ناوچەکە دەیانەویست پەیوەندی مرۆڤی کورد بە خاکەوە بپچرێنن، بۆ ئەوەی شوناسی خۆی ون بکات!

دوژمنان باش دەزانن هەر گەلێک لەسەر خاکی خۆی دوورخرایەوە، واتا ڕیسوا و بێ ئیرادە و لەرزۆک دەبێت. گرێدانی مرۆڤی کورد بە خاک و زمان و چاند و کولتورەوە، پایەی بە زیندوومانەوەی گەلەکەمان و هەر گەلێکە. هەروەها خاکیش، بە جاویدانی خەڵکەکەی کە لەسەری دەژی، هەناسە دەدات.

چەند هەنگاوێک ماوە بگەینە گوندی هۆکێ، لە پشیلەکان بەدەر ئەو گوندە زیرو‌حی تێدانەبوو پێشوازیمان بکات، بۆیە پشیلەکان بە ئەرکی خانەخوێیایەتی هەڵدەستان، خاوەنداری شەش دانگی گوندی هۆکێ بۆ پشیلەکان بەجێمابوو. بەدەم بەدرەقەکردنەوە سکاڵای بە تەنها

هێشتنەوەی خۆیان بۆ ئێمە دەگێڕایەوە!

دەرگاکان لەسەرپشت بوون، تەنها دەرگایەکی زۆر بە تەمەن کە بە بزماری سەرپانی جەنجەڕ دروست کرابوو، بە هۆی داخرانی سەرنجی ڕاکێشام، شمشیرەی[1] ڕاپێش کرابوو، بۆیە لەسەر سیوسیوەم[2] ترازاند و لە ڕێسمەم برد[3]، یەغدانێکی کەچە و چەپرەک، وێنەی بۆراق و شامارانی لەسەر نەخشێنرابوو .فانۆسێک بە سنگولکەیەک هەڵواسرابوو، پەرەسێلکە هێلانەی لەسەر گیزەرەکەی کردبوو، چەند جوجکەیەکی تێدابوو. تەشکەبەڕەیەکی دەستکردی ژنی کورد لە نێوەڕاستی ژورەکە ڕاخرابوو، هێندە دڵۆپەی بەسەردا چکابوو، کەڕووی هەڵێنابوو، دەستم گەیاندە چەمکێکی، گۆشەکەی بەدەستمەوە هات، دیاربوو ئاوا چنگی لە خاک دابوو گرێدراوی خاکی خۆی بوو، هەڵنەقەندرا! گوتم خۆزگە مرۆڤی کوردیش ئاوا بە خاکی خۆیەوە دەچەسپا!

هەموو هاوڕێیان ڕازی بوون بۆ خۆمان کەمێک نان بخۆین. هەرچی نانی پێمان مابوو هەمووماں دا بە پشیلەکان. کاتێک خۆمان پێچایەوە بۆ ڕۆیشتن، میاو میاوی ماڵئاوایی پیشلەکان سکاڵای دەنگێکی ناشاز بوو. هەمیشە ئەو چرکەساتە لە یادەوەریمدا زایەڵەی دێ. دەیانگوت گوناهمان چیە ئێمە پشیلەی کوردانین! بۆ کەس نیە دەستمان بە پشتی دابێنێ و بڵێ: پشەکە! ماری ڕەش چی دەکات؟[4]

---

١- شمشیرە: دارێکی تاشراو و لەلەکراوە بۆ داخستنی دەرگای بەکاردێ لە دیووی ژوورێوە.

٢- ١) بەردێکی بەدەست قووڵکراوە، ئەو دارەی دەرگای پێوە بەستراوە دەخرێتە نێوی و لە کاتی کردنەوەو داخستندا لەسەری دەسووڕێ. ٢) کونی تەنیشتی ڕاست و چەپی باگردانی بەردین کە قولاپی پەتی باگردانەکەی پێوە بەستراوە بۆ هێنان و بردن و گێڕانی باگردانەکە. لێرەدا مەبەست لە یەکەمیانە.

٣- لە ڕێسمەبردن: ترازاندنی لە شوێنی خۆی.

٤- پشەکە ماری ڕەش چی دەکات؟: جۆرێکە لە لاواندنەوە و دەستهێنان بە پشتی پشیلەدا.

کاتێک ئێوەش ئوغر دەکەن، لە حەسرەتی تەنهایی ڕوحی خۆمان، دەمرین، کێ نامەی پارانەوەمان دەباتە بارەگای یەزدان؟! وێژەوانان و هۆزانوانان! ئێوە لەکوێن؟ ڕۆمانی گوندی پیشلەکان بنووسنەوە!

## پێشمەرگە و شوێنەوار

ڕۆژێکی زستانی ساڵی ١٩٨٨، چوار هاوڕێ پێشمەرگە: مام عەلی، ئەردەلان، هاوارو خۆم، بە نیازی گەیشتن بە خۆرهەڵاتی کۆیە، لە شارێگەی بەینی تەقتەق کۆیە پەڕینەوە. مەنزڵمان لە ماڵی یەک لە جوتیارەکانی گوندی باغەجنێر، گرت، نان و تورێکی لە تێریمان خوارد.

بۆ شەوێ، گوندی بۆگدمان تێپەڕاند، لە سەر زێی بچوک بانگی کەڵەکوانمان کرد ناوی تەحسین بوو، ئێمەی بۆ (ڕەنی کانی بی) بۆلای خزمانی کلێسە و بۆڵقامیش، پەڕاندەوە.

وەک هەستی شەشەم یان لە غەیبەوە پێمان بڵێن، جارێکی دیکە ئەو خزمو کەسوکارە نابیننەوە، بەداخەوە ئەو هەستە ڕاست دەرچوو، ئەو مرۆڤە خزمدۆستانەمان کەوتنە بەرشاڵاوی ئەنفالی ڕەشی بەعسییەکان و لە بیابانەکانی خواروو گۆڕغەریب کران!

لە دوای چەند ڕۆژ خزمەتکردنمان، مۆڵەتمان لێ وەرگرتن سەردانی کاک حەمە عارف و مامزی ئامۆزامان بکەین لە سورقاوشان و دوو ئاوان. لە دوای ئەو دیدارە، مامز بە دوو منداڵەوە ئەنفال کرا. ئەو شەوە لای ئەوان ماینەوە، بەیانی گوتیان پیاسەیەکی ئەو دۆڵە بکەین کە بەرەو چەمیرێزان هەڵدەکشێ.

لە نزیک گوندی زەرزی، تاق و زنارێکی بەرز ڕووی

---

لەوکاتەدا ئەویش کلکی بادەدا، وەک پێت بڵێ کە مار ئاوا دەکات.

کەوتۆتـە خۆرهـەڵات، بـە قـەد ئـەو شـاخەوە دەرگـای ئەشـکەوتێکی دەسـتکرد دیـارە، هـەیوانێک و دوو ژور و سـتوون و کۆڵەگـەی دەسـتکرد و داتاشـراو. لـە ژوورەوە وێنـەی دوو کچـی دەسـت بەشمشێر و سککەی پارە و لۆگۆی ئاهورامزدا و دوو گۆڕی تێدایـە، وێنەی خۆرێک لە سەردەرەی دەرگاکە هەڵکەندراوە.

ئەو ئەشکەوتە، ناوە کوردییەکەی (کچ ڕفێن)ـە، بەڵام عوسمانیەکان، لەو ڕۆژگارەی کە لێرە حوکمیان کردووە، ئەو ناوەیان گۆڕیوە بۆ (قزقاپان). تورک، چونکە ڕیشاڵی مێژوویان لە ناوچەکەو لـەو خاکەدا نییە، دەیانەوێ بوونی خۆیان لـە دەستبەسەرداگرتنی شوێنەوارەکانی کورد و ئەرمەن بسەلمێنن!

بەداوای لێبووردن لە شوێنەوارناسان و پسپۆرانی ئـەو بوارە، مـن شـارەزاییم نییـە لـەو بـوارە، ئـەوە ئـەرکی پیتـۆڵ و شوێنەوارناسـانە ژیرانەو زانستیانە پشکنین و کەنەی لێبکەن.

ئەو وێنە ئازاربەخشـەی ئـەو ڕۆژە، لـە دوای ٣٣ سـاڵ لـە ڕووپـەلی ڕۆحمـدا تۆمـارە و کـاڵ نابێتـەوە! کاتێـک گەیشـتینە بەرامبـەری ئەشـکەفتەکە، یـەک لەوانـەی لەگـەڵمان هـاتبوو گـوتی: هـاوڕێ حـازم بـزانین چـۆن تفـەنگچییێکی!؟ وێنـەی ئـەو خـۆرەی لـەسـەر دەرگـای ئەشکەفتەکە هەڵکەندراوە بکە بەنیشـانە! منیش تووشـی سەرسـوڕمان و شـۆک بـووم، گـوتم: بـۆ کـەس هەیـە تفـەنگ بـە شـوێنەوارە مێژووییەکانی خۆی و تـەواوی مرۆڤایەتیـەوە بنێ!؟ یـەکیان دەیگوت: ئـەو خـۆرە، هێمـای ئاگرپەرستان و غـەیرەدینانە. یـەکی دی دەیگوت: خـۆ هـی ئیسـلام نییـە! ٠ کـە لێـی ورد بوومـەوە وێنـەی خۆرەکـە شـوێنەواری چەندەها گوللـەی پێوەبوو، تەنانـەت ئـاڕ بـی جیشـیان بـە ئەشکەفتەکەوە نابوو، هەندێک لە وێنەکان شێوێندرابوون. پێشـمەرگەو چەکداری زۆربـەی لایەنـەکان ئـەو کارەیـان دەکرد. بێئاگا لـەوەی کە

بەو کارە، نەخشەی داگیرکەران، لە سڕینەوە و شێواندنی مێژووی کەونارای گەلەکەمان، جێبەجێ دەکەین! حیزبەکانی شاخ پێشمەرگەیان وا پەروەردە نەکرد، خاوەنداری لە ژینگە و خاک و شوێنەوار و کولتوور و زمان و نەژاد و هونەر و سیمای کوردبوونمان بکەین. لەوساوە تاکو ئێستا، ئەو بێپەروەردەییە، هۆکارە بۆ ئەوەی خاکفرۆشی و دەستکێشی داگیرکەران و براکوژی بە ئاسایی وەربگرین! ئای چ ئازاربەخشە مرۆڤ ڕیشاڵی ڕەچەڵەکی مێژووی خۆی نەناسێ و گوڵلەی پێوەبنێ!

## کیمیاباران

هاوینی ١٩٨٨، باوکم ماوەیەک بوو بە دەست ئازاری ددانەکانیەوە نارەحەت بوو، بە ناچاری بڕیاریدا بچێتە ئێران بۆ کێشانی ئەو چەند ددانەی مایبوون و تاقمێکی ددان دروست بکات، ئاسۆی براشم بچێت بۆ چارەسەری گوێی، کە بەهۆی تەقینەوەی موشەکی فڕۆکە لە بارزان، پەردەی گوێی دڕابوو، لەگەڵیاندا هاواریش بۆ خزمەتی بابم و ئاگالێبوونی، چونکە باوکم نەخۆشی گورچیلەشی هەبوو زۆر جار خوێن دەمیزت. بابم بەر لە ڕۆیشتنی، بە هاوتەمەنەکانی گوت: بەیانی دەچم بۆ ئێران، چیتان پێویستە بۆتان بێنم؟

ئەگەر هەڵە نەبم و لەبیرم مابێت، هەر ئەو سەفەرە بوو، مام ڕۆستەم خەڵکی ولاتی کۆیێ بوو، داوای (بەرخەنجەر[1])ی کرد. بەرخەنجەر بەو قەڵەمبڕە، یان چەقۆیە دەگوترێ، خاوەن خەنجەری دەبانی جەوهەردار، بۆ پاراستنی خەنجەرەکەی هەڵیدەگرێ، وە بۆ

---

١- بەرخەنجەر: بەو چەقۆیە سەگوترێت، کە بۆ پاریزگاری لە خەنجەر هەڵدەگیرێت. بۆ ئەوەی خەنجەر بۆ دار و هەر کارێکی پێویست بەکارنەیەت.

دارجگـەرە و بـڕین و تاشـینی هەرشـتێک، لـە جیـاتی بـەکارهێنانی خەنجـەرەکەی. هەرچەنـدە بـابەتی بەرخەنـجەرم لە کتێبـی (پەنجـاو حەوت ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا) باسکردووە، وا لێرەش دەیگێڕمەوە: خەنجەرەکەی مام ڕۆستەم زۆر خراپ بوو هـی ئەوەی نـەبوو بەرخەنجـەری بـۆ هـەڵبگری، هەرچەنـدا بەرخەنجەرێکیشـی هەبوو، دیاربوو دڵی بە یەک بەرخەنجەر ئاوی نەدەخواردەوە، بابم گـوتی: قەڵـەمبرێکی ڕاگیـزت بـۆ دێنم هەرچەنـدا ئـەو خەنجـەرە هـی ئەوەش نییە بەرخەنجەری بۆ هەڵبگری!

لەو سەفەرە، دەبوایە پێشمەرگەیەکی برینداریش، کە بە ڕەگەز لە هاوڕێیانی عەرەب بوو بە ناوی سـەعیدەڕەش، لـە گەڵ خۆیـان بـەرن بۆ بارەگای گوێزێ و دۆڵەکۆگە. سـەعیدەڕەش لـە لقی کۆیـە بـوو، لـە کاتی ئەنجامدانی چالاکیەک لەسەر شارێگای هـەولێر کۆیـە، گوللەیـەک بـەر سـەری کـەوتبوو، لـە بارەگـای بـەتالیۆن ماوەیـەکی زۆر بـوو فریشتەی چارەسـەری پێشـمەرگە (دکتـۆر سـادق) بـە سـرنج خـواردنی دەدایێ. سەعیدەڕەش دووچاری لەبیرچونەوە ببوو، تەنها کاتی بەر لە پێشـمەرگایەتی لـەبیرمابوو کـە لـە بەسـرە لـە کۆلێژی کشـتوکاڵ بـوو. بابم و ئاسۆ و هاوار و غەریب و توانـای شـەقلاوەو سـەرکەوتەڕەش، خـەریکی خـۆ ئامـادەکردن بـوون، غـەریب و توانـا زۆر شـارەزای بـارکردنی برینـدار بـوون، دوو گونیـە کایـان کـردە بنبـار، سەعیدەڕەشیان لەسەر بارکرد، دکتۆرێکیان لەگەڵ ڕۆیشت، بەداخەوە نـازانم کـێ بـوو. کاتێـک دەگەنـە پـردی پشتئاشـان بـەرەو سـورەدێی بناری قەندیل، ئـەو پـردە لـە دار دروسـت کرابـوو بـە بـەرزایی هەشـت مەترێک، باوکم و توانا ولاخناس بوون، بە پێشـمەرگەکان دەڵێن ئـەو ولاخـە بەئاسـانی لـەو پردەی ناپەڕێتـەوە. بڕیـار دەدەن سـەعیدەڕەش دابـەزێنن بـە دەسـت بیپەڕێننـەوە. چـاوی هێسـترەکە بـە پشـتێن

دەبەستنەوە، ئاسۆ جڵەوی هێسترەکە ڕادەکێشێ، لە نێوەڕاستی پردەکە پشتێن لە چاوی هێسترەکە دەبێتەوە، هێستر دەڕەوێتەوەو خۆی هەڵدەدێرێ، لرفەو نێڵەی شەپۆلان ئاومالّی دەکات، سەری بە گابەردەکان دەکەوێ و دەتەقێ. بەناچاری وڵاخێک بەکرێ دەگرن بە ٢٥٠ دینار بۆ گوێزێ، سەعیدی لێ باردەکەن. باوکم هەموو جارێک دەیگوت چاک نەبوو سەعیدمان دابەزاند! لە گوێزێ سەعید تەسلیم بە هاوڕێیان دەکەن، تفەنگەکانیان لە بارەگا دادەنێن، بەرگەی بە ناوی سۆسیالیستیان بۆ دەکەن. بابم و ئەوانەی لە گەڵی بوون دەچن بۆ ئێران. چەند ڕۆژ دوای ئەوان سەعید دەبەن بۆ ئێران، لە خالّی پشکنینی پاسدارانی ئێران، بەرگەکانیان نیشان دەدەن، لە سەعید دەپرسن ناوت چیە؟ ئەویش ناوی ڕاستی خۆی و شاری بەسرەو کۆلێژی کشتوکاڵ و ئەندامبوونی لە حیزبی شیوعی دێنێتە زمان. یەکسەر دەیگرن بە دارەمەیت دەیبەنە زیندانی ورمێ، لەسەر زەوی فڕێیدەدەن تا گیانی لەدەست دا و لە گۆڕستانی غەریب و بێکەسان دەینێژن.

باوکم نزیکەی مانگێکی پێچوو، لە دۆڵەکۆگە لەکاتی گەڕانەوە بۆ دۆڵی بالیسان، دەبنە ٢٥ پێشمەرگە بە فەرماندەیی هاوڕێ ئەبو سەوسەن. ڕۆژی ١٩٨٨/٧/٣١، کاتێک گەیشتنە دۆڵی بالیسان، فڕۆکە جەنگیەکانی ڕژێمی بەعس، بە چەکی کیمیاوی قاسماوەو خەتێ و وەرێ و دەوروبەری بالیسانیان بۆردومان دەکرد. لەو کاتەدا ئاسۆی برام لە پێشەوەی هەموان دەبێت، بۆیە کاریگەری لە سەری کەمتر بوو، بەدوای ئاسۆی، شەماڵ و هاوار دەگەنە گوندی دەڵاش، جامانەکانیان تەڕدەکەن لە دەمو چاویان دەپێچن، ئاگرو دوکەڵێک لە گوندی دەڵاش دەبینن، هەردوکیان غاردەدەن ئاگرەکە بکوژێننەوە، کاتێک دەبینن سێ منداڵ بە دیار ئاگرەکە هەڵکورماون بەو گەرمای

هاوینە! لێیان دەپرسن ئـەو ئاگرەتـان بـۆ كردۆتـەوە؟ مندالّـەكان دەلّێن لـەبـەر كاریگـەریی كیمیـا، ئـەوانیش دەلّـێن: چـۆن دەزانـن كیمیایـە؟ منالّەكان دەلّێن: ئەوەنیە بۆنی سێوی ڕزیوی لێدێت! منالّەكان دەلّێن: داك و بابمان چووینە نێو ڕەزو كێلّگەی، خوابكات سـەلامەت بن! لـەو كاتەی ئێمە چاوەڕوانی مردنێكی بە كۆمەلّمان دەكرد، پارتی و یەكێتی و ئەو حیزبانەی پەیوەندییان لەگەلّ ئێران هـەبوو، دەرزی و دەمامك (قیناع)یان لە ئێران وەرگرتبوو بۆ خۆپاراستن و چارەسەری كیمیایی، تەنها ئێمەو هاوولاّتیان هیچمان نەبوو! ئەو پێشمەرگانەی بەركـەوتن، ماوەیـەك چاویـان نەیـدەبینی. دكتـۆر بـژاری بـرای شـەهید كۆچـەر، چارەسەری بۆ دەكردن.

## پلەبەندیی مرۆڤەكان

١٩٨٧ بارەگامان لە ئەشكەوتی دۆلّی بالیسـان‌و كانی تـەلانی چیای هەوریێ بوو، من‌و مستەفا وەستاو تالب دەرگەلّـەیی و زۆزگـو چەند پێشـمەرگەیەكی دیكـە بـووین. بـە داوای لێبووردنـەوە نـاوی هـەموانم لەیاد نەماوە ئەگەرنا زۆرم مەبەست بوو ناوی هەموان بنووسم.

ئێمە بە ئەركێك دەچووینـە لای كـەپكی حەمـەدئاغاو بـەنی هـەریێ، كاتێـك بـۆ حەسـانەوە لـە خـوار زینـەتیرێ، لـەژێر داربەڕوویـەكی گــەورەو بەتەمــەن وەك داربەڕووەكــەی كاكــە جــەلالی مەلەكشــا[1]، دانیشـتین. ئـەو كاتـە مەلّبەنـدی سـێی یـەكێتی، بارەگاكـەی لـە گونـدی خەتێ بوو، كاك كۆسرەت بەرپرسـی بوو.

تراكتۆرێـك عارەبانــەی بــەدواوە بــوو لــە زینــەتیرێ شــۆڕبۆوە، عارەبانەكەی دیاربوو باری تێدا بوو، خێوەتی بەسەردادرابوو، كاتێك

---

١- جەلالی مەلەكشا: ئەو شاعیرە پایەبەرزەیە كە لەسەر داربەڕوو شێعرێكی نایابی هەیە.

لە ئێمە نزیک بووەوە، گوتم هاوڕێ مستەفا ئەو تراکتۆرەی ڕابگرە بزانە بارەکەی چیەو بۆ کێی دەبا! ئاخر مستەفا وەستا هەر بە خانەوادە شاخەوانو تفەنگچین، زۆرجار چەند فیشەکمان بدابوایە مستەفای ئەوەندە کەوەی بۆ دێنایەوە. هەندی بڵێی یەک و دوو، گەیشتە سەر ڕێگاو تراکتۆرەکەی ڕاگرت. سەرکەوت خێوەتەکەی هەڵدایەوە، بەدەم پێکەنینەوە بانگی منی کرد: هاوڕێ حازم وەرە! کاتێک چووم سەیرم کرد هەموو بارەکەی خواردنەوە بوو. لای پێشەوەی ویسکی گرانبەهاو گرێنتسو لەو جۆرانە بوو کە خەڵکی دەوڵەمەند دەیانخواردەوە. لای دواوەی عەرەقی فەلی هەرزان بوو. لێمپرسی: ئەو مەشرووبە بۆ کوێ دەبەی؟ گوتی: بۆ مەڵبەند. گوتم: بۆ؟ دوکانی مەشرووباتیان داناوە؟ گوتی: من زۆرجاری دیکە مەشرووبم هێناوە کەس ڕاینەگرتووم، ئێوە پێشمەرگەی کێن؟ گوتم: ئێمە هەر ویستمان بزانین بارەکە چیەو لە کوێوە هاتوەو بۆ کوێ دەچێ ئەگەرنا ڕامانندەگرتی. گوتی: کاکە ئەو مەشرووبە گرانبەهایانە، ویسکیەکان، بۆ کاک کۆسرەتو ئەندامانی مەڵبەندە. عەرەقە فەلەکەش بۆ پێشمەرگانە. ناوی پیاوێکی چەکداری کوردی بەعسی هەڵدا، گوتی کاک فڵان ناردوویە. بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە، دەنا ناوەکەیم دەنووسی. ڕەنگە ئێستا بە لیوا خانەنشین بێ!

خێوەتەکەمان بۆ بەسەر مەشرووباتەکەدادایەوە، هەر بۆ پێکەنین و تەنز گوتم: کاکە سڵاو لە کاک چەکدار بکە بڵێ لەو دۆڵەی بالیسان چەند حیزبی دیکەشی تێدایە، با هەندێک تریاکو حەشیشو هێرۆینیش بۆ هەریەک لەو حیزبانەی دیکەش بنێرێ!

ئەو ڕۆژە لەبەرخۆم هەر ئەو سروودەی لە ڕادیۆی یەکیەتی ڕۆژانە گوێم لێدەبوو (گڕی هیوای ڕەنجدەرانو هەژاران)، دەمگوتەوە، دەمگوت (عەرەقی فەل بۆ پێشمەرگان، ویسکی باش بۆ

بەرپرسەکان). بەرپرسان لە ماکو بنچینەدا باوەڕیان بە یەکسانی چینایەتیو دژایەتی پلەبەندی مرۆڤەکان نەبوو، ئاخر مارکسیبوونو چەپبوون، خۆ حەبی گولاج نیە قوتی بدەی، بەڵکو دەبێت لە هەڵسوکەوتو کاری پراکتیکی ڕۆژانەت ڕەنگ بداتەوە! بۆیە لاتان سەیرنەبێت ئەو کارەکتەرانەی شاخ، ئێستا ئەو دکرەساتە[1] بە شار دەکەن.

من پێم وایە بۆ ئەو حیزبانەی لە بنەڕەتدا هەڵگری عەقڵیەتی دواکەوتووی دۆگمای خێڵەکین، ئەو جۆرە پلەبەندی و ئاغا و کرمانجیە جێگای سەرسوڕمان نیە، بەڵام بۆ سەرکردەکانی کۆمەڵە، کە خۆیان بە ئاڵاهەڵگری گەشەپێدانی خەسڵەتو پرەنسیپەکانی مارکسی دەزانی، ئەو جۆرە لە دیماگۆگیەتیەیان، جێگای سەرسوڕمانو نیگەرانی بوو!

## لە کانی تەلان بۆ گوێزێ

ئێوارەیەکی کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٨٧، فڕۆکە پیلاتۆزەکانی ڕژێمی بەعس تازە دەستیان لە بۆردوومانی دۆڵی بالیسان هەڵگرتبوو پایدۆستیان کردبوو. سێبەری چیای هەورێ باڵی بەسەر گوندی چیووەی حاجی بەدیعیو چیوەی خوارێدا کێشابوو. کانی تەلانی ناوی خۆی بەخۆیەوەیە دەڵێی بەردی مرازانەو بەقەد تەلانی چیای هەورێ وە نوسێندراوە. بە دووربین سەیری گوندی دەلاشو گوندەکانی دۆڵی بالیسانم دەکرد، شوێنەکەی من نسێی گابەردێکی گەورەبوو سێبەری هاتبووێ، بەڵام هێشتا خۆر لە گوندەکانی دەدا بۆ دووربین زۆر خۆش دەبینرا. مەبەستم ئەوەبوو بزانم فڕۆکەکان چ

---

١- دکرەسات: کارەسات.

زیانیان بە پێشمەرگەو هاوڵاتی گوندەکان گەیاندووە، یان نا! لەناکاو، چەند کەسێک بوونە جێگای سەرنجم کە لەخوارەوە دەیانویست بە هەورازی چیای هەوریێ بەرەو کانی تەلان هەڵزنێن. دیاربوو میوانی بارەگای ئێمە دەبوون، لە پەنای درەختەکان بۆم ساغ نەدەبووەوە، بەڵام هەر لەخۆمەوە وام مەزەندە کرد ڕەنگە بریندارییان هەبێت، دەیانەوێ بیگەیەننە لای دکتۆری ئێمە بۆ چارەسەرکردنی. بەڵام کاتێک لەنێو لێرەواری سەریان وە دەرنا، دیاربوو هەموویان ساغ بوونو بەپێی خۆیان ڕێیان دەکرد. ئەو میوانانە کاتێک گەیشتنە بارەگا، چوار کەس بوون لە ڕێکخستنەکانی شەقڵاوەڕا هاتبوون. کوڕێکی گەنجیشیان لەگەڵ بوو ئێمە وامانزانی ئەو گەنجە بۆ پێشمەرگایەتی هاتووە. دوایی زانیمان ئەو گەنجە ناوی ئەمجەدە، لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی شاری بەغدا یارمەتی دراوە بۆ ئەوەی بگاتە ئێران لای ماڵی فەلەکەدین کاکەیی. ئەمجەد کوردی فەیلی بوو، بەڵام کوردی باش نەدەزانی چونکە هەر لە بەغدا گەورەببوو لەوێش بە عەرەبی خوێندبووی. ئەگەر لە قسەکردن لەسەر بابەتێک تێکئاڵقان و لێک حاڵی نەبوون دەهاتەپێش، من وەکو دیلماج (مترجم) یارمەتیم دەداو بە عەرەبی قسەم لەگەڵدا دەکرد. ئەمجەد بەو هۆیەوە پەیوەندی لەگەڵ مندا باشتر بوو تا هاوڕێیانی عەرەبیان نەدەزانی. ئەمجەد هیچی لە بارەی ژیانی پێشمەرگەو شاخو گوندنشینان نەدەزانی، نەیدەزانی چ چارەنووسێک ئەوی گەیاندۆتە کانی تەلانی. ئەمجەد بە نیازی پێشمەرگایەتی نەهاتبوو، تەنها داوایان لە ڕێکخستنەکان کردبوو یارمەتی بدەن بۆ چوونەئێران. بۆیە هەر نێوە نێوە دەیوست بە کوردییەشڕەکەی، حاڵیمان بکات تەنها داواکاری ئەوەیە بیگەیەنینە بارەگاکانی سەرسنووری ئێران، بۆ ئەوەی بگاتە ماڵی فەلەکەدین کاکەیی و، ئەو، ڕەوانەی دەرەوەی وڵاتی دەکات، چونکە خزمی

خۆیەتی. فەلەکەدین کاکەیی، ماڵی لە شارەکانی ئێران بوو. لە دوای چەند ڕۆژێک لە بارەگا، چەند پێشمەرگەیەک ئەرکدار کراین بچین بۆ بارەگاکانی پێشمەرگە لە گوێزێ‌و دۆڵەکۆگەی سەرسنووری ئێران واتا خۆرهەڵات. پێیانگوتین: ئەمجەدیش لەگەڵ خۆتان بەرن بۆ گوێزێ لەوێ هاوڕێیان بەڕێی دەکەن بۆ خۆرهەڵاتی کوردستان. ئێمەش لەگەڵ خۆمان بردمان.

لە دەرەشیرێ بەسەرکەوتین، بۆ نانی نیوەڕۆ چووینە وێجی پیرانان‌و ماخۆبزنان. ئەمجەد بە موو لەمن دانەدەبڕا، پێی لە شوێنپێی من دادەنا. منیش ئاگاداری بووم‌و دیلماجیم بۆ دەکرد لە کاتی قسەکردن. ئەمجەد مەتارەی ئاوی نەبوو دۆلکەیەکی پڕئاو کردبوو بە دۆخینێک حەمایلی کردبوو. هێشتا کاتی پاڵتۆ لەبەرکردن نەهاتبوو، بەڵام لەبەر ساردی شەوانی قەندیل‌و گوێزێ‌و سەرسنوور، ئەمجەد شەوان پاڵتۆیەکی ڕۆمانی بە کڵاوی لەبەردەکرد. لەو ڕێڕۆیشتنە، ئێمەی پێشمەرگە بارمان قورس بوو، تفەنگ‌و حەوت مەخزەنی پڕ فیشەک‌و مەتارەو نارنجۆک‌و دووربین‌و ڕادیۆو زۆر پێداویستی دیکەش، بەڵام ئەمجەد باری سووک بوو هیچی پێنەبوو.

تیشکی خۆر نارنجی خۆی بەرەو ماڵئاوایی لە تیشەشاخەکانی قەندیل نیشان دەدا، کەوەکان خۆیان فجوق دەکرد بۆ شوێنی مانەوەی شەوانیان، لەژێر تاوێرەبەردەکان‌و شاخی ڕەوەزەکان هەرچی باڵندەیە دەهاتنەوە بۆ هێلانەو شوێنی مانەوەی شەوانیان.

نهێنیی شەو داندراو دوو پێشمەرگە کران بە قفڵی مەفرەزە، یانی ناهێڵن کەس لە دواوەی ئەوان بەجێ بمێنێ. ئێمەش چەند پێشمەرگەیەک، بە حوکمی ئەزموونی پێشمەرگایەتی‌و شەوڕۆیی‌و شارەزایی ناوچەکەو ڕێگاوبانەکان، لەپێشەوە کەوتینەڕێ. بانگی ئێوارە لە گوندی ئێندزێ‌و بۆڵێ دەبیسترا. تاریکی کەوتە نێو

لێرەواری، ئەو بەندەنە خۆی لە تاریکایی وەرپێچا، دەبوایە کەڵک لە تاریکایی شەو وەربگرین بۆ پەڕینەوە لە جادەی قیرِی ئەو دۆڵە بەرەو بناری قەندیل. لەکاتی پەڕینەوە لە جادەکە، ئێمە تفەنگمان لەنێو لەپی دەستی بوو، ئامادەباش بۆ هەر ئەگەرێکی نەخوازراو. چەندین جار بە ئەمجەدم دەگوت بکشێوە دوای ئێمە، خۆ تۆ تفەنگیشت پێنیە بەرگری پێبکەی! بەلام لەو گوێی دەچوو و لە گوێی دیکەی دەهاتەدەر، قسەی دەکرد لەکاتێک قسەکردن لەو شوێنانە قەدەغەیە. دیاربوو دڵی بە کەس ئاوی نەدەخواردەوە بە من نەبێ، وای دەزانی تەنها من پارێزگاری لێدەکەم. نەیدەویست بەهیچ شێوەیەک لێم دووربکەوێتەوە، نەمدەزانی چۆنی حاڵی بکەم بڕواتە دواوە. ناچاری کردم، لەوکاتەی لەپێش من دەڕۆیی، چەند بەردێکی دوو کیلۆیی‌و کەمتر، بخەمە نێو کلاوی پاڵتۆکەی، گوتم ئەگەر باری گران بێت، بەڵکو تۆزێک دوابکەوێ! ئاخر ئەو هەستی بە مەترسی کەمین‌و شتی وا نەدەکرد.

بەرلەوەی شۆڕبینەوە لەو بزنەڕێگا پێچاوپێچانە نووکی پێلاوە ئەدیداسەکەم کون ببوو، پەنجەی گەورەی پێم هاتبووە دەرەوە لە پێلاو، بە دڕک‌و دارو بەردی دەکەوت، زۆری ئازار دەدام، چونکە پێلاوی باش چاکترین پێداویستی پێشمەرگەیە. بە هەرحاڵ، لە جادەی قیر پەڕینەوە چوینە گوندی ئێندزێ. لەوێ ئەمجەد پاڵتۆکەی داکەند کاتێک غرڕەی بەردان هات، گوتی ئەی خوایە من دەمگوت ئەو پاڵتۆیەم بۆ وا قورس بووە، ئەوە کێ ئەو بەردانەی تێهاویشتووە؟ هاوڕێیان گوتیان هاوڕێ حازم بۆ ئەوەی بارت گران بێت و لە پێشەوە نەڕۆی، ئەوە بۆ سەلامەتی تۆیە بۆ ئەوەی ئەگەر پێکدادان لەگەڵ پیاوەکانی ڕژێم ڕوویدات، تۆ بێ تفەنگ لە پێشەوە نەبیت، ئەوجا ئەتۆ پێشمەرگەش نیت!

لە گوندی ئێندزێ کۆبووینەوە. بەر لە دابەشبوون بەسەرماڵەکاندا، من لە خەمی جووتێک پێڵاوی ئەدیداسدا بووم، دوکانێکی بچوکی لێبوو تەنها جووتێک پێڵاوی ئەدیداسی ژمارە ٤١ ی مابوو. هەرچەندا من ژمارە ٤٢ لەپێ دەکەم، بەڵام چونکە پێڵاوم بە پێەوەنەمابوو، بەناچاری کڕیم. گوتیان تەڕی بکەی‌و پێی بڕۆی تۆزێک گەورەدەبێت.

دەبوایە بەسەر ماڵەکاندا دابەش بین‌و پاروەنانێک بخۆین‌و تۆزێک پشوو بدەین، من‌و چەند پێشمەرگەیەک چووینە ماڵی یەک لە پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتی ئێران، لە هۆزو ڕەچەڵەکی سمکۆی شکاک بوو، خەڵکی زێوەو مەرگەوەڕی ورمێ بوو، جاری دووەمم بوو لەو ماڵە دابەش بم، ناوی مەلا ڕەسوی شکاک بوو، چاوێکی کەمبینابوو، زۆر ڕێزی گرتین. ئەگەر زەین‌و یادەوەریم یارمەتیم بدات، لە من بەتەمەنتر بوو، کادیرێکی پێشکەوتوو بوو. لە دوای پشودان‌و نان و چا خواردن ماڵئاواییمان لە خانەخوێی خانەدان کرد، هەموو پێشمەرگەکان لە شوێنی دیاریکراو گردبوونەوە، کەسمان دوانەکەوتبوو، بەرەو کونەکۆتر بەڕێکەوتین. لە قەد لاپاڵی کونەکۆتر، لە پشتی (بۆڵێ) گۆڕاییەک هەبوو پووشەڵێن بوو، بڕیارماندا تاوەکو سیوادی ڕۆن دەبێت، لەوێ بخەوین و، بەرلەوەی بەتەواوی ڕووناک بێت، بەڕێبکەوین. هەریەکەو نانی بەیانیمان لە کۆڵە پشتەکانمان گرێدا، گەیشتینە شوێنی مەبەست، تۆزێک پوشەکەمان تەخت کردوو لێی خەوتین. پاسەوانمان دانا یەک بە دوای یەک یەکترمان دەگۆڕی. ئەمجەد لەتەک من شوێنی بۆ خۆی چاککرد. تازە خەوم لێکەوتبوو بانگیکردم: ئەو حەشەرە چیە بە قاچمدا هەڵدەگەڕێ؟! ئەو شەوە چەندجار بەئاگای هێنام، خەوی لێنەدەکەوت، دەیگوت چۆن لەسەر ئەو زەویە ڕەقە بخەوم بێ سەرین! پێی وابوو ئێمە لە هوتێلی پێنج ئەستێرە خەوتوین! تەنها پاسەوان بەئاگابوو. سیوادی بەیانی دابوو

پاسەوان بانگیکردین، خۆمان پێچایەوە، بە قەد چیای قەندیل هەڵزناین، لەسەر کانیاوێک نانەکانی خۆمان دەرهێناو نانمان خوارد. بەڵام من بەهۆی تەنگی پێڵاوەکانم، زۆر بە ئازاربووم، لە هەموو کانیو جۆگا ئاوەکان بە پێڵاوەوە بەنێو ئاوەکەدا دەڕۆیشتم. بۆ ئەوەی نەرمبێتو تۆزێک گەورەبێت بەنێو هەر جۆگەئاوێک دەکەوتم، هەتا گەیشتینە ڕووباری قڕناقاو پشتئاشان، ئەمجەد لە دوای من شڵپەی لە ئاوەکە دەهێناو تەبای من بەنێو ئاوەکەدا دەکەوت بە پێڵاوەوە بێئەوەی پێڵاوەکەی تەنگ بێت، ئەمن چیم دەکرد لاسایی منی دەکردەوە!

ئێوارە گەیشتینە بارەگای لقی پشدەر لە ڕەزگەو مارەدوێ. لەبەر ئازاری پێم ژانەسەرم گرتبوو زۆر شەپرێو بووم، ڕێگایەکی زۆر دوورو درێژمان بڕیبوو. هاوڕێیانی پشدەر وەک چاوەڕوانی ڕووداوێک بکەن، گوتیان ئێستا ڕەنگە دەست پێبکات، وا چاکە بڵاوەی بکەین. ئێمەش تەبای ئەوان لە خوارووی بارەگا لەژێر چەند تاوێرەبەردێکی گەورە خۆمان پەناداو، تۆپباران دەستی پێکرد. بە قسەی برادەرانی ئەوێ، ئەو جارە تۆپبارانێکی زۆر خەست بوو. ئەو تۆپانە تۆپی نەمساویی هەرە زەبەلاحەکان بوون. لە بەردقەڵشیوو و چەند ناوچەیەکی پشدەرڕا، لەو شاخەی پانەسەریو کوڕەشیو ئاغاسەری دەداو دەتەقینەوە. وەک بیانەوێ ئەو شاخە بەسەر پێشمەرگەدا بڕوخێنن. گرمەو ڕەقەی ئەو تۆپانە وای لە هەرچی زیڕوح هەیە کردبوو خۆیان لەژێر پەسارو پەسێوان، لەژێر گەوەڕە شاخەکان پەستێوون. کەو و سوێسکە فجوقیان کرد و لووربوونەوە بۆ کونو کەلێنی ڕەوەزەشاخەکان و ژێر گابەردە گەورەکان. لە هەمووی سەرنجراکێشتر، کاتێک گوللەتۆپەکان لەو قەدشاخەی وەک دیوار وابوو دەتەقینەوە، زرینگەی ئاسنەواڵەی

پاشـماوەی تەقینەوەکـە لـەو شـاخەی دەنگێکـی زۆر سـامناکی بـە دەوروبەر دەبەخشی، لەبەرخۆمەوە دەمگوت ئەوەیە دەسەلاتی ئاگرو ئاسـن! دوکـەڵی ڕەش‌و بـۆنی بۆگـەنی بـاڕوت لـەو خڕودۆلانـەدا داوێستابوو، پارچە ئاسن‌و ساچمەی تۆپەکان ئاگریان لەو ڕەوەز و بەندەنە بەردەدا بەتایبەتی ئەو گاوانەی[1] پووشەڵێن بوون.

لە کاتی گەرمـەی تۆپباران لـەبن گابـەردێک خۆمـان قایم کردبوو، ئەمجەد بەجۆرێک دەهاتە بن باڵم وای دەزانی تۆپەکان ئـەمن نـابڕن! پشتی بەرنەدەدام ئاوەها خۆی بە پشتمەوە چەسپاند بوو، نەمدەتوانی خـۆم بسـووڕێنم، منـیش پێمگـوت بـۆ پێلاوەکانـت دانەکـەنی‌و خـۆت شـۆڕکەوە نێو گـەدەو هـەناوم! لـەو کاتـەدا هاوڕێیـەک لـە نزیـک ئێمـە دەیویسـت ئـەمجـەد دڵنیابکاتـەوەو نەترسـێ، گـوتی ئێـرە (زاوییـە مەییتەیـە) یـانی گۆشـەی مـردوو. لـە یاسـای سـەربازی ئەوشـوێنەی تۆپبـاران نەیگرێتـەوە پێیـدەڵێن زاوییـە مەییتـە. ئەمجـەد کـە گـوێی لـە وشەی (مەییتـە) بوو، گوتی: منو مـات؟ (کێ مـرد؟) هـەتا تێمانگەیاند کەس نەمردووە زیرەی کردبوو!

بـە ڕای مـن ترسـان ڕێژەییـە، لـە مرۆڤێـک بـۆ مرۆڤێـک جیـاوازە، ئەگـەرنا هـەموو کەسـێکی عاقـڵ بـە ڕێژەیـەک دەترسـێ. ئـەزموون نەکردنی ئەو جۆرە ڕۆژگارانـە زیـاتر مـرۆڤ دەستەپاچەو دووچاری ترس دەکات، دەنا پێم وایە تێفکرین و وردبوونـەوە و خۆپاراستن لـە مەرگ، بە مانای لێترسانی نیە، بـەڵکو هەوڵدانـە بۆ بـەجێهێنانی ئەرکـە بـەجێماوەکان. خەسـڵەتی مرۆڤەکانـە هەرچەنـدی حـەزو خۆزگـە و ئارەزووەکانـت هەڵکشـێ، ئازارەکانـت زیـاتر دەکـەن. بۆیـە ئێمـە هەستمان دەکرد بۆ لەوێین؟! لێ ئەمجـەد بێخەبـەر بـوو بـۆ لەوێیـەو چ

---

[1] - گاو: قەدپاڵ و ڕەوەزی چیا، کە پووشی لێ بێت و ڕێگای نەبێت بۆی بچیت.

ئـەرکێکو چارەنووسـێک ئـەوی گەیاندۆتـە بـن ئـەو گابـەردە! بۆیـە هەستی بە ترسان دەکرد.

تاوەکو زەردەپەڕیو ئاسۆ سوور هەڵگەڕا، سێرە هـەڵگیرا، دەستی لە تۆپباران هەڵنەگرت. لێتان ناشارمەوە گەر بە بەزینو هەڵاتن لەو واقیعـە زەقنەبووتـەم بۆ ئـەژمار نەکرابوایە، دەڕۆیشتم سـەری خـۆم هەڵـدەگرت بـۆ دوورتـرین گۆشـەی جیهـان، لـە پانتـایی ئـەو زەمینـە هێلانەیـەکی ئـارامم بـۆ خـۆم دروسـت دەکـرد. هـەر بـۆ ئـەوەی بـە ئاسودەیی هەناسـەیەک هـەڵمژم بۆنی بـاڕووت ئاڵودەی نـەکردبێتو، لـە شـیرین خـەودا بـە دەنگـی گرمـەی تـۆپو موشـەک لـە خـەو ڕانەچڵـەکمو، هاوڕێکـانم بـە جەمـەدانی و جلـی خوێنـاوییەوە بـۆ هەتاهەتایە ژێر گڵ نەکەمو نەیانشارمەوە.

هاوڕێیانی پشتدەر شارەزای کاتی تۆپبارانەکە بوون، بۆیە بانگیـان کـرد هاوڕێیـان وەرن نـان بخـۆن تۆپبـاران تـەواو. هـەر یەکـە چەنـد نانێکمان بە نسکێنەی خواردو چامان خواردەوە. بەهۆی ماندووبون و هیلاکـی ڕێگـا ئێمـەیان لـە پاسـەوانی دانـەنـا، شـوێنی خـەوتنیان نیشاندانو هەریەکەو پەتۆیەکیان پێدانو ئەمجەد لەتەک مـن خـەوت. من ئەوەندە هیلاک بووم، لەجیاتی سـەرین سـەرم بەڕەختەکەم کـردو جەمەدانیەکـەم لـە ژێـر سـەرم دانـا، وەک حـەبی ڤـالیۆمم خواردبێت، خەوم لێکەوت!

کات لەنیوەی شەو تێپەڕیبوو، ئەمجەد بانگیکردم: هاوڕێ حازم ئەو حەشەراتانە چین؟ ناهێڵن بخەوم! بەزۆری چاوم بۆ هەڵنـەدەهات، کە سـەیرمکرد، چراکـەی هێنـابووە لای خـۆیو بـە لایتەکـەش خـەریکی پشـکنینی جلـی ژێـرەوەی بـوو، هـەموو جلـەکانی داکەنـدبوو تـەنها شۆرتی لەبەربوو، کە دیقەتم دا چەند ئەسپێیەکی گرتبوو لەنێو لـەپی بـوون، گوتی: هـاوڕێ ئەوانـە چـین؟ نـاهێڵن بخـەوم! منـیش زۆری لـێ

پەست بووم، گوتم: ئەوانە ناویان ئەمجەدە کە ناهێڵێ من بخەوم، ئەگەر تۆ لەمن بگەڕێی، قالۆنچەو سیسرکەم بێنە باخەڵی، خەبەرم نابێتەوە! هەر چاوم بەخەوەوە بوو نەمزانی چۆنی لە یەخەی خۆم بکەمەوە، ناچاری کردم هەندێک لە ئەسپێیەکانم دەستنیشان کرد، گوتم: ئەوانە بکوژەو پانیانکەوە، دوو دانە ئەسپێی زۆر گەورەش کە لەسەر ئەوەبوون گەراڕشک دابنێن، گوتم: ئەو دووانەش با لەنێو باخەڵت بن، ئێمەش هی ئاوامان هەیە، ئەوانە، هەر حەشەرەیەکی بێتە باخەڵ و نێو جلەکانت، بۆکسانێی لەگەڵ دەکەن! بەو شەڕەبۆکسە دەتپارێزن! بەوجۆرە ئەو شەوە لە یەخەی خۆم کردەوە، گوتم: ئەگەر ماریش بتخوا، لە خەودا بانگم نەکەی! خەوتمەوە.

بەیانی زوو لە خەو هەستاین‌و نان‌و چامان خوارد. پێم زۆر ئاوسابوو، بەتایبەتی پێی ڕاستم پەنجەی گەورەی پێم، بەهۆی تەنگی پێڵاوەکەم گرێی کردبوو، بەهەر جۆرێک بێت بە هاوڕێیانم گوت ئەو پێڵاوەم دوێنێ کڕیوەو نوێیە، بەڵام تەنگە بۆ پێم ئەگەر ژمارە ٤٢ یەکی کۆنیشم بدەنێ ڕازیم. بەوشێوەیە گۆڕیمەوە، بەڵام کاری خۆی لەگەڵ پێم کردبوو. ئێستاش، کاریگەریی لەسەر پێی ڕاستم ماوە.

زۆر چڵکن‌و تۆزاوی ببووین، هەموومان پشتمان وەک دۆوڕۆنت پێداکردبێت سپی بووین. جلەکانمان، هێندەی لە ڕێگا ئارەقەی پێدا بڕژێ‌و وشک بێتەوە، ڕەق ببوون. دەمزانی گوێزێ کوێستانە و خۆشۆردن‌و جلشۆردن لەوێ ئەستەمەو بۆمان نارەخسێ. بۆیە گوتم هاوڕێیان دەتوانین خۆمان بشۆین‌و جلەکانمان بشۆین، بەیانی بەڕێکەوین بۆ گوێزێ. هاوڕێیانی پشتدەر پەناو پەسێوێکیان نیشاندایـن، مەنجەڵ و تەشتیان بە سابوون‌و تایتەوە بۆ دابین کردین و ئاومان گەرمکرد. هەریەکە کۆنە شەرواڕێکمان لێ وەرگرتن و لەبەرمانکرد، تاوەکو جلەکانمان وشک دەبێتەوە. جلمان

شوشــتو هەڵمانخســت بەســەر تەڕاشــانەوە. دەســتمانکرد بــە خۆشۆردن. ئەمجەد هاتبووە تەک من سابوونەکەی من کە هی بارەگا بوو، زۆر باش کەفی نەدەکرد زۆر خراپ بوو. بەڵام ئەمجەد دیتم ســابوونێکی دەرەجــە یــەکی زۆر بۆنخۆشــی دەرهێنــاو خــۆی پێدەشوشـت. پـێم وابـوو لـە بەغـدا لەگـەڵ خـۆی هێنـابووی. بـەدەم قسـەکردنەوە خۆمـان دەشووشـت ئەمجـەد گـوتی: هـاوڕێ حـازم بـۆ حەشـەرات نایـەڵن مـن بخـەوم؟ لەکاتێکـدا ئێـوە پرخـەی خەوتانـە؟! دەرفـەتم بـۆ ڕەخسـا شـتێک بڵـێم سـابوونە بۆنخۆشـەکەی دانـێ و دەستێکی پێ لـەخۆم بدەم. دەمێک بـوو بـەو جۆرە سـابوونانە خـۆم نەشوشــتبوو، گــوتم: ئەمجــەد گیــان ئێمــە مــانگی جارێــک ئــەو قوڕەسوورەی لـە خۆمـان هەڵدەسووین. بـۆ ماوەیـەک ئـەو قوڕەمـان بەجەســتەیوە دەمێنــێو ئــەوکات خۆمــان دەشــۆین. بۆیــە هــیچ حەشەرەیەک ناتوانێ لە خەومان بکات. گوتی ئەو قوڕە دەبێت؟ گوتم زۆر باشە. باش بوو ئەمجـەد سـابوونە بۆنخۆشـەکەی دانا و جامێک قــوڕی گرتــەوەو لــەخۆی هەڵســوو، منـیش دەسـتمدایە سـابونەکە و خەریک بووم خۆم پێ دەشووشت. نیوەنیوە لە منی دەپرسی تاکەی قوڕەکـەم پێوەبێت؟ بـۆ ئـەوەی حەشـەرات وازم لـێ بێنن؟ کاتێـک بـە باشـی خـۆم بـە سـابوونەکە شووشـت، ئەوسـا گـوتم: ئەمجـەد ئێسـتا دەتوانی قوڕەکە لەخۆت بکەیتەوەو خۆت بشۆی!

ئـەو ڕۆژەشـمان لەگـەڵ تۆپبـارانێکی خەسـت بـەڕێکرد. شـەومان ڕۆژکـردەوە. بەیانیەکـەی هەنـدێک نانمـان وەرگـرتو دەسـتی ڕێگـای گوێزێمــان گــرت. بــەجۆرێک پــێم لــە پــێڵاوی تــەنگ ترســابوو تۆپبارانەکەی ڕەزگەم زۆر پێ خۆشتربوو لە ڕێڕۆیشتن بۆ گوێزێ، تــا ئێســتاش ئــەو پەنجــەم نیــوەســەقەت بــووە. شــۆڕبوینەوە بــۆ دۆڵەکۆگــەی. دۆڵەکۆگــە هێنــدە قــوڵو تەنگەبــەرە ئاســمان بەقــەد

بێژینگێک دەبینی. بەهەرحاڵ، خۆمان گەیاندە گوێزێ. ئەمجەدمان هەر زوو تەسلیمی دەستی هاوڕێیان کرد بۆ ئەوەی ڕەوانەی ئێرانی بکەن بۆ ماڵی فەلەکەدین کاکەیی. ئەو شەوە لە گوێزێ لەجیاتی گەرما، بگرە ساردیش بوو، بەیانی چەند کەسێک دەچوون بۆ کونەمشکێ و ئاڵواتان، ئەمجەدیان لەگەڵ خۆیان برد. بەش بەحاڵی خۆم وام دەزانی بارێکی سەنگینم لەسەرشانی سووک بوو!

## *ناپاکێک*، لە دەریای تاوانەکانی خۆیدا خنکا

کەسێک لە خەسڵەت و ئاکاری مرۆڤانە داماڵدرا، دەبێتە چ درندەیەکی سامناکی دەم بەخوێن! کاتێک ناپاکی هێڵی سووری سنووری ڕەوشتو ویژدانی کەسێک دەبەزێنێ، کاتێک کەسێک خاڵیو سفر دەبێتەوە لە مۆڕاڵو تایبەتمەندیەکانی کائینێکی سوودبەخش بە مرۆڤایەتی، ئەو کەسە دەچێتە خانەی نەفرەتلێکراوە قێزەونەکان. لە ناخو ڕۆحیدا هێزێکی ئەهریمەنی، ختووکەی بەزاندنی سروتو گاتاکانی ئاهورامۆزدا دەدات، کە خۆی لە بیری باشو کرداری باشو گوفتاری باشدا دەبینێتەوە، ئەو مرۆڤە، لە جوغزی مرۆڤبوون دەردەچێت.

گەر وای لێهات نە ئاهونزولەی دایکێک بۆ ڕۆڵەکەی، نە فرمێسکو هەنسکی کچۆڵەیەک بۆ باوکی، نە چاوەڕوانی هاوسەرێک، عاشقێک بۆ مەعشوقەکەی لە ناخەوە ئازاری ڕۆحیان نەدات، ئەو کەسانە مەگەر لات وایە ئینسانن! نەخێر لە بیچمدا وەک مرۆن، بەڵام لە ئەقڵ و کەماڵدا وەک درندەی بیابانن، وەک قەلەڕەشە خۆی لە تاریکایی وەرپێچابێ. ئێمەمانان بێئاگابووین، بێئەوەی بە خۆمان بزانین، هەروەکو دوپشکێکی ڕەش لە بەختی هەموومان‌دا بوو، دەیویست

قڕانمان تێبخات ئەو کاتەی هات وەک شۆفارێک دووڕووانە ئیحرامی پێشمەرگایەتی بەست. ژیانی ئێمە هەمووومان لەنێو لەپی ڕەشیدابوو، لە سێبەری خیانەتەکانی خۆیدا گەرای تاوانی دادەناو توخمی گوناهی دەتروکاند!

ویژدانو ئەخلاقی چ مرۆڤێک ڕێگا بەخۆی دەدات کەللەسەرو پەراسووی ئەو مرۆڤانەی کە باوەڕیان بە تۆ هەبووەو ڕۆژانە بەیانی باشیان لێدەکردی، بۆ پەڕینەوەیەکی ناجوامێرانە، بکەی بە پرد؟! گەر ئەو کەسە، بە قورسایی کێوێک ئەحمەق و دڵڕەقیش بێت!

نوسینەوەی ئەو چیرۆکە پڕئازارانە، هیچ سوود و بەهرەیەکی کەسی، بەمن ناگەیەنێ، ئەگەر زیانم لێنەدات! لێ ناکرێ هەگبەو بوخچەی یادەوەریەکانم پڕبێت لە دووپشکی ڕەش و ماری دووسەرو هەموو شەوێک پێمەوە بدەنو کەس لە ئازارەکانم بەئاگا نەبێت! بۆیە دەمەوێ یادەوەری تەوقی ئەو تاوانەڕەشانە لە ملی خۆم دارنم بە ملی مێژوویەکی شەرمەزاریدا هەڵبواسم! هەرچەند ناتوانم چارەسەری زامەکانی ڕۆحمی پێ بکەم، وەلێ لە کۆڵ خەیاڵی خۆمیان دەکەمەوەو دەیانخەمە دووتوێی لاپەڕەکانی ئەو کتێبە. ڕێگا نادەم، بەرگەش ناگرم، ئەو یادە زەقنەبووتیانە خۆیان بە هەناسە ماندووەکانی ئێستامەوە هەڵبواسن، چونکە ئێستاش، دەردو کولو کوڤانی نیشتمانەکەم کەم نین، بەشی حەوت پشتم دەکەن!

لە کاتی هەرخلیسکانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی بۆ دروستکردنی بەرە لەگەڵ حیزبی بەعسو، ئاشکرابوونی هەموو ڕێکخستنەکانی حیزب بۆ دامودەزگا ئەمنیو هەواڵگریەکانی بەعس، دەزگا ئەمنیو هەوالگریەکانی بەعس توانیان کۆدی ئەو تەلیسمو نهێنیە تۆکمانەی ڕێکخستنەکانی حزبی شیوعی بەتاڵ بکەنەوەو دەرگا بخەنە سەرپشتو بزانن لە بنەبانێ، چی دەگوزەرێ. بۆیە دەبینین

ئەوانــەی خیانــەتیان لــە حیــزبو بیروباوەڕەکــەیان کــردو بوونــە باوەڕپێکراوی ئەمنو دەستگا هەواڵگریەکان، زۆربەی هەرەزۆریان لە ســەردەمی بــەرە، زەفــەریان پێبــرا. وەک خائینــان: ئــەبو تالــب، مــەمۆ، ئەبوتــەها، ئــەبو هــێمن، ئــەبو مــحەمەد، نائب زابتــی خانەنشــین، کامــل محســن الخفــاجی نــەقیبو چەنــدانی دیکــە کــە تــا ئێســتا لــە نیهانــدا ماونەتەوەو ئێمە نایانزانین.

ئەبوتالب، خەڵکی تکریت بوو. بەرپرسی ڕێکخستنەکانی دەوروبەری بەغدا بــووە لــە حــەفتاکان، کــادیرێکی پــڕ ئــەزموونو شــارەزابوو لــە ڕێکخستن. سەرەتای حەفتاکان لە جەیشی عێراقی نائب زابت بووەو بــە دەســتی دەزگاکــانی هــەواڵگری و دائیــرەی ئــەمنی بــەدناوی بــەعس لەنێو ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی دەکرێدرێو خۆی مــەلاس دەدات. هــاوڕێ ســەباح کــونجی ئــەو زانیارییــە گرنگانــەی پێــدام، ئێســتا لــە ژیاندایە.

ئیبراهیم ئەحمەد، نووسەرو ڕۆژنامەنووس، ئێستاش لە ژیاندا ماوە، خــاوەنی چەنــدان نووســینو کتێبــە، لــە ســەرەتای حــەفتاکان لەگــەڵ حەرەکــەی قــەومیین العــرب کــاری کــردووەو نزیــک بــووە لــە حیزبــی شــیوعی هــەر لــەو ســەردەمەو لــە زەمــەنی جەبهــەی وەتــەنی حیزبــی شیوعیو حیزبی بەعس، بە حیزبی شیوعیی ڕاگەیاندووە کە ئــەبوتالب بــاوەڕپێکراوی بــەعسو نێردراوی دائیــرەی ئەمنــە، بــۆ نێــو ڕیزەکــانی حیزبــی شــیوعی. بەداخــەوە ســەرکردایەتی حیزبــی شــیوعی ئــەوکات، گرنگیــان پێنــەداوەو لەســەر ئــەو هەواڵــە لێکۆڵینــەوەو بــەدواداچونیان نەکردووە.

ئیبراهیم ئەحمەد، لەژێر کاریگەری هزری مارکسیدا بووە، بۆیــە لــە لایەن عامر عەبدوڵلا ئەندامی م. س تەسکییە کراوەو بووە بە ئەندامی حیزبی شیوعی.

لە ساڵی ٧٩ –٨٠ لەكاتی هێرشی حیزبی بەعس بۆ سەر حیزبی شیوعی و ڕاوەدوونانی شیوعیەكان، ئەبوتالب ڕۆڵی هەبووە لە دەستنیشانكردنی شوێنی عائیدە یاسین بۆ ئەمن. ئەبوتالب لەگەڵ فەخری كەریم زەنگەنە لە بەیرووت لە مەكتەبی حیزب كاردەكەن. فەخری كەریم وەک بەرپرسی یەكەم، ئەبوتالب وەک جێگری فەخری كەریم دەست بەكاردەبێت. ئەو مەكتەبە بەرپرسی ڕێكخستنەكانی بلغاریا و سوریا و لوبنان دەبێت. هەوڵ دەدەن لە ڕێگای منەزەماتی تەحریری فەلەستینی مەشقو ڕاهێنان بە هاوڕێیان بكەن لە ڕووی سەربازیو ئامادەكردنو پەروەردەكردنیان بۆ پێشمەرگایەتی و ڕەوانەكردنەوەیان بۆ كوردستان.

فەخری كەریم، لە ڕێگای منەزەمەی تەحریری فەلەستینییەوە دوو پاسپۆرت دروستدەكات بۆ هەریەک لە سەفا ئەلحافز و سەباح ئەلدورە دوو بەرپرسی باڵاو كادری حزبی شیوعی، بۆ ئەوەی لەژێر هەڕەشەی بەعس ڕزگار بكرێنو بگەنە سوریاو بەشداری لە دروستكردنی مەفرەزە سەرەتاییەكانی پێشمەرگە شیوعیەكاندا بكەن.

فەخری كەریم، ئەبوتالب ئاگادار دەكات دوو پاسپۆرتی لە ڕێگای فەلەستینیەكانەوە دروستكردووە بۆ دوو هاوڕێ، بۆ ئەوەی سەفەری پێبكەنو لەژێر هەڕەشەی بەعس ڕزگاریان بێت، بەڵام ناوی ئەو هاوڕێیانەی پێ ناڵێ. ئەبوتالب لەنێو جانتای فەخری كەریم هەردوو پاسپۆرتەكە دەبینێو دەزانێ بە چ ناوێک دروستكراون، دامودەزگای هەواڵگری بەعس لەكاتی سەفەركردنی ئەو دوو هاوڕێیە ئاگادار دەكاتەوە، هەردووكیان لە بازگەی هێزە ئەمنیەكانی بەعس دەستگیر دەكەن. لە دوای چەند ڕۆژێک لەژێر ئەشكەنجە شەهیدیان دەكەن. هەروەها بەدەر لەوە، دەستی لە بەشەهیدانی (عائیدە یاسین)ی هاوسەری تێكۆشەری گەورەی كۆچكردووی گەلەكەمان (بەهائەدین

نوری)یشدا هەبووە.

لەکاتی دروستکردنی هێزی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی و دانانی چەند بنکەیەک، ئەبوتالب لە قاتعی بادینان، کە بەرپرسەکەی ئەبو جەمیل تۆمە تۆماس بوو، بەرپرسیاریەتی پێدەدرێ و ئەندامی سەرکردایەتی قاتعەکەو مستەشاری سیاسی قاتعیش بووە.

سەرەتای ناسینم بۆ ئەبوتالب، دەگەڕێتەوە بۆ پایزی ۱۹۸۳ لە بارەگای زێوەی قاتعی بادینان، لە دوای گەڕانەوەمان لە شەڕی قڕناقەو پشتئاشان. ئەو کاتە ئێمە ۸ پێشمەرگەی قاتعی هەولێر بووین وەک پاسەوانو پارێزەری ملازم خدر لەگەڵی چووبوین بۆ ئەوەی بڕوات بۆ قامیشلۆ لە سوریا، تاوەکو سەردانی خێزانەکەی بکات. ئەوکات چەند ڕۆژێک لە زێوە ماینەوە. ئەبوتالب جلوبەرگێکی خاوێنو ژوورێکی خۆشی هەبوو، دەتگوت ڕێوی نێو پاوانییە! لە هاوڕێیانی ئەوێمان بیست کە گوایا سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی شاری موسڵ و تکریتو چەند شوێنێک دەکات. من هیچ ئاخافتنێکم لەگەڵیدا نەبوو، کەسێکی مۆنو کەمدوێ بوو، بەڵام من پێم وابوو زۆر ترسنۆکو بێجورئەتە، بۆیە تێکەڵاوی لەگەڵ دەوروبەر لاوازە!

ساڵی ۱۹۸٦، بارەگای قاتعی هەولێر لە گەلی خەڵک ناوچەی کافێی بەری گارەی بوو، ئەبوتالب لە قاتعی بادینان گوازرابۆوە قاتعی هەولێر وەک ئەندامی قاتع دەست بەکاربوو. جێگای داخە هەندێک لە هاوڕێیان، هەر بابا بوو لە ڕاستەخۆیەوە هەندێک تایبەتمەندیی وەهمیان بۆ ئەبوتالب دادەتاشی، هەبوو دەیگوت خەڵکی ناسریەیەو خزمی هاوڕێ فەهدی سکرتێری لە سێدارەدراوی حیزبی شیوعیە. هەبوو دەیگوت یەک لە ڕزگاربووانی (**قطار الموت**)ـە. هەبوو دەیگوت یەک لەو زیندانیانەیە کە لە ناسریە لەنێو زیندان تونێلێکی بن ئەرزیان لێداو ڕزگاریان بوو، هەبوو دەیگوت لە (حەرەکەی حەسەن سەریع)

بەشداربووە. بەڵام ئەوانە هیچیان ڕاست نەبوون. بەداخەوە هەندێک لە هاوڕێیانی حیزبی شیوعیش لە ژێر کاریگەریی کولتووری گەوجانەی خورافیاتی کۆمەڵگای عێراقی دەربازیان نەبوو، وەک هەموو ڕۆژێک بە بەرچاوی هەمووومانەوە ئێستاشی لەگەڵدابێ دەبینین لەژێر کاریگەریی هزری قوفڵدراوی ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکیو خورافیاتی بەناو ئایینی، چۆن کۆمەڵگا، ساختەچی و قوڵبڕ و شێخ و دوعاگۆ و فالگرەوە و درۆزنەکان دروست دەکەن و دەیانکەن بە پیشەنگی خۆیان، کوێرانە بە شانو باڵیاندا هەڵدەدەنو هەزار سوێندی بە درۆیان بۆ دەخۆن کە ئەقڵی مرۆڤی ژێر قەبوڵی ناکات. پێهەڵدانی ئەبوتالبیش، ئەو ماوەیە کە لەبەینی قاتعی بادینانو هەولێر هاتووچۆی دەکرد، هەر هەمان شێوەبوو!

لە کۆتایی مانگی تەمموزی ١٩٨٧ مەفرەزەیەک کە پێکهاتبوو لە شەش کەس هەریەک لە ئەبوتالب، عەلی شاهیر، شەهلە، مزەفەر، ئومێد، ئەبوعەلی، لە بارەگای قاتعی بادینان لە زێوە بەڕێدەکەون بەرەو ئەو بارەگایانەی ئێمەی لێبووین واتا قاتعی هەولێر لە کافییەی بەری گارەی، هێسترێکیان پێبوە کە بەریدی لێ بارکراوە.

هاوڕێ شەهلە (دکتۆرە جومانە القورەوی) کە یەکێک لە ئەندامانی ئەو مەفرەزە بوو، گوتی: لە دوای ڕۆژێک ڕێکردن، گەیشتینە چەند ڕەشماڵێک لەسەرڕێگای خۆمان، دەبوایە ئێمە یەک شەو لەو شوێنە پشوو بدەین، نازانم ئەبو تالب مەبەستی لە پێداگیریکردنی چی بوو دەیگوت دەبێت دوو شەو لەو شوێنە بمێنینەوە! بەو هۆیە دوو ڕۆژ لەو ڕەشمالانە، کە شوێنێکی هەستیار بوو، ئێمەی دواخست. هەرچەندە بۆ ئەو ڕێڕۆیشتنە هاوڕێ ئومێد ئامر مەفرەزە بوو. ئەبو تالب تەنها یەک دەمانچەی میکارۆفی پێبوو، لە دوای دوو شەو مانەوە، ١ ی ئابی ١٩٨٧ بەڕێکەوتین بەرەو جادەی ئامێدی لە (بنگەلی

سەرگەلێ) لەسەر کانیەک ئاومان خواردەوەو مەتارەکانمان پڕئاوکرد. ئێمە وامان زانی شوێنی مەترسیمان تێپەڕکردووە، لەو کاتەدا ئومێد زۆر لەپێش ئێمە دەڕۆیشت، لەناکاو دەسترێژی گوللەیان لێکردین و ئومێد پێکرا. کەمینەکە، مەفرەزەی ئیستخبارات بوون، تفەنگەکەی ئومێدیان بردوو ڕۆیشتن. مزەفەر بەر لە هەموان چوە سەر ئومێد، ئومێدی لە پشتی کرد، بەڵام بەداخەوە شەهید بوو. هێسترەکەمان چووبوە لای ڕەبایەی جاشەکان کە ئێزیدی بوون، بەڵام کەسیان تەقەیان لێنەکردین، تەرمی ئومێدمان لە هێسترەکە بارکرد بەرەو گوندی سپیندارە. ئومێد خەڵکی ئەعزەمیەی بەغدا بوو ناوی ڕاستی (حسام کازم) بوو. هەر لەوێ شەهید ئومێدیان بە خاک سپارد. گوندنشینان نانی ئێوارەیان بۆ هێناین لە پەرۆشیمان بۆ شەهید ئومێد کەسمان نانمان پێ نەخورا. تەنها ئەبو تالب نانی خوارد!

کاتێک گەیشتنەوە لای ئێمە لە قاتعی هەولێر، هاوڕێیان لە چۆنیەتی ئەو کەمینەو شەهیدبوونی شەهید ئومێدو دەربازبوونیان پرسیاریان لە ئەبوتالب دەکرد. لە وەڵامدا دەیگوت من بە تفەنگی مزەفەر تەقەم کردووە. مزەفەر دەیگوت ڕاست نیە من تفەنگی خۆم لای خۆم بووە، ئەو جارە دەیگوت بە تفەنگی ئومێد تەقەم کردییە، لە کاتێکدا نە تفەنگەکەی هێنابویەوەو جاشەکان تفەنگی شەهید ئومێدیان بردبوو. ناچار دەیگوت رمیت بالمسدس مالی (بە دەمانچەکەی خۆم تەقەمکرد). هەر ئەوەندە بەس بوو بۆ لێکۆڵینەوەیەکی ورد لەو بابەتە، بەداخەوە کەسێک نەبوو بڵێ کوا چەند فیشەکی دەمانچەت تەقاندووە؟ کە یەدەگەکانت پڕ لە فیشەکن! ئەگەر وایە ئەو فیشەکانەت لە کوێ کڕیتەوە، یان کێ بۆی پڕ فیشەک کردیەوە؟

ئەوانە هەموو پرسیارگەلێک بوون دەبوایە هەڵوێستەیان لەسەر بکرێ، دەکرا زۆر بەئاسانی پەردە لەسەر زۆر شت هەڵماڵدرێ،

بەداخەوە کەس خۆی بە خاوەن نەکردو گەوجانە بەسەرماندا تێپەڕی. هەرچەندە من لەو بابەتە هیچ بەرپرسیاریەتێکم نەبوو، تا بتوانم پرسوجوی لەسەر بکەم!

بارەگای قاتعی هەولێر لە کافێ گوازرایەوە ئەشکەفتەی دۆڵی بالیسان. ئەو مەفرەزەی ئێمەی لەگەڵ بووین، خۆی لە ٣٠ سی پێشمەرگە دەدا. بەرپرسی مەفرەزە هاوڕێ محسن یاسین بوو، دەبوایە لە (گەلی بێخمە) بە کەڵەک بپەڕینەوە، ئەوەش دەبوایە بەشەو ئەنجام بدرێ‌و ئەو ڕێڕۆیشتنە چەند شەوو ڕۆژی دەخایاند. لە ئەشکەفتێکی چیای کۆریس بە دیوی بەرڕۆژێ، ماینەوە. ڕەبایەی سەربازەکانی سوپای عێراق لێمان دوور نەبوو، بۆیە دەبوایە لە جموجۆڵ سنورداربین. لێ ئەبوتالب زۆر دەترساو زۆر لە خەمی سەلامەتی خۆیدا بوو، هەندێک مینگەمینگی کرد، هاوڕێ محسن یاسین لێی تورەبوو پێیگوت دڵنیابە ئەگەر ئەو ٣٠ سی پێشمەرگە ئازاو جوانانەت هەموو بە قوربان بکەم، بە سەلامەتی لە ئاوی بێخمەت دەپەڕێنمەوەو دەتگەیەنمە دۆڵی بالیسانێ، تەنها جەنابت سەلامەت بی، سندان لە ئێمە بدات!

ئەبوتالب پێی وابوو بەهای ژیانی ئەو بەنرخترو باڵاترە لە بەهای ژیانی هەموومان، دەیویست خۆی بە خاوەنی ماقوڵترین‌و ماهیەتێکی ئەفسووناوی‌و جادوویی لە قەڵەم بدات!

لە چێشتەنگاوی ڕۆژی چوارەمی ڕێڕۆیشتنەکەمان، گەیشتینە سەر زینەتیرێ، تەمومژ خۆی لە (دەرەشیر)و (دەرەدار)ی‌و وەرپێچا بوو، هەتا پشتی گوندی مێرگەسەری هاتبووە خوار.

لە بارەگای ئەشکەوتە و کانی تەلانی چیای هەورێ، هەرکە ئەبوتالب گوێی لە دەنگی فڕۆکە دەبوو، زەندەقی دەچوو. خەریک دەبوو زراوی بڕژێ، لەژێر هیچ گابەردێک یان ئەو شوێنانەی بنکۆڵ

کرابوون بۆ خۆپارێزی لە بۆمباران، ئۆقرەی نەدەگرتو حەجمینی نەبوو! من و شەهید عەونی هەر بەگاڵتە دەمانگوت موشەک ئەوبەردەی وەک ئارووی شەق دەکات! ئەو بەپەلە لەو شوێنە دەیگواستەوە بۆ شوێنێکی دیکە! وەک مریشکی بە هێلکە دانەدۆزەی[1] دەکرد بۆ ئەوەی شوێنێکی قایمتر بدۆزێتەوە. جاری وا هەبوو لەسەر نانخواردن هەر بۆ ئەوەی بیترسێنین، دەنگی فڕۆکەی پیلاتۆزمان دەردەهێنا، ئەبوتالب قولاغو چاشمیش دەبوو، بەجۆرێک هەترەشی دەچوو، نەیدەزانی چۆن نانەکەی دەخوات! جاری واش هەبوو لەسەر نانخواردنەکەی دەڕۆیشتو نەیدەخوارد. هاوڕێ کانەبی دەیگوت عەونیو حازم ئەو پیاوەی شێت دەکەن هێندەی دەترسێنن! کتومت لاسایی ئەو مێشولانەمان دەکردەوە کە دەچوونە پەناگوێی گایەک ویزەویز دەکەن، گایەکەش دەفیشقێنیو هەڵدێت و ئالیکەکەی ناخوات!

دوابەدوای ئەنفال، هاوڕێ ئەبو ڕەبیع، بانگی هاوڕێیان غەریبو توانا دەکات: دەبێت ئەبوتالب بگەیەننە نێو شاری شەقلاوە بۆ ماڵی یەک لە ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی. ئەوانیش لە گوندی (بەرەکە) ـەوە، ئەبوتالب لەگەڵ خۆیان دەبەن بۆ شەقلاوە. چونکە کوڕی ناوچەکەن، بە سەلامەتی دەیگەیننە شەقلاوەو دەگەڕێنەوە. ئەبو ڕەبیع دڵنیا دەکەن کە تەسلیمی شوێنی مەبەستیان کردووە. لە دوای چەند ڕۆژێک، ئەبوتالب لە ڕێگای ڕێکخستنەکانەوە دەگەیەندرێتە هەولێرو، لەگەڵ هاوڕێیان لەنێو شارەکاندا دەست بە کاری ڕێکخستنی نهێنی دەکەن.

لەساڵی ١٩٩١ لە شاری هەولێر، بە ئامادەیی ئەبوتالب و بە ئیشرافی ئەبو فاروق ئەندامی مەکتەبی سیاسیو چەند کادیرێکی

---

١- دانەدۆزە: کاتێک مریشک دەیەوێ هێلکە بکات، بۆ شوێنێک دەگەڕێ هێلکەکەی تێدا بکات.

دیکـە، چەنـد کۆبوونەوەیـەکی حیزبـی ڕێکدەخـەن. لـە کۆبوونـەوەی هـەولێر، هـاوڕێ سـوهێل زەهـاوی (مامۆسـتا کـەمال) کـە لـە سـاڵانی ١٩٧٣-١٩٧٥ سـکرتێری یەکیـەتی قوتابیـانی گشـتی کوردسـتان و، لـە هەشـتاکان ڕابـەری سیاسـی سـلێمانیو کـەرکوک و ئەنـدامی سـەرکردایەتی قـاتعی سـلێمانیو کـەرکوک و، ١٩٩٨-٢٠٠٣ ئەنـدامی مەکتەبی سیاسی بووە و ئێستا لە ژیاندا ماوەو نیشتەجێی وڵاتی نەرویجـە، وەک بەرپرسـێک بەشـداربووە. ڕاسـتگۆیانە زۆری یارمەتیدام لەپێدانی زانیاری و دروستی ئەو تراژیدیایە خیانەتکاریـەی ئـەبوتالب، بـە نیـازی نوسـینەوە و تۆمارکردنیـان. زانیارییەکـانی مامۆستا کەمال، کە خۆی یەک لە کارەکتـەرەکانی نێو ئـەو ڕوداوەیـە، هـەر لـە سـاڵی ١٩٩١-١٩٩٢ بـە موعجیزە لەبـەردەمی چـەقۆی بـەعس ڕزگاری بووە لە شاری بەغدا!

لە ساڵی ١٩٩١ بە نیازی سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی بەغدای پایتـەختو خـوارووی عێـراق، بڕیـار دەدەن دەسـتەیەک لە هاوڕێیـان بنێرنـە بەغـدا کە ئـەو هەشـت هاوڕێیـە بـوون: ئـەبو فـارووق ئەنـدامی مەکتەبی سیاسی، عادل حەببە (ئەبوسەلام)، ئەبو عادل، دایکی بـەهار، ئـەبو یەسـار، ئـەبو عـەلی، جـەلال دەبـاغ، سـوهێل زەهـاوی (مامۆسـتا کەمال).

لـەپێش هـەمویان، ئـەبوتالب دەچێتـە بەغـدا. خانوویـەک لـە گـەڕەکی کـەڕادە بـەکرێ دەگـرێ بـۆ ئیشـوکاری ڕێکخسـتنی حیزبـیو مانـەوە تێیدا. کوڕە ئەفسـەرەکـەی دیداری بۆ ڕێـک دەخـات لەگـەڵ وەتبـانی بـرای سـەدامو مـودیر ئـەمنی عـام، خانوویـەکو سـەیارەیەکی پێدەبەخشن. هاوڕێ سوهێل گوتی: دەمویست ئۆتۆمبێلەکەم بفرۆشـم، هـاوڕێ ئـەبو فـارووق گـوتی: ئۆتۆمبێلەکـەت بـدە بـە ئـەبوتالب بـۆت بفرۆشێ. منیش دام پێی، دوو ڕۆژ دواتر ئۆتۆمبێلەکەی بۆ هێنامـەوە،

کاتێک سەیری ئۆتۆمبێلەکەمم کرد، داشبولو زۆر شوێنی دیکەی دەستکاریکرابوو، وەک شتێکی وەکو دەزگای تۆمارکردنو جاسووسییان تێدا شاردبێتەوە. منیش بە هاوڕێ ئەبو فارووقم گوت: ئەو ئۆتۆمبێلەی من دەستکاری کراوەو گومانم لە ئەبوتالبە. کاتێک ئەبوتالب زانی من لە دەستکاری ئۆتۆمبێلەکەم بە گومانم شەوی دواتر ئۆتۆمبێلەکەم دزراو ئێستاش نەمدۆزیەوە! گومانم لەو دوو گەنجە بوو کە ڕۆژانە چاودێرییان دەکردم، هەڵبەتا بە پێشنیاری ئەبو تالیب!

لە بەغدا، ڕۆژێک هەموومان دانیشتبوین لە خانوەکەمان، ڕادیۆو تەلەفۆن کاریان نەدەکرد، گوتم: ئەو خانووە دەزگای چاودێریو تۆماری جاسووسیی تێیدا جێگیرکراوە. ئەبوتالب ڕەنگی تێکچوو، گوتی لەخۆتەوە ئەو قسە مەکە، چۆن دەزانی؟ گوتم ئەوە نییە ڕادیۆو تەلەفۆن کارناکەن! ئەبو تالب بە دەنگێکی بەرز وەک بیەوێ کەسی سێیەم حاڵی بکات، گوتی: کوا ڕادیۆکەم بدەرێ! منیش ڕادیۆکەم دایەدەستی. تومەز لە شوێنی کۆنترۆڵی دەزگاکە گوێیان لە ئاخافتنی ئێمەببوو، دەزگاکەیان کوژاندبوویەوەو ڕادیۆو تەلەفۆن دەستیان بە کار کردەوە. ئەبوتالب گوتی: ئەوە نییە هەردووکیان کار دەکەن! لە دوای ئەو قسانە، هاوڕێ سوهێل بە ئەبوفارووق دەڵێ: ئەبو تالب خائینەو جاسووسە!

هەموو ڕێکخستنەکان کەوتبوونە ژێر چاودێری چڕی دائیرەی ئەمنی بەعس. زانیاری دروست دەگاتە دەست حیزب کە ئەبوتالب باوەڕپێکراوی ئەمنی ڕژێمە. لە دوای ئەوەی بەرپرسێکی دائیرەی ئەمن لە بەغدا، کە ئیشی لەسەر مەلەفی ئەبو تاڵب کردووە، ڕادەکات بۆ دهۆک بە نیازی ئەوەی لەوێوە ڕابکات بۆ وڵاتی تورکیا. لەوێ، چاوی بە هاوڕێ سەباح کونجی کەوتووەو ئاگادار کردۆتەوە کە

ناوبراو باوەڕپێکراوی ئەمنی ڕژێمە.

بەدەر لەوە، تەنانەت ژوورەکەی ئەبوفاروقیش لە بەغدا، کامێرای چاودێریو تۆماری دەنگی تێدا نەسبکراوە، شەفرەی تایبەتیی مەکتەبی سیاسیو کۆپیی کلیلی ژورەکانو دەرزیلەی دەمانچەکانیان لەبەردەستی دائیرەی ئەمندا بووە.

دوای ڕاپەڕین، حیزب چەند پارچە چەکێکی لە سووریاوە هێنا بۆ هەرێمی کوردستان. بۆ گواستنەوەیان لە کەرکووکەوە بۆ بەغدا، چەند گەنجێکی سەر بە ئەبو تاڵب ڕاسپێردرا کە هەموویان سەر بە دائیرەی ئەمن بوون، لە ڕێگا دەرزیلەی تەواوی چەکەکانیان دەرهێنابوون.

لە ساڵی ١٩٩٢ لە دوای دڵنیابوون لە خۆفرۆشیی ئەبوتالب، هاوڕێیان بیر لەوە دەکەنەوە چۆن بتوانن ئەو هاوڕێیانەی لە بەغدان، لەژێر چەقۆی بەعس ڕزگاریان بکەن و ئەبوتالبیش بگەڕێننەوە کوردستان بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا. ئەوەبوو، نامەیەکی فریودەرانەی مەبەستدار دەنووسن، تێیدا تەماعێکی زۆر گەورە دەدەنە بەر دەزگا داپلۆسێنەرەکانی بەعس. هاوڕێ حەمید مەجید موسا نامەکە دەنووسێ. وە زانراوە کە ئەو کەیسە ڕاستەوخۆ لەژێر چاودێریو سەرپەرشتی خودی سەدام خۆیدا بووە. لە نامەکەدا دەنووسن: دەبێت هەمووتان بگەڕێنەوە کوردستان بۆ ئامادەبوون لە کۆبونەوەیەکی فراوان، بە جۆرێک هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزی بگرێتەوە، چونکە لەنێو ڕیزەکانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی دوو بۆچوونو دوو ئاڕاستەی جیا پەیدابووە، ئاڕاستەیەکیان ڕایان وایە حیزب وەک ئێستا بمێنێتەوەو دژی دەسەڵاتی بەعس درێژە بە خەباتی خۆی بدات، ئاڕاستەی دووەمیش کەوا بە زۆرینە مەزەندە دەکرێ، ڕایان وایە لەو کاتەی

سەربەخۆیی نیشتمان لە ژێر هەڕەشەدایە، پێویستە گفتوگۆ (مفاوەزات) لەگەڵ سەدامو حکومەتەکەیدا بکرێ بۆ دەربازکردنی نیشتمان لەو تەنگەژەیە. لە دوای کۆبونەوەکەش، بڕیارە هاوڕێ حەمید مەجید موساو تەواوی ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو لیژنەی مەرکەزی بچینە بەغدا بۆ ئەوەی لە ڕێگای یەک لە کەناڵەکانی سێیەم گفتوگۆ لەگەڵ سەدامو حکومەتەکەی بکەین!

ئەو نامەیە بە جۆرێک ناردرابوو، بەرلەوەی بگاتە دەستی هاوڕێیان، بگاتە دەستی دائیرەی ئەمن. دیارە ئەوانیش هەموو ئەو نامە گرنگانە کۆپی دەکەنو شرۆڤەی دەکەن. هەر بۆیە دائیرەی ئەمن بەسەرپەرشتیو ئیشرافی سەدام خۆی، لەبەر دوو هۆکار چاوپۆشی لە گەڕانەوەی هاوڕێیان لە بەغدا بۆ هەولێر دەکەن. یەکەم ئەگەر ڕێک بکەون لەگەڵ حیزبی شیوعی، ڕەنگە ئەو گفتوگۆو ڕێککەوتنە ببێتە فریادرەسی سەدامو حکومەتەکەی لەو دابڕانە نێودەوڵەتیەی تێیکەوتووە، بەتایبەتی بەدەستهێنانی پشتگیری حیزبە چەپەکانی دونیا و کۆتەڵە دارزاوەکانی پاشماوەی وڵاتانی سۆسیالیستی بۆ ئەوەی ئەو بەیانی ڕێککەوتنە بکاتە پەشتەمارێک بۆ داپۆشینی عەورەتی خۆی. خۆ ئەگەر ڕێکیش نەکەوتن، ئەوا گرتنی تەواوی ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی لە بەغدا، پارویێکی چەورترە و بۆ یەکجارەکی لە سەرئێشەی حیزبی شیوعی ڕزگاری دەبێت.

ئەو نامە ئامانجدارە، زۆر زیرەکانە ڕێکخراوە. هاوڕێیان بە بیانووی ئامادەکاری بۆ کۆنگرەی پێنج، بڕیاری گەڕانەوە بۆ کوردستان دەدەن، خۆیان ئامادە دەکەن بگەڕێنەوە کوردستانو بەغدا جێبهێڵن. ئەبوتالب یەکەمجار نایەوێت لەگەڵیان بگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام دائیرەی ئەمن پێیدەڵێن بڕۆ لە گەڵیان، چونکە کەسمان نییە دەنگوباسی نێوەڕۆکو بڕیاری نێو کۆبونەوەکەمان بۆ بێنێتەوە،

بۆیە ئەویش خۆی ئامادە دەکاتو لەگەڵ هاوڕێیان دەگەڕێتەوە شەقڵاوە. هەرچەند زۆر درەنگوەخت بوو بۆ ئەو گرتنە، بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە هەر زوو دانی بە هەموو تاوانەکاندا نابوو، بە هاوڕێیانی گوتبوو کاتێک سەیری ئاوێنەم دەکرد وای نیشان دەدام نیوەی دەموچاوم ڕەش ڕەشە! وە ئەوەی پشتڕاست کردەوە کە لەمێژە پیاوی باوەڕپێکراوی دائیرەی ئەمنی بەعسی بووەو ئەو هەموو ساڵانە لە ڕیزی پێشمەرگایەتیو حیزبایەتی، گورگ بووە لە پێستی مەڕدا. هەر بۆیەش لە دەریای تاوانەکانی خۆیدا خنکا!

داخەکەم، ئاخۆ کەی دەبێت ئەو ژیانە لە دار بکەمەوە! بۆ ئەوەی چیتر شەوان ئەو یادەوەرییە تاڵانە وەکو کابووس بەرۆکم نەگرن و وەک تەونی جاڵجاڵۆکە خۆییان لە زەینم نەهاڵێنن! هەر چەند دەکەمو دەکرێنم، لە یادەوەریم بەرنابنەوە خوار!

خۆشبەحاڵی ئەو چاوانەی لە دوای ئێمە خائینانی پێ نابینن! ژانو حەسرەت لە مۆخی ئێسقانەکانم بروسک دەدەن، من نامەوێ ژانەکانی نیشتمانم لە ناخمدا قەتیس بمێنێن و بچنە ژێرگڵ. هەروەک ورچێکی بریندار لەنێو ئازارەکانمدا جینگل دەدەم، نە جامی خەستی شەڕابو نە سەماو هەڵپەڕینی یاران، هەرگیز ئەو خەمانەم بیر نابەنەوە! نەمویستووەو قەتیش نامەوێ وەک پشیلە، فەرخەی ئەو مێژووە شەرمەزارە کوناوکون پێبکەم و، لە نەوەکانی داهاتوومی بشارمەوە، بۆ ئەوەی ئەو واقیعە زەقنەبوتەی کە ئێمە ژیانمان تێداکرد، ئەوان دووچاری نەبنەوە! هەرچەندا، زۆر ڕووداوی خوێناویی دیکەش، تاوەکو ئێستا لە نیهاندا ماونەتەوەو بوون بە پێخوست! ئەوانەشی کە لە بۆتەی ئەوینی خوداناسیدا پاڵێوراونو قاڵبوونەوە، گشت بێنەدەنگ، تەحریمی کەن، تەجریمی کەن، ببڕای ببڕای چیدی قابیلەکان هابیلەکان نەکوژن!

ئێمە باجی سەرکردایەتیەکی پەککەوتەو هەلاهەلاو ڕزیووی وەک داری کرمۆڵمان دەدا، کە توانای سەرکێشی ئەو هەموو مرۆڤەی قاڵبووی کورەی خەباتی چینایەتیو پێشمەرگایەتیان نەمابوو، مەیدانیشیان بۆ گەنجەکان چۆڵ نەدەکرد. ئەوەش هۆکار بوو تۆفانی خوێنە پاکژەکان هەڵبستیو ئەنجامی نەبێ![1]

## کانەبی گچکە

شەهید کانەبی حەمەڕەشید گەڕەشێخانی، هاوڕێی منداڵی و یاریەکانی نێو گوند و قوتابخانە و ڕۆژگاری پێشمەرگایەتیم، ناسراو بە کانەبی گچکە، لە کاتی ڕاپەڕاندنی چەند ئەرکێکی ڕێکخستن و پێشمەرگایەتی، لەگەڵ شەهید ئازاد مەلا قەتەوی ناسراو بە مەلا ئاشتی، بەهاری ١٩٨٨ لەگوندی (گەڕەبەشە)ی سەر بە شارۆچکەی قوشتەپە، سەلاح شینەو تاقمە پێشمەرگەکوژەکەی، بە فێڵ دەیانگرن و تەسلیم بە دائیرەی ئەمنیان دەکەن، کە بەزندوویی مرۆڤیان کەوڵدەکرد. مخابن ئەو دوو پێشمەرگە قارەمانە لەژێر ئەشکەنجەیەکی زۆردا شەهید دەبن، ئێستاش گۆڕغەریبن.

گەر دەمزانی (بەلەبان)ی بەستی شەرغە، دوا مەڵبەندی دیدارمانە، دڵم بەروەستی نەدەدا بەجێت بێڵم و هەیپێی لێبکەم بڕۆم لەبۆ (زینی سەران)! گەر دەمزانی بۆم دەبێتە دوایین دیدار، لەگلێنەی چاوەکانمدا دەمشاردییەوە لە دەست شۆفار!

---

١- سەرچاوەکانی ئەم بابەتە:

١) هەریەک لە پێشمەرگەی دێرین، هاوڕێ سەباح کونجی، هاوڕێ سوهێل زەهاوی (مامۆستا کەمال)، دکتۆرە جومانە القورەوی (شەهلە).

٢) کتێبی: دور و تأثیر الاجهزة الامنیة و المخابراتیة علی حرکة الانصار الشیوعین في العراق، فیصل الفوادي، ط١، دار الرواد ٢٠٢٠، ص١٢٣، ١٢٤.

لەبیرمە پلکە قەدرییە دەیگوت: بە قسەی ئێوە دەکات، ئاواتمە بیکەم بە زاوا، ئەمنیش وەک هەردایکێکی دی، لە ئامێزکەم نەوەی ساوا.

من وەک لاوانەوەکەی ڕەزازی، قەت پێت ناڵێم دە هەستەوە!

نەوەک بکوژ و جەللادت، بە تەشتێک داڵ و ئەستێرەوە، لەسەر کورسی ببینیەوە!

دەترسم برینی جەستەو جێ قامچیانت بکولێنەوە!

هۆ هۆ برام!

ئەگەر زۆرت زەرەر نەبێ، ئەمن ئەوژیانەی ئێستام، بە ئۆغرت دەگۆڕمەوە!

## مەلا جەلال و مامز و زوهرە، کێن؟

ئەگەر هەموو گەڵاوەریوەکانی وەرزی پایز کۆبکەمەوە، بیکەم بە دووتوێی پەڕاوێک، ئەگەر هەموو خاوەن قەڵەمە بوێر و ڕاستگۆ تیرۆرکراوەکان زیندووبکەمەوە، مەگەر ئەو کاتە بتوانم، چەند ڕستەو پەرەگرافێکی ژیاننامەی سێ ڕاهیبی تەرکەدنیا لە پێناوی ئامانجە پیرۆزەکانی هەژاران، وەک گەردەنبەندی قەنەفر، بۆ ملی خوشکە مامزێ بهۆنمەوە. گەر دەتەوێ ژیاننامەی ئەو جۆرە مرۆڤانە بزانی؟ کتێبی خواوەندی هەڵەمووت/ جولانەوەی حەسەن سەباح، ژیاننامەی فیداییە خەسێندراوەکانی بخوێنەوە!

ئەو سێ تێکۆشەرەش خۆیان تەرخانکرد، بۆ تێکۆشان لە پێناوی ئامانجە پیرۆزەکەیان، هەر بۆیە نەپڕژانە سەر ئەوەی بتوانن برا ژن بێنێ و خوشک مێردی بکەن!

ئەو چەند ڕستەی من دەینووسم، لە ئاستی گەورەیی قوربانیدان و تێکۆشانی ئەو خێزانە، شتێکی زۆر بچووکە، بەڵام بۆ ئاسوودەیی

ویژدانم، وەکو فەرزێکی پێنج ئەرکان بەجێبێنم، هەر بۆ ئەوەی لە بەرانبەر تێکۆشەراندا وەباڵی سەرشانم سووکبێت!

بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکەیان، نەغدینەی گیانی خۆیان و چێژی دنیایان پێبەخشی! ئەو مەزنە مرۆڤانە، هەریەکەیان خۆیان کردە، خشتێکی دیواری مێژووی خەباتی هەولێریەکان و گەلەکەیان، وا هەستدەکەم نە دووبارە دەبنەوە، نە کەسیش توانست و لایەقی جێگرتنەوەیانیان هەیە!

خدر عبدالله ناسراو بە مەلا جەلال، خەڵکی گوندی ماجیدی دەشتی هەولێرە، لەنێوەڕاستی پەنجاکان بۆتە شیوعی، هەمیشە خاوەنی ڕاو بۆچوونی تایبەت بە خۆی بوو، بۆیە بەردەوام لەگەڵ بەرپرسەکان بەرکەوتنی هەبوو. لە ١٩٧٩/٥/١٠، لەگەڵ بەڕێزان مام خدر ڕووسی، شەهید سەفەر، ئەبو حیکمەت، لە بەغداوە لە ڕێگای کەریم خانی برادۆست و شێخ جەنگی برای مام جەلال تاڵەبانی، دەگەیەندرێنە سیدەکان، پاشان بۆ نێوزەنگ و نۆکان، لەوێ چەکی شەرەف دەکاتە شانی و دەبێتە پێشمەرگە.

ساڵی ١٩٨٨، لە بارەگای نۆکان و نێوزەنگ، نەخۆشی شەکرەی هەبوو، نەیدەتوانی برنج لە تێری بخوات، بانگی هاواری عەلی کوتکی دەکرد، کە پێشمەرگەیەکی زۆرخۆر بوو، دەیگوت وەرە لەگەڵ من نانی بخۆ! هەر بۆ ئەوەی بەشی خۆی دەرخواردی هاواری بدات!

لە کاتی چوونیان بۆ دەرەوەی وڵات بە ڕێگای ڕووسیادا لە (دۆمەدیخە)ی شاری چوارجووی تورکەمەنستان، زۆری یارمەتی هاوڕێیان داوە وەک، هاوڕێیان عارف و هاوار و زۆری دیکەش.

کاتێک دەگاتە کۆبنهاگن، ئەو بەڕێزانە: ڕێبوار عەرەب، ئەبوحەمشە لە برا ئێزیدیەکانە، مامۆستا هەژار، هاواری عەلی کوتک، یارمەتی دەدەن و بیرەوەریی خۆشیشیان لە گەڵیدا هەیە.

**سەبەند**

ئەو ئامێرەی لە دوای ٣٥ساڵ تەمەن، زانیم ناوی چیە و بۆچی بەکاردێت!

ئای فەرهەنگ و زمانی کوردی چەند دەوڵەمەندە! بە هۆی خۆخۆری و بێ خەخۆرییەوە کۆنەکراوەتەوە، بۆ ئەوەی زمانێکی ستانداری کوردی لێدروست بکرێ!

ئێمە لەو ڕووەوە، هیچمان لە نەتەوە سەردەستەکانی دەوروبەرمان کەمتر نیە. گەلانی دەوروبەرمان چەندان ساڵە کەنە لە کێوی زمانی ئێمە دەکەن و لە ئۆقیانوسی زمان و کولتووری ئێمە وشە هەڵدێنجن، کەچی ئێمە چاو لە مۆڵەق بەدیار دزینی خەرمانی فەرهەنگی خۆمانەوە دەستەوەستان وەستاوین، وەک تەماشاچی لێیدەڕوانین!

پایزی ١٩٨٨ لە دوای پرۆسەی بەدناوی ئەنفال، پێشمەرگە بە تۆمارکردنی چەند داستانێک و قونەشەڕێک لەگەڵ هێزەکانی ڕژێمی بەعس، بەهۆی نابەرابەری لە ڕووی سەربازی و لۆجستی، هەموومانیان بردە سەرسنورەکان، هەندێک ئاودیووی خۆرهەڵاتی کوردستان کراین. من لەپیرانشار (خانێ) گیرسامەوە. بە چاوساغی شەهید سەمەد تیکالۆو خالید غەریب، چووینە نەغەدە، لە پێشانگای ئۆتۆمۆبیل (ماشێن)ی عەبدولڕحمانی حاجی عەلی و محەمەد بەربەیار، ماشێنێکی لەندرۆڤەرم کڕی، کاری کرێی نەفەرم پێدەکرد بۆ دابینکردنی بژێوی منداڵەکانم. شایانی باسە بابم و هەردی براشم لەگەڵ ئێمە دەژیان.

بە پیاوێکی گەڵەگەتی ڕەشئەسمەری چوارشانە ئاشنابووم، تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕیبوو کەوتبووە قۆناغی پیرییەوە، کورتەکوشەرواڵێکی ڕەشی مورادخانی لەبەردابوو، سەعاتێکی

بـــەزریزەی، بەقۆپچـــەی کورتەکەکەیـــەوە هەڵواســـیبوو، شـــەدەیەکی کوردانـەی لەسـەرنابوو، بەڕاستی پایـەی پیاوماقوڵی لـە خـۆی حـەڵاڵ کردبـــوو، لەبەرئـــەوەی هەمیشـــە لـــەنێو چارەســـەرکردنی کێشـــە کۆمەڵایەتیەکاندا بوو، کە لە خۆرهەڵات بەوانە دەڵێن کەیخوداو پیاوی سوڵح و مەسلەتان. ناوی ئەو بەڕێزە حاجی شـەفیع بـوو. مـەڕدارێکی گەورەبوو، مـاڵی لـە پیرانشـاربوو، خـەڵکی گونـدی گردەشـینانی بـەری نـەڵێنی مەنگوڕایـەتی بـوو، مـام حەسـەنی بـرای و کـوڕو برازاکـانی لەگردەشینان خەریکی مەڕداری و کشتوکاڵ بوون، واتا حاجی شەفیع دوومالەکی کردبوو.

ڕۆژێک هات گوتی: کاک حازم با بڕۆین! سەرکەوتین بۆ خیابانی ئیمـام. دوکـانی عەجـەمێکی قەڵـەوی لێبـوو، گـوتی ڕایبگـرە! چووینـە ژوورەوە. ئـەو دوکانـە وەک هـەولێری گوتـەنی (سـەری هـارو مـارێ تێدابوو) پشدەریش دەڵێن (سـەری مـارو مێرووی تێدایـە)، زۆر شـتی کڕی. ئەو بەوشتانەی دەگوت حەواجی ماڵێ، بەڵام دوو ئامێری کڕی ئەمـن نـەمبینیبوون و وە نەشـمدەزانی بـۆچی بـەکاردێن! لـە ڕێگـە، لێمپرسی مام حاجی ئەو ئامێرە ناوی چیەو بۆچی بەکاردێت؟ گوتی: ئەوە پێیدەڵێن سەبەند، دوو سـەگمان هەیـە، هـەردووک توتکـەی یـەک کۆخیشـن خۆبـەخۆیان شـەڕ دەکـەن، بـوون بـە قانـدڕی[1] یـەکتری، چەندجار یەکتریان کەلوکرۆم کردووە، ئەگەر ئەو سەبەندەیان لە ملی بکەین، بەهـۆی ئەو دڕکە تیژانەوە، نـاتوانن شـەڕ لەگـەڵ یـەکتر بکـەن! گوتم مام حاجی من ناوی لغاوو قەڵێتەو دەمبەندو بزموک و گۆلکمژم بیسـتووە، بـەڵام نـاوی سـەبەندم نەبیسـتبوو! پێمگـوت مـام حـاجی زۆرجـار سـەگ لەسـەر خـواردن بە شـەڕ دێن، ئـەو سـەگانەی ئێوە

---

١- قاندڕ: دوو بوونەوەر ئەگەر لەگەڵ یەکتردا هەڵنەکەن و بەشەڕبێن. هەر کاتێک یەکتریان بینی. بەرەنگاری یەکتر بن.

برسی نین؟ گوتی: نەوەڵڵا لە تێر و تەسەلیان غروربوون و چاویان سوور بووە، لەسەر ئەو حاڵەش جوجکانیش دەدزن و دەخۆن، مەگەر ئەو سەبەندە چاریان بكات!

هیوادارم هەموو ئەو وشە پەتی و ڕەسەنانەی زمانی کوردی، کە واتای ڕەسەن و فەرهەنگییان هەیە، نوسەران و خەمخۆرانی زمانی کوردی بیانهێننەوە نێو باوەشی ڕەسەنی دایكی خۆیان.

## سروە، بۆ مەرگی پەڕەسێلكەیەك

ڕێژنەی تەرزە ڕێی نەداوم دەنكە بارانە سوورەكان كۆبكەمەوە! ئاخر بەخۆشم دەترسام، نەبادا لە هەردووك چاوی ئازیزانم، گۆماوی سوور سوور داوەستێ! بەڵام چیبكەم لێمناگەڕێن، هەبدانادەن، دەیانەوێ سكر[1] و بەندی ئەو بەربەستە بشكێنم، عەیامێكە بە غەدری ڕۆژگار قەتماغەی گرتووە!

ئەو ناسۆرە دێرینانە ئەگەر دەربن، ئەو نێوە سەرلەبەر دەكەن بە زووخاو! چڕنووك گرتن لەو قەتماغە نیوەچڵە سارێژانە، هەروا سادەو هاسان نییە، خواردن دەكات بە ژاری مار!

ناتوانم دڵتان بشكێنم، ئێستا كاتی ئەوە هاتووە، بەری گریانە خنكێندراوەكانی ناخم بەرهەڵلاكەم، بەشی هەموو دنیا دەكا ئەگەر بەسەریان دابەشم! ئیدی، چیدی فرمێسك و سووتانی ناخم، لە پسێبەری ئەو غرووره ساویلكەیەم، لە ئازیزان تەقەت ناكەم و ناشارمەوە!

لارە و بلە هاوتەمەن و خزمی یەك بوون، بە ئیجازەی گەورەكانیان، هەرێیان بە یەكتردابوو ئەگەر ڕێگایان پێبدەن و لە

---

١- سكر: ئەو تۆپەڵە قوڕەیە كە بە مەبەستی بەندكردنی ناو. لە دێراو یان جۆگەئاودا دادەنرێ.

دوای ڕەزامەنـدی گـەورەکان، پێکڤـە هاوسـەرگیری بکـەن. لـەو سەروبەندە هەستیارە، باوک و برا پێشمەرگەکەی خاتوو لارە، بەیەک پەت لە سێدارەدران! هەر لە دوای ئەو کارەساتە، باوکی بلەش شەهیدکرا، بۆیە پرۆسەی دروستکردنیماڵەنوێیەکە دواخرا. ڕۆژێک لـە نێـو هەلهەلـەو هەنیسـک و نزگـرەی گریـان، بڕیـاردەدەن هاوسەرگیری ئەنجام بدەن، بۆ ئەوەی تەریک نەمێنن و، بەردەوامی بدەن بە ژیان!

ئێستاکە مانگی زەرەندیی[1] بووکی ژێر تارای قەترانە. پەردەیەک، تەژی لە بۆنسۆو هەڵکڕوزان، هەر بابایە فرمێسکی خۆی لەویدی دەشارێتەوە، ئامێزێکی خەڵەتێنەر بۆ یەکتری دەکەنەوە، مرۆڤ چ بوونەوەرێکی قایمە! چۆن لەگەڵ ئازارەکان ڕادێ!

ڕۆژێکیـان بلـەی دەستوەشـێن، لەگـەڵ لارەی، هـەروەکو دوو بەجێماوی دوای تالان، بڕیاردەدەن بچن بۆ شاخ و ببنە پێشمەرگەی کوردستان. لەو ڕۆژەوە، بلە دەبێت بە هاوڕێی جەنگی و لارەش بە هاوڕێ نایلەخان.

لەو کاتەدا، نایلە[2] دووگیانە، ژورێکی گوندی پەرکانە، بۆ خۆیان دەکەن بە لانە. چەتەوڵەکانی بەعس، ئەوەندەشیان پێ ڕەوا نەدیتن، بە هەردووک چاوی خۆم بینیم، بە ئاڕ بی جی ژورەکەیان لێ ڕووخاندن! نایلەی دووگیان، بۆ سەلامەتی کۆرپەکەی، سەری هەڵگرت بۆ گوندی گەنیاکی ناوشوان، لەوێ کچێک لەدایک بوو، بە ئومێدی سروەی بەیانێکی ئارامتر، ناوی لێدەندرێ (سروە)!

سروە، لە شاخەکانی کوردستان و لەنێو پێشمەرگە هەراش بوو،

---

١- زەرەند: وەکو شەمامکە وایە لە زەویی نیم شین دەبێت و بەرەکەی زۆرە و لە هەندێک شوێن پێی دەڵێن: گووژاک.

٢- مەبەستم نایلەی خێزانمە.

ئەقلی پێش تەمەنی كەوتبوو، خۆشەویستی محمد حەللاق و موحسین یاسین و من بوو. لە دوای حەوت ساڵ پێشمەرگایەتی و كارەساتی كیمیاو ئەنفال، بڕیارماندا هەر هەمووومان سەر هەڵگرین بۆ وڵاتێك، گوللەو سێدارە نەناسێ، بەڵام ئەفسووس، لە دوای سەفەری ڕۆحێكی شەكەت و ماندوو، جەستەیەكی ئەنجنكراو، بە سەر وڵاتێكدا كەوتین، ڕەجم و شەللاق و سێدارە شوناسی بوو!

سروە، سەرباری ئەوەی لەگەڵ دەنگی بۆمب و فڕۆكەو بۆنی كیمیاو سەفەری نێو تێڕی سەرپشتی وڵاغ، لە سۆران و بادینان و وڵاتی ئێران ڕاهاتبوو، تاڵی و سوێری زەمەنێكی پڕ لە ئازاری چەشتبوو، لە هەشت ساڵیدا توشی غوددەی شێر پەنجەش بوو! جەنگیی بە كوڵی خۆی گێڕای، تاران، تەورێز، ورمێ،... لەو كاتەدا، نایلە كوڕێكی دیكەی بوو. لە خۆشەویستی ئاسۆی مامی سروە، ناوی لێنا ئاسۆ. لە بیمارستان دەریان كردو ناچار هێنامانەوە ماڵ. بیرمە جارێك جەنگی بە هەردی گوت: بڕۆ دەرمانی بۆ سروەی بكڕە! سروە گوتی مامە هەردی! خۆتان بە منەوە ماندوو مەكەن، من كە شێرپەنجەمە دەمرم، بەڵام توخوا گەر مردم لەچكە بەریشووەكەم بەسەر گۆڕەكەمدابدەن، دارگوڵێكم لە ژوورسەری بڕوێنن! كاتێك ئەو قسانەم لێبیست، شەرمم لە گەورەبوونم كرد!

ئومێدەكانمان تەزیبوون وەك چلورەی گوێی سوانەكان، نزاكانمان هەر لە ئاسمان شەختەیان بەست، ئەو شەپۆلە چەتوونانە ڕێیان نەدام جارێكی دی، كۆشی پڕ نوقڵ و چوكلێت بكەم! لە وەیشوومەی وڵاتێكی بەستەڵەكدا، پێڵووی چاوەكانی لێكنا. نەمانتوانی دەست بە تەمەنیەوە بگرین، زریان لەگەڵ خۆی ڕفاندی و شەختە بردی!

## ماف و ئەرك

خۆزگە هەموومان سنووری ئەرك و مافەكانی خۆمانمان دەزانی!
لە بەهاری ساڵی ١٩٨٩ ماڵم لە پیرانشار بوو لە خۆرهەلاتی كوردستان، ئەركی بەخێوكردنی نۆ سەر خێزانم كەوتبووە ئەستۆ، سەرەڕای میوانداریش. ناچار ماشێنێكی لەندەوێرم كرِی بۆ كرێ. ڕۆژێك لە پیرانشارەوە دەبوایە سەرنەشین سوار بكەم بۆ سەردەشت، پیاوێكی گەنجی چوارشانە، ڕانكوچۆخەیەكی مەرەزی سووری لەبەردابوو، كڵاشێكی هەورامی لەپێ بوو، هاتە لام و گوتی: ئاغای ڕانەندە هەردوو كوشنەكەی پێشەوە بۆ من دابنێ! گوتم: بەسەرچاو! چوار سەرنەشینی دی پەیدابوون و بەڕێكەوتین بۆ سەردەشت. ئەو پیاوەی بە تەنها كوشنەكانی پێشەوەی گرتبوو هەر زوو پاكەت و شەمچەی لەسەر داشبوڵی دانا و جگەرەیەكی داگیرساند و كاتێك دەیكیشا سەری بەرزدەكرد و دوكەڵەكەی بە شێوەی دو سێ ئەڵقە هەڵدەدایە بنمیچی ماشێنەكە. ئەنگوستیلەیەكی زێڕی گەورەی لە پەنجەی بوو، پشتی دەستی تاتۆی دڵێكی لێ هەڵكەندرابوو، بە تیرێكی سەربەقولابی وەك تیری جومونگی، پێكرابوو!
هەمومان كە گوێمان لە گۆرانیی حەسەن زیرەك گرتبوو و لەپڕ بەكرەیەكی لە گیرفانی خۆی دەرهیناو لە شوێنی بەكرەكەی حەسەن زیرەك خستیە سەری و دیاربوو گۆرانی ئیبراهیم توركی بوو. گوتم ئەو گۆرانیبێژە كێیە؟ هێندە بە تاموچێژەوە گوتی: ئەوە برایمە، چۆن نایناسی!؟ گوتم: ئەوە خەڵكی بەری مێرگانە یان دۆڵی سماقولی!؟ ئەوجا تێیدەگەی چی دەڵێ؟! گوتی: نا نا، خەڵكی توركیایە و تێیناگەم هەر ئاوازەكەم پێخوشە! گوتم ڕاستەدەكەی ئاوازەكەی بۆیە بە

دەمارەکانتدا ڕۆچۆتە خواریێ چونکە کوردیەو دزراوە!

لەوکاتەدا، بۆنێکی ناخۆش و قورسی لە گیرفانی دەرهێنا و بە خۆیدا پرژاند و خۆی هەڵکێشا بۆ بەرئاوێنەی ماشێنەکە و قژی داهێنا، کڵاشەکانی لەپێ داکەند و تەسبیحی بادەدا، وەک لە چۆڵی پیاسە بکات! زۆر دەترسام گوڵینگی تەسبیحەکەی بە لوتم بکەوێ! لاجەولاج[1] دانیشتبوو لاقی خستبووە سەرلاقی و ڕووی کەوتبووە لای من، هیچکەس لە سەر فەرشی ماڵی خۆشی ئەو هەڵگێر و وەرگێرەی بە سەرینی ناکا! بەو هەڵسوکەوتانەی زۆر نیگەران بووم، گوتم کاکە پرسیارێکت لێبکەم؟ گوتی: فەرموو ئاغای ڕانەندە؟ گوتم: بەو جارەیرا چەند جاری دیکە سواری ماشێنێ بووی؟ گوتی: زۆرجار، بۆ وا دەڵێی؟ گوتم: کاکە ئەتو چوارسەد تمەنت داوە بە من، لە بری ئەوە ئەو مافانەت لای من هەیە:

* لەسەر ئەو دوو کوشنیە دانیشی تا دەگەینە سەردەشتێ.

* بۆت هەیە بڵێی تیژ لێ مەخورە.

* ڕایگرە، ئاو دەخۆم، میزدەکەم، سەر و دڵم تێکەڵ دێ! ئەو ڕێگایە، هی دوو کاتژمێرە، بۆ کردت بە سێ؟

بەڵام دڵنیابە نەک بەو چوارسە دتومەنە، ئەگەر بەری مێرگانم هەموو لەسەر تاپۆ بکەی، ڕێگە نادەم بێڕێزیم پێبکەی، بۆیە ئەو پاکەت و شەمچە و بەکرەیەی برایم تاتلیسی بخەوە گیرفانت، کڵاشەکانت لەپێ بکە و بەڕێکی لە سەر کوشنیەکان دانیشە! ئەوانەی پێمگوت هەمووی جێبەجێ کرد، منیش ئەوجار بە ڕوویەکی گەشەوە پێمگوت: ئیستا لێم بپرسە ئاغای ڕانەندە دەنگوباسی کوردان لە عیراقێ چیە؟ ئەوجار گوێ لە کاکی خۆت بگرە بزانە لە حەفتاکانەوە

---

١- لاجەولاج: لەسەرلا، تەنیشت، خوار لەسەر تی- تەنیشت.

تا ئیستا چۆنت بۆ شرۆڤە دەکەم!

## پێخوستکردنی کەرامەت

لەو ڕۆژەدا بە چاوی خۆم بینیم کەرامەتی مرۆڤو کۆدە ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا، بەسەریەکدا شکێندراو نغرۆی تاوانێکی ڕەشی فەتوای کەللەوشکو داوێنتەڕەکانی دەسەڵاتی مەزهەب کرا!

لە پیرانشار (خانێ) بووین. بەخیابانی حاجی سەید برایم بەرەو فلکەی خوای دەچوومە خوارێ. لەنێوەندی ئەو مەیدانە، بەتەنەکەیەکی بریقەدار (الله)یەکیان نوسیبوو، لەسەر پەیژێکی بڵندیان چەسپاندبوو، بۆیە بەو مەیدانە دەگوترا (فلکەی الله!).

کە گەیشتمە ئەو شوێنە، خەڵکێکی زۆر لە نێوەڕاستی مەیدانەکە ڕاوەستابوون، تەختێکی خەوتن دانرابوو پیاوێکی نیوەڕووتیان لەسەر زگ درێژ کردبوو. لە چەند کەسێکم پرسی: ئەوە لێرە چی ڕوودەدات؟ گوتیان: ئەو پیاوە شەللاقکاری دەکەن، واتا جەڵدەی لێدەدەن، بە تاوانی ئەوەی کە گوایا ماوەیەک بەر لە ئێستا لەگەڵ ژنی (ح. ح) کە بەسیج (جاش)ی جمهوری ئیسلامی بوو، بیندراوە و پەیوەندی سۆزداری لەگەڵی هەبووە. وە گوایا جارێکی دیش لەسەر ئەو کێشە کۆمەڵایەتیە گرتویانە و ناوفەکی (ناوپستێری) شەرواریان بڕیوە، کە ئەو کردەیە ئەتککردنێکی قێزەونە لەگەڵ ئەقڵیەتی سەردەم ناگونجێ. منیش تەبای ئەو خەڵکە لە چاوەڕوانی وەستا بووم. کاتێک ئاخوندێک بە قورئانێکو قامچیەک لە ماشێن دابەزی، پۆلیس بەدرەقەیان کرد بۆ لای پیاوە نیوەڕووتەکە، سەڵاواتێکیان لە دیداری پێغەمبەر لێداو بە قامچی کەوتە لێدانی پیاوەکە. هەر کە دە قامچی تەواو دەکرد، هەموو ئامادەبوان سەڵاواتێکیان، بە دەنگێکی بەرز، بۆ

پێغەمبەر لێدەدا. هەتا ٣٠ قامچی لەو شوێنە وەستام. ئیدی بەرگەی تەماشاکردنی ئەو سووکایەتیە بە مرۆڤی کوردم نەگرت، کە لەگەڵ ئەقڵ و لۆژیکی ئەو سەردەمە نەدەگونجا. هەستم دەکرد وەبەرهێنان لە ئاین دەکەن بۆ سوکایەتیکردن بە گەلی کورد!

بەرەو دوکانی مەلا عوسمانی سولەیمانی ڕۆیشتم، کاتێک گەیشتمە دوکانی مەلا عوسمانی، ئەو دیمەنە تراژیدو پڕ ئازارەم بۆ گێڕایەوە، کە لەگەڵ چەمکو تێگەیشتنی ئەو سەردەمەیدا ناگونجێ. ئاخر ئەمن زۆرم باوەڕ بە مەلا عوسمان هەبوو، هەموو گرێی دەروونم لەلای ئەو دەکردەوە، چونکە پیاوێکی نهێنی پارێزبوو.

لەوکاتەدا، سەروبەندی هەڵبژاردن بوو بۆ شورای شار. لە پیرانشار یەک لە کاندیدەکان ناوی عەولا بوو. ئەو ڕۆژە بڕیاربوو لە مزگەوتی میعراج قسە بۆ ئامادەبوان بکات، بۆ ئەوەی بەرنامەی کاری خۆی بۆ ئامادەبوان بخاتەڕوو. مەلا عوسمان گوتی: دەبێت لەگەڵمان بێی بۆ مزگەوت. منیش گوتم من نە مافی دەنگدانو نە مافی قسەکردنم هەیە، نایەم. دیارە مەلا عوسمان دەیویست ئەو خەمەی پێشووم لەبیربباتەوە بۆیە گوتی: دەبێت بێی! منیش گوتم: باشە، مەیلی جەنابتە.

بڕیارمدا بچم وەکو گوێگر دانیشم. چووین، لە مزگەوت دانیشتین، عەولا هات چووە لای میحراب دەستی بە قسان کرد: من عەولام! دەیویست توانستەکانی لە ڕووی خزمەتگوزاری بۆ ئامادەبوان ڕوون بکاتەوە. دیسان گوتی: خزمینە من عەولام! ئاخر ئەو شارە بچوکە هەموو خەڵک یەکتری دەناسی، بەتایبەتی عەولا ڕۆژ نەبوو بە سواری پاسکیلەکەی دوو سێ جار بە بەردەمیاندا تلاسکەی نەکاو تێنەپەڕێ. هاتە سەرئەوەی دەیویست بڵێ لە هەر شوێنێک بۆم دەستنیشان بکەن من کار لەسەر جێبەجێکردنی دەکەم! گوتی: خزمینە

تەماشای کەلێنی ئەو پەنجانەم بکەن، ئەگەر قەڵشێک یان درزێکی ئەوەندەم نیشان بدەن، ئەوجا لە کاکی خۆتان بگەڕێن چۆن گەورەی دەکەمو دەیکەمە دەلاقە! هەردوو باسکی کردە ئەڵقە گوتی: ئەگەر ئەوەندەم لێنەکرد، پێم بڵێن تۆ عەولا نی!

ئەمنیش بە سرتە بە مەلا عوسمانم گوت: ئەمن کە خەڵکی باشوورم، بۆم نیە قسە بکەم، تۆ پێی بڵێ هەموو کەس درزی بچوکی پێ گەورە دەکرێ! ئەگەر دەتوانی هی گەورە بچوک بکەوە، بۆ ئەوەی دەنگت پێ بدەین!

ئەو جارە گوتی: خزمینە هەق دەبێت بڵلرێ. لە جیاتی ئەوەی بڵێ بگوترێ. دیارە دەیویست دەستکاری زمانی کوردیش بکات! ئۆباڵ بە ملم ئەو وشەیە لە داهێنانی عەولایە لە قەبریش ئەو شاهێدیەی بۆ دەدەم!

پاشان گوتی: خزمینە وا نەزانن ئەگەر بووم بە ئەندامی شۆرای شار خۆم لێدەگۆڕێ، خۆم پێ لە ئێوە گەورەتر دەبێت، ئەمن عەولام و هەر بە عەولاش دەمێنمەوە، هەمیشە هەوڵدەدەم عەولایەکەی خۆتان بم، هەر بە عەولاش بانگم بکەن!

هەفتەیەک بوو لەلای مەلا عوسمان دەمگوت: قەتم تۆ پێ عەولا نیە، بە عەولاشت نازانم، ئەتۆ زۆر لەوە بچوکتری عەولا بی، هیچ مەرجەکانی عەولابوون لە تۆدا نابینم، عەولایەتی هێندە ئاسان نیە، بەمرۆڤی وەک تۆ ئەنجام بدرێ! هەتا لەو شارەیدا بژیم لەزاری منت گوێ لێنابێت پێت بڵێم عەولا!

## مامۆستام هاوڕێ عەلی كوتک

چ غوربەتێک لە ناخی مرۆڤدا دەگەڕێ، كاتێک سێبەر هەڵدەوەرێ!
جەستە بۆچی داغون نەبێ، كاتێک سەری لێ ون دەبێ!
گەر قیبلەنومات لێ ون بوو، نە ڕەكات و نە ڕكوعیش بەرناكەوێ!
ڕووخانی پەسارگە و نما و، سووتانی دەفتەرڕابەر و، پەڕپەڕبوونی پەیڕەوی نێوخۆی خێزانێک، كوا قەرەبوو دەكرێتەوە!؟ جۆگەلەیەک خوێن و فرمێسک، وەكو تابلۆ دڵۆپ دڵۆپ، بۆ خوێنەر شیدەكرێتەوە!؟

ئاخر ئەمن چۆن دەتوانم بتنووسمەوە! پەڕ بە پەڕی هەڵوێستنامەو سەرجەلەی نیو سەدەی خەبات، تا دەگاتە هەڵوەرینت لەلای یەكتر كۆبكەمەوە!

عەلی حاجی تاهیر هەللاج، ناسراو بە عەلی كوتک، لە ١٩٢٨ هاتۆتە دونیا. بەر لە پێشمەرگایەتی، ژیانی بە كشتوكاڵ و مەڕداری و هەللاجییەوە بردۆتەسەر.

لە سەردەمی ڕژێمی پاشایەتیی عێراق، كە قۆناغی كۆمەڵگا دەرەبەگایەتی بووە، هەر زوو هەستی بە چەوسانەوەی چینایەتی كردووە، بە دوای ڕێكخستنێكی ئەوتۆدا گەڕاوە خۆی تێدا بدۆزێتەوە، لەگەڵ باوەڕ و هەستە فكریەكانیدا بگونجێت، ئامانجە تاكتیكی و ستراتیجیەكانی، وەڵامگۆی داخوازیەكانی بێت. بۆیە لەگەڵ مامەكانم بوونەتە هەلگری هزری چەپ و ماركسی.

باوكم لە خەباتی چینایەتی و بەربەرەكانێ لەگەڵ كۆنەپەرستی، بۆ بەرەوپێشبردنی كۆمەڵگاو ڕۆشنبیركردنی و دەربازكردنی لە دێوەزمەی خورافیات، ڕۆڵی گرنگی گێڕاوە، خاوەنی قوربانیدانێكی گەلێک زۆرو زەوەندی ڕێگای ئەو ئامانجە پیرۆزەیە و، هەمیشە

سوارچاکێکی قۆچاغی[1] ئەو قۆشەنە[2] بووە.

بە درێژایی ئەو ژیانە قەفاوقەف و پێچاوپێچەی، بەهۆی ملنەدان بۆ چەوسێنەران و بەرەنگاربوونەوەیان، قەت کوچاگری لە هیچ شوێنێک ڕەش نەبووە! هەمیشە بوزگوڕی لەسەرپشتی کەرێ بووە، لەو گوند بۆ ئەو گوند.

لەو گوندانەی کە تێیاندا ژیاوە: گردلانکەی گەورە بناری زورگەزراو. لەو گوندە، لەسەر سوێندخواردنی جوتیارانی دەشتی دزەییاتی هەولێر ساڵی ١٩٥٣، لەگەڵ باپیرم و مامەکانم دوورخراوەتەوە بۆ مەخموور. دوایی بۆ گوندی قوڵتەپە، ئینجا گردلانکەی بچووک، لەوێشڕا بۆ ئۆمەراوە، پاشان گوندی گەڕەشێخان و دواتر قوشتەپە.

زۆر حەزی بە ڕاوکردن بووەو ڕاوچییەکی زۆر کارامە و شارەزا بووە. هەمیشە تاژی مامزکوژی هەبوو. ئەسپێکی بە زین و لغاوی پێ لە ئۆتۆمبێل باشتر بوو. بستەزەوییەک لە بناری زورگەزراو، شەناغە، قەپران و گردەسۆری سیانان نەماوە، ئەسپ و تاژییە مل بەقەرێتەو چوارپەل بە خەنەکانی بابم پێیان لەسەر دانەنابێت!

لەو دەشتە پان و بەرینەی دزەییاتی، پشتڕێ و بەرڕێ، کەم پەرێز هەیە گوێی لە زرینگەی داس و قەیناغ و گۆرانی گازێی عەلی حاجی تایەری نەبووبێت!

قەمتەرە و قۆنگرە[3] و حەسار و دیواری قولغە و سەردەرە دەرگەی کام ئاغای زاڵم هەبوو، جێگەی گوللەی کوڕەکانی حاجی تایەر هەللاج

---

١- قۆچاغ: سوارچاکێکی بە زیبک و نازای مەیدانداری.

٢- قۆشەن: سوپا، لەشکر.

٣- قۆنگرە: مەتەرێز و سەنگەری دروستکراو بە بەرد بە شێوەی بازنە. بەمەبەستی خۆپاراستن یان شەڕکردن.

و لە نێویشیان عەلی کوتک، پێوەنەبێت!

کام تاریکەشەوی ئەنگووستەچاو هەبووە شریقەی تفەنگی حوسێن و عەلی و یاسین، بێدەنگییەکەی نەقەڵاشتبێ و، ئۆخژنی نەخستبێتە دڵی جوتیارە هەژارەکانەوەو سەت جار خۆیان بە قوربانی دەست و تفەنگیان نەکردبێت! کام میلەی زیندانەکانی ئەبوغرێب و موسڵ و هەولێر هەیە، حاجی تایەر هەللاج و کوڕەکانی نەناسنەوە و گەواهی خۆڕاگرییان بۆ نەدەن!

ئێستاش قووببەی دادگای تاوانە قورسەکانی هەولێر، کە بە ناهەق حوکمی قەرەقۆشی هەتاهەتاییتان بەسەردا سەپێنرا، نەعرەتەی ناڕازیبوون و جنێوەکانت بۆ سەرۆکی دادگای تێدا دەزرینگێتەوە. کام قەفەزی مسەلەحەی شورتەی هەیە، بە قۆڵبەستراوی ئێوەی تێنەئاخنرابێت!

سەرەسەدەی کام زەوی هەیە، جێی خشکەی گاسن و قونکە هەوجاڕی، هۆدانەوەی جووتە هێستری تۆی پێوەنەبێت؟ کوا؟ قەرانگ و باوشە مەڵۆی تێلەکێش هەیە، حەیرانت بۆ نەگوتبێت؟ چیغی ڕەشماڵ و کولین و کۆتان[1] هەیە، نەتکردبێتە دوابەندی حەیرانەکانت؟

لەبیرمە، لەگەڵ حوسێنەکوردی قولتەپەی، هەتا بەیانی حەیرانتان بۆ یەکتری دەگووت. بەردەوام لە حەیرانەکانتدا، دەتویست قەراج و کەندێناوەو شەمامک و سەنیەو مرکییە بەیەکەوە ببەستیەوە. لە زورگەزراوی شۆڕتدەکردەوە تەنگانەی جاستانێ و قوناوی گورگەی سەروچاوەی ئاوێ شەعەلی، بیریێ مەحمودی سەنان، سەر ڕێی کۆچ و کۆچباری مامەسێنیان. لە بووکگواستنەوەکان، لە دوای نانخواردنی ئێوارێ، میوانەکان دەیانگووت: کوا عەلی حاجی تایەری بۆ دیار نییە

١- کولین و کۆنان: دوو شوێنە لەناو ڕەشماڵ بۆ کار و بەرخی ساوا گەرم دەکرێت.

بێت کەرەمستانێ بکەین؟ کاتێک دەستەگوڵت لێدەدا، ئەنگوستیلە یان فیشەکە دەمانچەکەت دەردێنا، چاکم لەبیرە ئەو حەیرانەت دەگووت:

ئەنگۆ زەینێ خۆ بدەنێ، گەوارەکی دەهینا چەند ڕەشی تاری،

ڕایدەگرت لە ناوەندی عاسمانێ،

تەڕی دەکردەوە چەولنگی پردێ، بەستێ شاقازی، بانێ قەرەقاچدانێ!

ئەمن دووعایان دەکەم،

ئەوی گەوارەی ڕەشتاری بێئافاتبی لەبەر ئەوی قەلەڕەشمالەی

ئێوارەڕۆژ گەلەک درەنگە، هەڵیاندەداوە لە دۆرێ خانێ!

ئەمن دەچمە سەر برندان زەینێ خۆم دەدایێ،

بەژنێ باریک دەستی خۆی دایتەوە کوتکەکی دار مەرحەم،

چەندە شیرنە دەیکوتاوە کۆزێ کاران، ناوەڵڵا گەرمی دەکردەوە کولین و کۆتانێ!

زۆرجار، بەخۆشیی ئەو حەیرانەی، یەدەگە دەمانچەی چواردەخۆر خاڵی دەکرا!

هەڵوێست و خۆڕاگریت لە کاتی هەواڵی ڕووداوە گورچکبڕەکان، وەک: شەهید بوونی یاسین حاجی تاهیری برات، شەهید کەریمی کوڕت، شەهید حوسێنی براگەورەت، شەهید واحیدی کوڕت و باقی شەهیدەکانی دیکەی بنەماڵەکەمان، کیمیاباران و ئەنفال و هەڵکشان بەرەو سنووری خۆرهەلات، هەمیشە (لاوکی خدری ئۆمەری)یت لەبەرخۆت زەمزەمە دەکرد و دەتگووت:

کوڕۆ کەزەبێ تە پۆلاوۆ، نە حەلیاوۆ نە ڕەڤیاوۆ![1]

لە ساڵی ١٩٨١وە، بە هەموو کوڕ و برازاکانیەوە، ١٢ کەس بووینە

---

١- کوڕۆ کەزەبێ تە پۆلاوۆ، نە حەلیاوۆ نە ڕەڤیاوۆ: کوڕە! جەرگی تۆ پۆلایە نە توایەوە نە هەڵهاتی!

پێشمەرگە. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا، لەو شوێنانە: پەڵکانە، بەستی شەرغە، دۆڵی سماقولی، مەلەکان، هیران و نازەنین، سناوە، ئەشکەوتەو کانی تەلانی چیای هەورێ، سمیلانی ڕوستێ، لۆلان و خواکورک، ڕێزان و بلێ و بارزان، بەری گارە و دەشتی کافێ، گوێزێ و دۆڵەکۆگە، نێوزەنگ و نۆکان ماوەتەوە. لە ١٩٨٨، تەبای ئاوارەکانی دیکەی باشوور چۆتە پیرانشار.

ئەو، عەوداڵ و گەریدەی دوای یەکسانیی وەک خۆرەتاو بوو. لە زۆر کتێب و بیرەوەریی خەڵکانی شۆڕشگێڕدا ناوی عەلی حاجی تاهیر نووسراوەو، وەک شۆڕشگێڕێک ناویان هێناوە. ئەوانەی لە یادم بن: (گوڵەستێرەکان کوژانەوە، - کەریم کاکە)، (دەسترازەی حیکایەتی ئاڵای شۆڕش - حاجی مەمۆ)، (هەڵکشان بەرەو سنوور - چەتۆ بەڕانەتی)، (ڕاپەڕینی جوتیارانی دەشتی هەولێر وەک خۆی).

لە دوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١، ئەندامی بەرەی کوردستانی بوو لە ناحیەی چوارقورنە. لە ڕێکەوتی ١٩٩٣/١/١٨ لە تەمەنی ٦٦ساڵی، بە هۆی خوێنبەربوونی مێشک، بۆ دووایینجار چاوی لێکناو ماڵئاوایی لە ئێمەو برادەرەکانی کرد.

یەک لە تایبەتمەندی تێکۆشەرە ڕاستەقینەکان ئەوەیە، لە ڕووی ماددییەوە، هیچ میراتێک لە دوای خۆی بەجێناهێڵێ، ئەویش، تەنها تفەنگێک و تەزبێحێکی قەزوان و کیسەتوتنێکی بۆنداری لێ بەجێما، تەنانەت بایی کرێی خانووەکەیشی، پارە لە گیرفانیدا نەبوو! بەڵام لە ڕووی مەعنەوی و شوناسی کەسێتییەوە، خەرمانێک لە مێژوویێکی لێوانلێو لە شانازی بە تێکۆشانی، بۆ بەمیرات بەجێهێشتین! لە پێش ئێمە هاوڕێ و برادەرەکانی شانازی پێوەدەکەن، کە بە هیچ گەنجینەی دونیا بەراورد ناکرێ. زۆرجار دەڵێم ئای خۆزگە بمتوانییا بۆ یەک چرکە وەکو تۆبم! هەمیشە شانازیت پێوەدەکەم، بەبیستنی

ناوت گەزگەز باڵا دەکەم! حەزێک لە گیانمدا دەگەڕێ کە کوڕی مرۆڤێکی وەک تۆم! ۱/۱۸ی هەموو ساڵێک، بەڵێن دووپات دەکەمەوە بە موو لە ڕێنوێنیەکانت لانەدەم! بە گەورەیی خۆت بمبەخشە کە نەمتوانی پڕاوپڕ لە کەسایەتی و خەسڵەتەکانی تۆ بم! بەڵێن دەدەم ئەگەر نەشتوانم وەک تۆبم، لە زەمەن و کاتی خۆمدا، لە خەڵکی دەورووبەری خۆم کەمتر نەبم! ڕۆحت شاد، یادت بەخێر! مرۆڤە سپیەکەی نیشتیمان! خەبات و هەڵوێستە بسمیلکراوەکەی جووتیاران! باب و هاوڕێ و مامۆستام، هاوڕێ عەلی کوتک!

## ڕاوێژکار

زستانی ساڵی۱۹۹۵ زستانێکی زۆر سەخت بوو،ماڵمان لە ئۆردوگای (دیڵزێ)ی سەر بە شارستانی خانێ بوو. ئێمە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی کاروباری پەناهەندان بووین، بەرپرسەکەی ناوی ئاغای مرادی بوو. دیارە بە گوێرەی یاسای ئەوێ، هەر پەناهەندەیەک، خەتایەک بکات، سنوورداشی دەکەنەوە. بەڵام دامودەزگا هەواڵگرییەکانی ئێران، ئەو یاسایەیان بۆ مەبەستی خراپی خۆیان قۆستبۆوە لە دژی پەناهەندەکان بەکاریان دەهێنا، هەتاوەکو شەڕی نێوان پارتی و یەکیەتی لە دیووی باشوور گەرمتر دەبوو، ئەوان لەوێ فشارەکانیان لەسەر پەناهەندەکان زیاتر دەکرد، بە هەڕەشەی سنووداشکردن بۆ باشووری کوردستان و نێو کوورەی شەڕی براکوژی، بۆ ئەوەی بە چۆکیاندابێنن و جاسووسییان پێبکەن.

مام سمایلەڕەش[1] یەک لەو پەناهەندانە بوو بڕێک فیشەکی لێگیرابوو.

---

۱- مام سمایلە ڕەش: ناوی ئەسڵیی خۆی نییە و خوازراوە. ئەم بابەتە، یان ئەم ئەزیلەیەلە ژێر کاریگەریی چەواشەکاری و بەلارێدابردنی هاوڵاتییان. لەلایەن

دەزگـای بـاڵای پەناهەنـدان لـە ورمـێ، بەوشـتەی زانیبـوو، بڕیـاری سنورداشـكردنی مـالی مـام سمایلەڕەشـی دەركردبـوو. مـام سـمایل، لـە هەوڵی ئەوەدابوو ڕازییان بكات، هەتاوەكو بەهاریَ مۆڵەتی بدەن.

ڕۆژێک من و كاك مەجید، چووین بۆ ئوموری پەناهەندان، لەبەر پەنجەرەكە وەستابووین. گوێمـان لـە پاڕانـەوەی مـام سـمایل بـوو، بـە مـرادی دەگـوت: تـەنها هـەتا بـەهاریَ مۆڵـەتم بدەن، چونكـە بـەفرێكی ئەستوور لە حاجی ئۆمەران كەوتووە، لە دیوی عیراقیش خانووم نیە. مرادیش دەیگوت: لە دەست مـن نیە ئـەمری ئوسـتانە دەبێت باركـەیَ! مـام سـمایل كـە بێئومێـد بـوو، هاتـە دەریَ. ئێمـەش وەک گوێمـان لـە هەڕەشەی مرادی و پاڕانـەوەی مـام سـمایل نـەبووبێت، لێمـان پرسـی مام سمایل ئەوە خێرە لێرەی؟ گوتی: ئەوە بە مرادیم گوت: ناكریَ من چاوەڕوانی كامیۆن بـم هـەتا لـە ئوسـتانێڕا دێت بۆ باركردنم، چونكـە ئەمن بەپەلەم بۆ ڕۆیشـتن! ئـەوە چەنـد ڕۆژە مەسـعوود بـارزانی، ئـەو كوڕێژگـەی بـرازای بـە ماشـێنەوە ناردۆتـە مـەرزی حـاجی ئۆمـەران، لە چاوەڕوانی ماڵی مندان! مرادیش دەپاڕێتەوە دەڵیَ نابێت بـڕۆی، بۆ من بەرپرسیاریەتی تێدایە، جمهوری اسلامی دەپرسن: مـام سـمایل، چ گلەیی لە جمهوری اسلامی هەیە باردەكات! تكا دەكـەم بـا تووشـی لـیَ پێچینەوە نەبم!

داوا لە سەرۆكایەتییەكانی هەرێم و حكومـەت دەكـەم، تكایە، سـوود لـە بەهـرە و توانـای لـە ڕادەبـەدەری مـام سـمایلەڕەش وەربگـرن بـۆ ڕاوێژكاری!

---

ڕاوێژكارێكی بارزانییەوە، بەناوی (م-ح) نووسراوە، كاتێک وەفدێكی بەغدا، بەمەبەستی ڕادەستكردنی مەلەفی نەوتی هەرێم، هاتبوونە هەولێر. ڕاوێژكار لە جیاتیی ئەوەی ڕاستییەكە بلێ، خۆڵی لە چاوی خەڵک ئەكرد و ئەیگوت كە هاتوون تا سوود لە ئەزموونی بەڕێوەبردنی حكومەتی هەرێم لە خزمەتكردنی هاولاتیانیدا، ببەنەوە بەغدا.

## ئەو پیاوەی کە ببووە باوکمان

یەک لە ڕۆژە نارنجیەکانی پایزی ١٩٩٩... کزەبایەک بەحاڵ فووی لە پشیلۆکەکان دەکرد و لە گۆشە و کەنارەکانی سەر ڕێگا کۆی دەکردنەوە. ئاسمانێکی شین، هێندە شین، هەر لە قولایی دەریا دەچوو. چەند پەڵەهەورێکی سپی، بە وێنەی ڕیشی پەشمەکیی پیاوچاکان، هورەی لۆکەی پەڕەکراو. ڕیزێک گەڵای زەردی ئاڵتوونی، توێژاڵێکی وەکو فەرش، سەر شۆستەکانی شاری داپۆشیبوو.

بازارچەی خانێی خۆرهەڵات، جمەی دێ لە خەڵکی ورمێ و تەورێز و تاران، بەتایبەتی ڕۆژانی پێنجشەم و هەینی، بازارچە پڕە لە کاڵای جوانکاری و ئامێرە کارەباییەکان و پێداویستیەکانی ماڵ، کە بەپشتی کرێکۆڵە کوردەکان لە باشوورەوە دەگوازرانەوە.

ڕۆژی پێنجشەم بوو، کە لای دوکانی مراد دانیشتبووم. گوتم مراد بەیانی دێنەوە بۆ دوکان؟ گوتی بەیانی هەینییە، ئێمە ڕۆژانی هەینی دوکان ناکەینەوە، لەگەڵ حاسڵی برام هەموو ڕۆژانی هەینی دەچینە مەهاباد، بۆ سەرگڵکۆی ئەو پیاوەی ببووە باوکمان!

قسەیەکی سەیربوو بەلامەوە، ئەو جارە پرسیارەکانم بوون بە دوو پرسیار: بەیانی دوکان ناکەیەوە؟ ئەو پیاوە کێیە ببووە باوکتان؟!
مراد گوتی ئەوە زۆر هەڵدەگرێ. ڕۆژێک لە دەرفەتێکدا وردو درشتی ئەوەت بۆ باس دەکەم.

من ئەو ڕۆژە هەر لە خەیاڵی ئەوەدابووم، یەعنی چی ئەو پیاوەی ببووە باوکمان؟! دەرفەت هەڵسووڕا و چوومەوە لای مرادی، گوتم ئەوە هاتووم و بە ورد و درشتی بۆم باس بکە! مراد گوتی: لە خزمەتدام و فەرموو دانیشە با بۆت باس بکەم. ئێمە، خێزانێکی چوار کەسی بووین، بایزی بابم و خەجێی دایکم و من و حاسڵی برام.

ساڵانێکی زۆر بەر لە ئێستا، ئەو کاتە زەمانی شا بوو، ماڵمان لە مەهاباد بوو. باوکم زۆر دەستتەنگ و هەژار بوو، هەموو ژیانی بە کرێکاری و حەمباڵی بەڕێکرد. بەهاران دەچووینە کورەخانەکانی هەمەدان و مەلایر بۆ خشتەبڕین. پایزانیش کاتێک کاری کورەخانە تەواودەبوو، دەگەڕاینەوە سابلاغێ (مەهاباد). بەڕاستی کاری کورەخانە زۆر سەختە، شەوی هەر دەمێنێ کە هەڵدەستن لە خەو. ئەو کاتە من و براکەم زۆر بچووک بووین، دایکم و باوکم هەڵدەستان ملیان بە کارەوە دەنا. دڵیان نەدەهات لە ژورەوە من وحاسڵ بە خەوتووی جێبێڵن، بە نوێنەوە دەیانبردین بۆ سەرئیش و لە تەنیشت خشتە ڕیزکراوەکان کە (فەنەر)یان پێدەگووت، دایاندەناین. لام سەیر بوو کە شەو دەنوستم لە ژوورەوە بووین، کە بەیانیانیش هەڵدەستاین لە ژێر سێبەری فەنەرەکان خۆمان دەبینیەوە! من و حاسڵی برام، ڕۆژ تا ئێوارە لەنێو خاک و خۆڵی ماسە و خاکەستەری کوورەخانە دەگەوزاین، بێخەبەر لە ماندووبوونی داک و بابمان!

دایکم، خەجێی پیرۆتی، زۆر ئازا و بەناوبانگ بوو بۆ خشتەبڕین. هەرچەند دووگیان بوو، بەڵام هیچکات لە پیاوان دانەدەماڵا! کاتێک کچ بووە لە ماڵی بابی، هەر کاری کورەخانەیان پێکردووە. خەجێی دایکم گوتبووی: هەرکوڕێک ڕۆژی پێنج هەزار خشتی نەبڕێ، من مێردی پێناکەم! دیارە باوکم گەنج و ئازا بووە و بۆی چۆتە مەیدانێ و پێنج هەزار خشتەی تەواوکردووە. خەجێی پیرۆتی خاوەنی بەڵێنی خۆی بووە و مێردی بە باوکم کردووە.

دیارە لەو ڕۆژەوە مێژووی پڕ لە ئازار و چەرمەسەری و برسیەتی و بەشمەینەتی دوو مرۆڤی نەگبەت دەست پێدەکات. ئەوانیش بایز و خەجێی پیرۆتین. مرۆڤ هەر لە گێڕانەوە و بیستنی، بێتاقەت و خەمبار دەبێ. هەرگیز ئەو جۆرە ژیانە بۆ هیچ مرۆڤێکی سەر ئەو

هەسارەیە بە ئاوات ناخوازی! باوکم ئەو پارە و پولەی لە کورەخانە پەیدای دەکرد، کاتێک پایزان پارەکەی وەردەگرت و دەگەڕاینەوە بۆ مەهاباد، زۆر بە پەلە بەسەر ئەو کەسانەدا دەگەڕا کە زستانێ قەرزی لێکردبوون و قەند و چا و حەواجی ماڵێی بە قەرز لە لای هێنابوون. زۆر جار هیچی بۆ نەدەمایەوە بەڵام کاتێک لە ماڵەوە لەسەر گازی پشتێ ڕادەکشا، دەیگوت: ئۆخەی خەجێ، ویژدانم ئاسودەیە قەرزی خەڵکم دایەوە! بەڵام ئەوەی لەسەر قوژبنی دڵم بۆتە گرێ ئەوەیە کە بۆ جارێکیش نەمتوانیووە بڵێم با بچینە شار و دوو دەست جلی جوان و بە دڵی خۆت، بۆ خۆت و منداڵان بکڕی! بەیانی داشقەی دێنمەوە مەیدانی شاری و بەشی خەرجی ئێوە پەیدادەکەم، خوا کەریمە!

هێندێ جاریش لە کورەخانە دەیگوت: ئەوساڵ ئەگەر لە دوای قەرزان شتێکم پارە بۆ مایەوە، کۆتێکی[1] گەرم دەکڕم و تایەی داشقەکەم دەگۆڕم، ئەگەر تایە و بۆڵبەرینگەکانی نوێ بێت، هێندە تاقەتی شان و پیلانی ناوێ و بە ئاسانی بۆم پاڵ دەدرێ و ڕێ دەکات.

ئەربابی کورەخانەکەمان ناوی غولام ڕەزا پاشالوو بوو. ڕۆژێک گوێی لە بابم بوو کە دەیەوێ کۆتێک بکڕێ، غولامڕەزا پاشالوو لە مالی خۆیانڕا کۆتێکی کۆنی دەستی دووی خۆی، کە بۆی بچوک ببۆوە، بۆ هێنا. باوکم لە کورەخانە هێندە کز ببوو، کۆتەکە بۆی گەورەش بوو، بەڵام زۆری بە دڵ بوو. باوکم دوعای زۆر بۆ غولامڕەزا پاشالووی کرد. پاش هەموو نوێژان لەبەر خودا دەپاڕایەوە خوا دەست بەباڵیەوە بگرێ، سەد هێندە ماڵ و سەروەتی بداتێ، خودایە قەت نانی کەم نەخوات، خودایە ماڵ و منداڵی بپارێزە، یاخوا

---

١- کۆت: سەربەگ، قاپووت، قەمسەڵە.

ئێسکی بە ئاگری جەهەندەمێ نەسوتێ و....

ڕۆژانی هەینی لە کورەخانە پشووە. غولامڕەزا پاشالوو بە باوکمی گوت: بەردەرگای کوورە پاک بکاتەوە. باوکم لە جیاتی پشوو بدات، ئەو ڕۆژە تا ئێوارە لەتکەخشتەی کۆکردنەوە و فڕێیدان. ڕۆژەکارێکی دیکەشی بۆ کردبوو. لە کۆتایی هەفتەدا کاتێک بڕێک پارەی بۆ خەرجی ڕۆژانە لە غولامرەزا پاشالوو وەرگرت و گوتی: ئاغا پارەی ڕۆژانەی هەینی تا ئێوارە کارم کردووە و کرێی ڕۆژێکی دیکەشت لایە! ئەرباب گوتی: ئەو دوو ڕۆژەم بۆ وەبەر کۆنەکۆتەکەی خۆم خستووی. زۆر زیاترم پێدابوو، قەیناکە تۆ هەژاری، هەمووت لێوەرناگرمەوە دەنا قەرزداریش دەبیتەوە! بابم زۆر دەهری ببوو. بەڵام هیچ دەسەڵاتی نەبوو، لە بەرانبەر ئەربابەکەی و ئەو بێویژدانیەی لەبری ئەو کۆتەی کردی. باوکم لە ماڵ لە چۆکی خۆی دەدا و دەیگوت: خەجێ تەنها پەرۆشی ئەو هەموو دوعا کەسک و سۆرەیمە دوای نوێژان بۆ ئاغام دەکرد. ئەو هەموو ئایەتولکورسیەم دەخوێند. تۆ بڵێی خودا ئەو هەموو دوعایانەی قەبوڵ کردبێ؟! هێندە بە دڵ ئەو دوعایانەم بۆ دەکرد، وامزانی بەزەیی پێمدادێ، نەمزانی دەیەوێ ئەو کۆتەکۆنەم بە کرێی دوو ڕۆژ کارگەری پێ بفرۆشێتەوە!

دایکم خەجێی پیرۆتی، دووگیان بوو، بەڵام تاقە یەک ڕۆژ پشووی نەدەدا، هەمیشە لە مەیدانێ لەگەڵ باوکم خشتەی دەبڕی. هێندە قالبی خشتی پێنج خشتەیی بە زگی خۆی دەچەسپاند، منداڵەکەی نێو زگی مردبوو. کاتێک لە مەیدانێ دایکم کەوتە سەر زەوی لە هۆش خۆی چوو، ژنانی کورەخانەکە دەوریان دا، ئاخر هەموویان دایکمیان زۆر خۆشدەویست، دەیانگوت خەجێی پیرۆتی ژنێکی سالار و کەحێلە!... دایکم بۆ ئێمە دایکێکی ماندوو و شەکەت و ئەو گاتا و سروتە بوو کە مانای بە ژیانی ئێمە دەبەخشی!

بەهەرحاڵ، گەیاندیانە شار و لە نەخۆشخانە نەشتەرگەرییان بۆ کرد. منداڵەکەیان بە مردووی لە زگی دەرهێنا، بەڵام بۆ خۆیشی هێندە خوێنی لەبەر ڕۆیشتبوو، بۆ شەوێ گیانی سپارد. ئای کە شەوێکی ناخۆش بوو، ئای کە شەوێکی درێژ بوو! قەت ئەو دیمەنەی بابم بیرناچێتەوە بە بیستنی هەواڵەکە بە هەردوو دەستی بەسەر و پوتەڵاکی خۆیدادەدا، دەتگوت ئاگر لە هەناویدا کراوەتەوە و بۆی ناکوژێتەوە، پڕ بە قورگی دەیگوت: خەجێ ماڵت لێ وێران کردم، ئەو دو تفارەت بۆ کێ بەجێهێشت؟ بۆ تەنهات کردم؟ خەجێ گیان مردنت لە غەریبی زۆر بە ئازارە ژنە زەحمەتکیشەکەم! ژنە سەلارەکەم! ڕۆژێک نانێکت لە تێری نەخوارد، کراسێکی بە دڵی خۆت لەبەرنەکرد، بۆ ڕۆژێکیش بەئاسوودەیی نەخەوتی! ئەو ڕۆژگارە زاڵمە دەرفەتی نەدام ژیانێکی شایستەت بۆ فەراهەم بکەم، ئێستا قوڕی کوێت بۆ وەسەرکەم؟ جەنازەکەت چۆن بەرمەوە کوردستان؟

بە تێڕامانی من، مرۆڤ سەرسەختترین بوونەوەری سەرزەوییە! لە دوای بینینی ئەو هەموو نەهامەتیە، لە ژیانی ئاسایی خۆی ناکەوێ. لەدەستدانی دایکم فریادێکی خنکێندراوە بۆ هەمیشە، زریکەو هاوارێکە لە قووڵایی ڕوحمدا، لە پانتایی دەروونمدا، هەرگیز ئەو ڕووداوەم بۆ فەرامۆش ناکرێ و لە یادەوەریم نابێتەوە!

لەسەر وەسیەتی دایکم کە داوای کردبوو لە گۆرستانی سوڵتان بوداغی شاری مەهاباد بینێژن، جەنازەی دایکمیان لەسەر مینەبوس دابەست و باوکم دەستی ئێمەی گرت و سواری مینەبوسەکە بووین بەرەو مەهاباد. تەواوی ئەو شەوە بەڕێوەبووین. ئێمە خەوتبووین. کاتێک باوکم ئێمەی لە مینەبوسەکە دابەزاند، سیوادی دابوو. سە و گورگ لێک دەکرایەوە. ئەوەندە دەزانم بەردەرگای ماڵی ئامۆزایەکی دایکم بوو کە ئێمە بە پوورئامان بانگمان دەکرد. جەنازەی دایکمیان

لەسـەر مینەبوسـەكە دابەزانـد و لـە مزگـەوت نـوێژی مردوویـان لەسـەركرد و بـەرەو گۆڕسـتانی سـوڵتان بـوداغ بـەڕێیان كـرد. لـەو ڕۆژەوە بۆ من و حاسڵی برام، ژیانێكی وەكو هاوتەمـەن و منداڵانی ئاسایی بۆ ئێمە مەیسەر نەبوو. تاكو هەفتەیەك، ئێمەیان زۆر بەناز بـەخێوكرد، دەیـانگوت سـەغیر (هـەتیو)ن. مـەلای مزگەوتەكـە، كۆڵكەمەلایەكی خزمـی دایكـم بـوو، دەیگـوت: منـداڵی سـەغیر ئەگـەر دەستی چەوریشیان بەسەردا بسرِیەوە، خێرت دەگاتێ، چونكە ئـەو سەغیرە وا دەزانێ لە خۆشەویستیان دەست بەسەریدادەهێنی. بۆیە، ئەو چەند ڕۆژە هەرچی بەڵاماندادەهات دەستی بەسەریدا دەهێنـاین و نـازی دەداینـێ. لەگـەڵ تـەواوبوونی تازیـە و سەرەخۆشـی دایكـم، نازهـەڵگرتنی ئێمـەش تـەواوبوو. ئـەوەی تـەواو نـەبوو تـەنهایی و پەریشانی باوكم بوو. باوكم ئەو تۆزە تەسكینییەش كە هەیبوو بە هۆی ئێمە بوو كە دەیگوت مراد و حاسڵ یادگاری خەجێن و بۆ من جێمـاون، دڵخۆشـكردنی ئـەو دوو كـوڕە، ئاسـوودەكردنی ڕوحـی خەجێیە!

دوای ئـەوەی سـێ ڕۆژ پرسـەكەی دایكـم تـەواوبوو، سـێ چـوار ڕۆژیـش خـەڵك تـاك و تـەرا لـە دوورەوە دەهـاتن. ئـەوەی لـەبیـرم ناچێتەوە دوو كەس لە دەشتی شارویرانیرا هاتبوون، بەرلەوەی بچنە ژووری، یـەكێكیان بـەوەی دیـكەی گـوت: حەمـەد بـۆ نـەهاری لـەكن بایزی نامێنینەوە، ئەو بۆخۆی لەسەر سەروگوێلاكی خزمەكانیەتی، لە هـەژاریان بكـۆخێ دۆخینـی دەپسـێ! خـۆ دەزانـین كـە بـایز پیـاوێكی نانـدەرە، بـەڵام هـەژاری پشـتی شـكاندووە، بـا توشـی شـەرمەزاری نەكـەین، فاتیحەیـەك دەخـوێنین و هەڵدەسـتین، ئەگـەر پەلـەیان كـرد دەڵێین لە شوێنێكی دی هەرێمان داوە.

وای تەواوبوونی سەرەخۆشی، ڕۆژێك بابم دەستی ئێمەی گرت و

چووینە سەرگۆڕی دایکم، هەندێک تەتۆکە و پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ و فەخفوری و ژێرپیاڵەی شکاوی هێنابوو بۆ جوانی لەسەر سینگی گۆڕەکەی ڕیز کرد. ئەو سەردەمە ئەو جۆرە جوانکاریە باوبوو بۆ گۆڕەکان... پەڕۆکەکانی لە کێڵەکەی ژوور سەری پێچایەوە، فاتیحای بۆ خوێند گوتی: چبکەم پارەم نیەو کەسیش بە قەرز خەتمی قورئانی بۆ ناکات، دەنا خەتمێکم بۆ دەکرد، گەردنت ئازابێت ژنە زەحمەتکێش و ماندووەکەم! ئای کە نایبینی نەبوونت چۆن باڵی شکاندوم! قەت وەک ئێستا دەستەوەستان نەبووم خەجێ! نازانم من بەو دوو منداڵە سەغیرەوە ڕوو لە کوێ بکەم! خەجێ! ئەمانەتی ئەو چاکوپیرانەت دەکەم. لەسەر دڵم بۆتە گرێ، قەراربوو بتبەمە زیارەتی شێخی بورهانی، بۆم جور نەبوو، ئەو ئاواتەت بردە ژێرگڵ و برینەکەشت بۆ ئەبەد خستە سەردڵم! قەت لە خۆم نابوورم کە بازنەو گوارەو تەنانەت حەلقەی پەنجەت فرۆشت بۆ ئەوەی هێندەی دی من شەرمەزاری منداڵەکان نەبم! خەجێی خۆم! ئای چەندە شوکرانەبژێری ئەو ژیانە سەخت و ناخۆشە بووی کە لەگەڵ منت بەڕێکرد! هەمیشە دەتگوت: بایز لە دوای تەنگانان فەرحانی هەیە، هەموو هەورازێک نشێوێکی لە دواوە هەیە، ئێمە دەبێت خۆڕاگر بین و نابێت دەستان بەخۆدا شۆڕبکەینەوە و تەسلیمی ئەو زروفە تاڵە بین!

هەموو ئەوانە وایان لە باوکم کردبوو بە دوای پرسەی مەرگی خۆیدا دەگەڕا. لە سۆراغی تیکەنانێک نەغرۆی تاڵاوێک ببوو کە شایەنی هیچ مرۆڤێکی سەر زەوی نییە. بابم هەمیشە دەیگوت: باوەڕ ناکەم ژنێک هەبێت وەک خەجێ دەستباری ئەو ژیانە سەختەو ئەو ڕۆژگارە مەلعوونە لەگەڵ هاوسەری خۆی بگرێ!

باوکم دەستی ئێمەی گرت و گوتی: منداڵینە با بڕۆین ڕۆژمان درەنگ کرد! حاسلی برام دەستی لە دەستی باوکمەوە بوو و باوکم

بە دوای خۆیدا پەلکێشی دەکرد. ئەویش زوو زوو ئاوڕی دواوەی دەدایەوە، وەک بییەوێ دایکم بەجێی نەهێڵێ! حاسڵ بە باوکمی گوت: بابە ئەی دایکم؟ دایکم نایەتەوە؟

باوکم گوتی: تا تۆ گەورە نەبی دایکت نایەتەوە!

حاسڵ گوتی: ئاخر دایکم نەیەتەوە ئەمن کوا گەورە دەبم؟!

باوکم گوتی: دەبێت بچینەوە هەمەدان بۆ ئەوەی حیسابی کارەکەمان لە غولامرەزا پاشالوو وەربگرین.

کاتێک چووینەوە هەمەدان بۆ کورەخانە، ڕۆژی دواتر کاتێک باوکم لەگەڵ ئەربابەکەمان حیسابیان کرد. هیچی وای بۆ نەمایەوە، چونکە ئەو نەشتەرگەری و دەرمان و ناردنەوەی جەنازەو زۆر شتی دیکە هەمووی نووسیبوو، پارەکەی گێڕایەوە، شتێکی وای نەدایە باوکم، بەو حاڵەشەوە منەتی بەسەر باوکمدا دەکرد: ئەگەر لەبەر ئێوە نەبووایە خانەوادەیەکی دیکەم دەگرت، ئێوە کارەکەی منتان زۆر دواخست! باوکم لەبەرخۆیەوە دەیگوت: چتۆ ناوی دوورو درێژی زەوت کردووە: غولامرەزا پاشالوو! یەکێک نەیناسێ دەڵێ باوکی هەژارانە و لوقمەی حەرام ناچێتە زاری!

گەڕاینەوە مەهاباد، باوکم داشقەکەی لە ماڵە خزمێک دانا بوو، دەریهێنا و ئێمەی سوارکرد. چوو لای دووچەرخەسازی، تایە و بۆڵبەرینگەکانی گۆڕی. ژوورێکی بچوکی سەرگڵی بەکرێ گرت. ئێمە لەو ژورە بچوکە دەژیاین. چونکە بچوک بووین، باوکم دڵی نەدەهات ئێمە لە ژورەوە بە تەنها جێبێڵێ، زۆرجار سواری داشقەکەی دەکردین و کاری گواستنەوەی پێدەکرد. گەر باری داشقەکە گران بووایە، من، لە براکەم هەراشتر بووم، لە دوای باوکم بە پێیان دەرۆیشتم، حاسڵی براشم لەسەر داشقەکە سوار دەبوو.

شەوان زۆرمان سەرما دەبوو، بە نۆرە پشتمان بە سینگی

باوکمانـەوە دەنـاو دەچووینـە ئـامێزی بـۆ ئـەوەی گـەرم بینـەوە. بـابم نەیــدەزانی، نــە بــە کــاری پەیــداکردنی بژێــوی خــەریکبێ، نــە بەپاککردنـەوەو پـەروەردەکردنی ئێمـە. هەمیشـە دەیگـوت: لـە دوای خەجێ ژنی هـەموو دنیا لـە من حەرامە. منداڵـەکانم تووشـی زڕداێک ناکـەم. ئـەوجا بـاوەڕ ناکـەم، ئـەوەی خـەجێ لـە منـی قـەبوڵ دەکـرد و شـوکرانەبژێری ئـەو ژیانـە سـەختە بـوو، ژنـی ئێسـتا بەرگـەی بگـرێ! باوکم بە درێژایی ژیانی هەرگیز لە ژێر سێبەری ئـەو دنیا بێڕەحمـە، بـە زگـی تێـر و خاترجـەمی دانەنیشـت! دێوەزمـەی قـاتوقری، وەک کابوس و قەلەڕەشـە خـۆی بەسـەرمانداکێشـابوو. نێو لـەپی بـاوکم، بە هـۆی کـار و سـەرماوسـۆڵەوە، هەمـوو قـەڵش قـەڵش ببـوون. هەمیشـە ئەو کاتەی دەستی بـە دەموچاومانـدا دەهێنـا بـۆ شـۆردن، دەسـتەکانی هێندە زبر ببوون دەتگوت کارتێخ بـە دەموچاومانـدا دێنـێ! فەلـەک بـە نازکێشانیش برینداری دەکردین!

ئێمـە تۆزێـک هـەراش ببووین. بـاوکم لەبەرئـەوەی توشـی نەخۆشـی سـیل ببـوو، کاتێـک هەناسـەی دەدا، خرەخـڕ لـە سـینگی دەهـات. بـە جۆرێک کز و بێهێـز ببـوو، چیدی نەیدەتوانی ئێمـە لەسـەر داشـقەکە بگێـڕێ و کـاریش بکـات، بۆیـە ئێمـەی لـە مـاڵێ جێدەهێشـت و بـە هاوسێکانی دەگوت بە خێراخۆتان چاوێکتان لێیان بێت!

ژوورەکەمان زۆر ساردوسر بوو، لـە کـاتی بـەفر و بارانـدا، شـەو و ڕۆژێـک دوای بارانبـارین، بـۆنکەڕووی لێدەهات. سـەربانەکەمان هـەر دڵۆپـەی دەکـرد. ئـای کـە بیـرم دێتـەوە دەبینـم ئـەو دنیایـە زۆر بـە ڕوومانـدا دڵـڕەق بـوو، ئـەو ئازارانـەی دووچارمـان دەبـوو لـە تاقـەتی ئێمــەی منــداڵ بــەدەر بــوو. هــەرگیز ئــەو ڕۆژگــارە مەلعوونانــە لەبیرناکرێن!

باوکم هێندە کز و لاواز ببوو، تاوەکو داشقەکەی دەگەیاندە بازاڕی

ئاردی، دوو سێ جار دادەنیشت. کەس کاری پێنەدەکرد، دەیانگوت نەوەک بە ملماندا ساغ بێتەوە و بمرێ!

لە رۆژێکی ساردو شەختەو بەند، دارو بەردی لێک بەستبوو، چلوورەی گوێسوانەکان هەتا سەر زەوی داکشابوون. ئەو سەردەمە گیانبرژێنەی کە ئێمە تووشی هاتبووین، کەڵی دوولا دەهێنایەوە! کەم کەس هەبوو بەرئاگردان و کوورەکان بەجێ بهێڵێ و سەر وەدەر بنێ، مەگەر یەکێکی وەکو باوکم بۆ گەڕان بە دوای ناندا!

ئەو رۆژگارە، زەردەخەنەیەکی بۆ هەموو سەردەمی منداڵیی ئێمە بە رەوا نەبینی، ئەو باوکەی کە جێگای دایکمی بۆ گرتبووینەوە، ئەو باوکەی کە هەرگیز نەیتوانی مەڵۆی ئەو هەموو ئارەقەی رشتی، بچنێتەوە، ئەو باوکەی دەستە قەڵیشبووەکانیشی بۆ ئێمەی منداڵ گڕو تین و ئومێد بوو، رۆژگار ئەوەشی هەر پێ زۆر بوو و دیمەنێکی وەک تابلۆی لەسەر بەرد هەڵکەندرابێت، بۆ ئەبەد لەسەر روحی من هەڵکەند! ئەو دیمەنەی قەت لە بیرم ناچێتەوە، یەک لە هاوسێکانمان داشقەکەی باوکمی پاڵ پێوەدەناو بەرەو ماڵ دەیهێنایەوە، چاوی بە ئێمە کەوت، وەک گۆزەی سەرەونخونکراو ئاوی لە چاوان هاتەخوارو گریا. داشقەکەی راگرت و دەستی ئێمەی گرت، گوتی: وەرن بچینە لای باوکتان. ئەو کاتەی ئێمە چووینە مزگەوت، لەسەر تاتەشوار لاشەی بێگیان و ساردوسری باوکمیان دەشۆرد! لەو کاتەی باوکمیان دەشۆرد، پلیکانەکانی پەراسووی، لە گوناهی برسیەتیدا ببوونە قەفەزێک بۆ زیندانیکردنی خۆزگە و ئارەزووەکانی! باوکم هێشتا مووی لێ سپی نەببوو. بەڵام بەرداشی ژیان وای هاڕیبوو دەتگوت پیرێکی هەشتا ساڵەیە! کۆچی دوایی باوکم وەک ئەوە وابوو بەرەی لەسەر هەتیوان لابەری و بکەونە ئەو گۆڕەی. فرمێسکم زۆر داباراند، زۆر زگم بە خۆم و حاسڵی برام سووتا. لە ناخی دڵمەوە رووم لە ئاسمان

کرد و گوتم خودایە ئێمە بەو تەمەنە بچووکەوە، کەی کاتمان هەبووە ئەو هەمووە بەدبەختیە کۆبکەینەوە!؟ زۆرمان فرمێسک داباراند، زۆر شیوەنمان کرد، بەڵام مردوو کوا بە شیوەن زیندوو دەبێتەوە؟ نە پرسە و نە سەرەخۆشی. کەسێک نەبوو پێی بڵێن ئەتۆ خۆش و تەمەنی بۆ تۆ جێهێشتبێ!

ماڵێکی خواپێداوی زۆر دەوڵەمەند لەو گەڕەکە بوون. کوڕێکی گەنجی بیستو دوو ساڵەیان هەبوو، ناوی کاک کەریم بوو، خوێندەوار بوو. وەلێ خوێندنی تەواونەکردبوو. کاک کەریم بۆ ئەوە لە ژیاندابوو جیهانی خۆی و خەڵکانی دیکەش ڕۆشن بکاتەوە. لە بوون و حەقیقەت تێگەیشتبوو. بەها و نرخی مرۆڤبوونی خۆی نەدۆڕاندبوو. مرۆڤدۆستی، لە بەهاری بلوغیدا پشکوتبوو. زۆر مرۆڤی بڵندڕەگەزو پاکم دیت، بەڵام نەک بەو ئەندازەیە. ئەوانەش کە لە بۆتەی ئەوینی خوداناسیدا قاڵ بوونەتەوە، هەرگیز بەو پلەیە ناگەن. ئەو سۆفیانەی جەزم دەبن و لەسەر خۆڵی وشک مەلە دەکەن، هەرگیز بەو پلەیە ناگەن.

دەستی من و براکەمی گرتو ئێمەی بردەوە ماڵی خۆیان. باوکی کاک کەریم خەریکی بازرگانی بوو، پیاوێکی سوورەی چاوشینی کەڵەگەت، ناوی حاجی شەفیق بوو. کاک کەریم، هەردووکمانی لە گەرماو شۆرد و جلی نوێشی بۆ کڕین. کاک کەریم، دیاربوو دەیویست شاباڵی بەزەیی و بەخشەندەیی بەسەر ئێمەدا بکێشێت و جێگەی دایک و باوکمان بگرێتەوە. وە بۆ ئەوەی نەکەوینە سەر شەقام. هەوڵی دەدا بە باشترین شێوە پەروەردە و ئامۆژگاریمان بکات. شەوان چیرۆکی منداڵانەی بۆ دەگوتین تاوەکو خەومان لێدەکەوت. هەرگیز ماڵ و شوێنێکی وا خۆشمان نەبینیبوو. ژوورەکان گەرم و ڕووناک، ئەو هەموو گڵۆپە کریستاڵیە گرانبەهایانە ئەو

ژوورانەیان دەکردە چراخان. چێشتی گەرم و پڕ لە گۆشتمان دەخوارد، لەنێو نوێنی گەرمدا دەخەوتین. تاوەکو هەفتەیەک، مام حاجی شەفیق زۆر میهرەبان و باش و بەبەزەیی بوو لەگەڵمان. لە دوای هەفتەیەک مانەوە لەو ماڵە، مام حاجی بە کاک کەریمی گوت: کوڕم هەتاکەی بەتەمای ئەو منداڵانە بە من بەخێو بکەی؟ ئەگەر خێرە، ئێمە خێری خۆمان کرد بە زیادەوە! کاک کەریم گوتی: بابە ئەو دوو تفارە کەسیان نیە، ئێمە وێڵیان بکەین لە دوارۆژ خودا دەزانێ دەبنە چ بەڵایەک بۆ کۆمەڵگا!

کاک کەریم دەیویست خەیاڵ و خەون و خولیاو هەموو هەستەوەری ناسکی گەنجانەی بکاتە قوربانی گەورەکردن و پەروەردەکردنی ئێمە، کە هەر واشی کرد. ڕۆژ بەڕۆژ پەیوەندی لەگەڵ مام حاجی باوکیدا خراپ و خراپتر دەبوو، هۆکارەکەشی تەنها ئێمە بووین. دوو منداڵ لەسەر شانی ببوونە سەربار. لەو ڕۆژگارە، خەڵک منداڵی خۆی لێ بەڵا بوو، چ جای منداڵی خەڵک!

هەر چەند جارێک دەبوو بە کێشە لەنیوان کاک کەریم و باوکی، ئێمە باریکەمان دەدایە و دەچووینە هۆڵەکەو هەڵدەکورماین. من دەمزانی ئەو کێشەیە لەسەر ئێمەیە بەڵام حاسڵی برام بچوکتر بوو. هۆشی ئەوەی نەبوو. هەستم دەکرد ئێمە بووینە هۆکاری تێکچوونی نێوان ئەو باب و کوڕە. گوێم لێبوو مام حاجی دەیگوت: کوڕم کەس نازانێ ئەسڵ و فەسڵ و ڕەچەڵەکی ئەو منداڵانە چیە، منداڵی خەڵکیی لە برسامردوو، بەمن بەخێو مەکە! کاک کەریم دەیگوت: بابە ژیانی منداڵە ڕەشوڕووت و برسیەکانی هەژارێک، دروست هێندەی منداڵی سەرمایەدارەکان لە لام نرخ و بەهای هەیە!

دیاربوو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەیوەندی باوک و کوڕ بەرەو خراپتر دەچوو. کاتیک کاک کەریم هاتە هۆڵەکە ئێمەی بینی کە سەرمان

خستۆتە بەینی ئەژنۆکانمان و چاوەڕێی یەکلابوونەوەی چارەنووسی خۆمان دەکەین، دەستی گرتین و بردینە ژوورەکەی خۆی، گوتی: کوڕینە ئەو دەنگەدەنگەی من و باوکم پەیوەندی بە ئێوەوە نیە، خەمتان نەبیت هەموو شتێک بە دڵی ئێمە دەبێت، تا مردن ئێوە لەگەڵ من دەژین، ڕێگە نادەم هیچ کەس ئێوەم لێ جیا بکاتەوە.

مام حاجی باوکی کاک کەریم، ڕۆژێک ڕێکو ڕاست بە کاک کەریمی گوت: دوو ڕێگات لە پێشە، یەکەم، ئەو دوو منداڵە لەو ماڵە نەمێنن و بڕۆن. چونکە ئەوە ماڵی منە و ئەوکات دەتوانی وەکو کوڕی من سوود و چێژ لەو ژیانە شازادەییە وەرگری کە بۆم فەراهەم کردووی. ڕێگەی دووەم، لەگەڵیان بڕۆی و ئەو ماڵە بەجێبێڵی و من حاشات لێدەکەم. تۆ بە ڕێگای خۆت و منیش بە ڕێگای خۆم.! کاک کەریم زۆر مەردانە گوتی: دەڕۆم و ئەو ماڵە شاهانەیە جێدەهێڵم کە جێگەی دوو منداڵی بێشوێنی تێدا نەبێتەوە، هەموو ژیانیشم تەرخان دەکەم بۆ ئەو دوو منداڵە، ئەوینی جوانیی ڕووکەشی ئەو دنیایە دەکەمە ئەوینێکی ڕاستەقینە، ئەویش حەقیقەتی مرۆڤبوونە!

دەستی ئێمەی گرت و ئەو چەند بوزگوڕەی هەمان بوو هاویشتیە سەر داشقەکەو لە گەڕەکێکی هەژارنشینی مەهابات ژورێکی سەرگڵی بەکرێ گرت.و بە داشقەکەی بابم کاری ڕۆژانەی حەمباڵی دەستپێکرد. هەموو ئێواران کە دەگەڕایەوە، شووشەیەکی دەرمان پێبوو، پێش ئەوەی نانی ئێوارە سازبکات، ئەو دەرمانەی لە پەرداخێک دەکرد و هێندێک ئاوی تێدەکرد، وەک ماستاوی لێدەهات! دوایی زانیمان ئەوە عارەقە. لە دوای عارەقخواردنەوەو سازکردنی ژەمی ئێوارە، گۆرانی منداڵانی بۆ دەگوتین. دوایی لەنێو یەک لەگەندا هەرسێکمان نانمان دەخوارد. فێری کردین لە دوای نانخواردن دەست و دەممان بشۆین. ئێمەی لە قوتابخانە ناونووس کرد. برا بچوکەکەم

حاسڵ زیرەک بوو، باشی دەخوێند. بەڵام من لە خوێندن باش نەبووم. زۆر جار کاک کەریم وەک باوکێک، دوو سێ زللەی لە بناگوێی دەدام.

ئەوەبوو براکەم خوێندنی تەواوکرد. بوو بە کارمەندی پۆستەو گەیاندن. بەڵام من نەمخوێند و بووم بە دوکاندار. داشقەکەی بابم ببووە وەسیلەی ژیانی هەرسێکمان. ڕۆژێک هاتەوە، داشقەکەی لێدزرابوو، کە نانی هەرسێکمانی لەسەربوو. بە ناچاری کۆپانێکی حەمباڵیی کڕی. کە دەهاتەوە کۆپانەکەی لە ژووری دادەنا، دەیگوت با ئەو وەسیلەشم لێ نەدزن و تەڕیش نەبێت. دوایی زانیمان خەمی تەڕبوونی کاغەزەکانی نێو کورتانەکەی بوو! شەوان لە دوای دو سێ پەرداغ ئارەق، سەرمەست و دەورون کەیل ڕادەکشا. ڕۆژێک گلەیی لە بەختی خۆی نەکرد، یا ئێمە بە هۆکاری ئەو ژیانە سەختە بزانێ. هیچکەس نەیدەزانی باوکی ڕاستەقینەی ئێمە نیە، چ لە ڕووی سۆز و خۆشەویستی، چ لە ڕووی پەروەردە و تەمێکردن.

کاک کەریم، لە دوو بۆ سێ برادەر زیاتری نەبوو کە یەکێکیان بە تەمەن بوو. دوو دانەکەی دیکەیش هاوتەمەنی خۆی بوون. زۆرجار ئەو کاغەزانەیان لێوەردەگرت کە لەنێو کورتانەکەدا حەشاری دەدان. دیاربوو کاغەزی قەدەغەکراو بوون، بۆیە بە سرتە و چپەوە دەیانخوێندنەوە و بەیەکتریان دەدا. دوایی کە گەورە بووم زانیم لەگەڵ گرووپێکی چەپ پەیوەندی ڕێکخستن و ئۆرگانی هەیە. بەڵام هەموو جارێ لای برادەرەکانی دەیگوت: ئەرکی سەرەکی من خاوەنداریکردنە لەو دوو منداڵە و پەروەردەکردنیان، دەبێت بەخاتری ئەو دوو منداڵە خۆم لە چاوی ساواک و هێزە ئەمنیەکان بپارێزم.

کاک کریم هێندە بە ئەمانەتەوە ئەو کەلوپەلانەی دەگەیاندە ئەو ماڵانەی حەمباڵییان پێدەکرد، بەڕێوەبەری پۆستەو گەیاندن زۆری

کاک کەریم خۆشدەویست، بۆیە لە بەڕێوەبەرایەتییەکەی، دایمەزراندو پاسکیلێکیان بۆ کڕی. نامەو ڕاسپاردەکانی دەگەیاندە شوێنی مەبەست. زۆرجار، بەتایبەتی ئەو نامانەی هەواڵی دڵخۆشکەر و هێندێک کەسانی ئەویندار کە نامەی خۆشەویستەکانیان بەدەست دەگەیشت، یان ئەو دایکانەی هەواڵی سەلامەتی ڕۆڵە یا مێردە سەربازەکانیان لە دورەدەستەوە پێدەگەیشت، مزگێنیانەشیان دەدایە.

وردە وردە ژیانمان باشتر بوو. کاک کەریم کە زانی من بۆ خوێندن مل نادەم و خوێندەوارییەکم پەیداکردووە. ڕێگەی پێدام لە قوتابخانە بێمەدەرەوە. منی کرد بە شاگردی کوتاڵفرۆشێکی گەورە، بۆ ئەوەی بەردەستی بکەم. دوکاندارەکە ناوی حاجی ڕەفعەت بوو. کاک کەریم پێیگوت: گۆشت بۆ تۆ و ئیسقان بۆ من! تەنها ئەو کوڕەم بۆ بکە بە بەشەر و فێری کاسبی بکە!

هەر لەلای حاجی ڕەفعەت، ئەلفو بێی دوکانداری فێر بووم. هێندە شارەزا و کارامە بوو لە دوکانداری، هیچ جولەکەیەک باشاری نەدەکرد. لە کڕین و فرۆشتن نەدەخیچا و کەس لێی نەدەبردەوە. زۆری متمانە پێدەکردم. تا وای لیهات زۆربەی کارەکانی بە من دەسپارد. بە تێپەربوونی کات و کۆکردنەوەی ئەزموون، پارەی ڕۆژانەی بۆ زیاد دەکردم. حاسڵی براشم زۆر بە زیرەکانە خوێندنی تەواوکرد. کاک کەریم ئەویشی دامەزراند لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستە بوو بە کارمەند، تاوەکو ئێستا بەردەوامە. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات، باری ژیانمان باشتر و باشتر دەبوو، سێ کەس کارمان دەکرد. ئەو پارانەی دەستمان دەکەوت، هەمووی لە دەستێکی ئەمین و خەمخۆر کۆ دەکرایەوە. کاک کەریم بە ڕاستی بۆ ئێمە ببوو بە دایک و باوک. هەر زوو خانویەکی بۆ کڕین و لە کرێنشینی ڕزگارمان بوو. کە نیوەی تەمەنمانی لەگەڵ خۆی لوولدابوو. ڕۆژێک هەرسێکمان

دانیشتبووین، كاك كەریم گوتی: كوڕینە هەتا لە ژیاندا ماوم، ئارەزوومە بە زاوایەتی بتانبینم و ژنتان بۆ بێنم. ئەوەبوو یەك لە دوای یەك ژنی بۆ هەردووكمان هێنا و سەرچۆپی داوەتی وەك باوكێك بۆ گرتین. هێندەی نەخایەند خانەنشین بوو لە بەڕێوەبەرایەتی پۆستەو گەیاندن. ئێمە زۆرمان شەرم لێدەكرد، هێند گەورە بوو لەلامان، هەرگیز لەبەرچاوی ئەو جگەرەشمان نەدەكێشا. زۆرمان حەز دەكرد ژنێكی بۆخۆی هێنابا، چونكە ئەو ماڵە تەنها لە دایكێكی كەم بوو. لە ڕێگای هاوتەمەن و دۆستەكانییەوە، ئەو پەیامەمان بە گوێدا دەدا، بەڵام هەمیشە لە وڵامدا دەیگوت: دوو كوڕی باش و دوو بووكی جوانم هەیە، هەرچواریان دەستەونەزەر ڕاوەستاون خزمەتم بكەن، دەترسم ژن بێنم و ئەوانە لە دەست بدەم، ئەوجا تەمەنیش هێندەی بەبەرەوە نەماوە و هەموو ژنێك بە پیاوی پیر ڕازی نابێ! هێندێكجاریش بیانوی ئەوەی بۆ برادەرەكانی دەهێنایەوە: با خانویەكیش بۆ حاسڵ بكڕم و لە بار یەكیان دەربێنم، بۆ ئەوەی برایەتیەكەیان هەر بمێنێ.

ئێمە هەرگیز نەماندەزانی چەندمان پارەو پول هەیە، لە ناكاو خانووی جیرانەكەمانی بۆ حاسڵی برام كڕی. كاك كەریم گوتی: ئەو دیواری نێوبڕێیە بە ئەندازەی ژورێك بڕوخێنن، ئێمەش ڕووخاندمان. وەستای هێناو گوتی: ژورێكم لەو شوێنە بۆ دروست بكە نیوەی بكەوێتە زەوی ئەو خانوەی مرادی و نیوەكەی دیكەیشی بكەوێتە نێو خانووی حاسڵی، بۆ ئەوەی بەیانیان كە دەچن بۆ كاریێ چاوم لێیان بێت. ئێوارانیش كە گەڕانەوە سڵاوێكم لێبكەن و بچنەوە لای ماڵ و منداڵی خۆیان. ئەوەبوو ژورێكی خۆشمان دروستكرد هەردوو ماڵی من و حاسڵی لێوە دیار بوو. شەوێك، كە خۆزگە لەنێو شەوەكانی ساڵدا نەبووایە، دەمویست بنووم، كوڕەكەم نارد گوتم بزانە

باوەگەورە هیچی ناوێ بەر لەوەی بخەوم؟ کوڕەکەم بەپەلە هاتەوە گوتی: بابەگەورە دەڵێ نەخۆشم. با مراد بێ کارم پێیەتی. کاتێک چووم، باری تەندروستی باش نەبوو، بەپەلە بردمانە لای دکتۆر، ئەوەی نەدەبوایە دکتۆر بیڵێ، گوتی: یەک کاتژمێری دیکە دەژی! خوێنڕێژی مێشکی کردووە. لەوکاتەدا دەمویست میلی کاتژمێری سەر دیوارەکان ڕاگرم! دەمویست ئاوابوونی مانگ ڕاگرم! توخوا وەرن با هەرچوار وەرزەکە سندم بکەین! هەرچوار تایەی ساڵ پەنچەرکەین! ڕێگە نەدەین ویژدان بمرێ! میهربانی بۆ حەوت تەبەقە هەڵفڕێ! ئاخر لە توانای کێدایە بەرگەی هەنکەهەنکی دواهەناسەکانی سومبولی مرۆڤایەتی بگرێ!

کاتێک چاوەکانی بۆ ئەبەد لێکنا، ئەستێرەی گەشی ئومێدمان لە تاقی ئاسماندا داچڕژا. دارتێلەکانی سەرڕێگا نوشتانەوە، دار ئەرخەوان کڕنۆشی برد. گەورەم تۆ دواسەرنج بدە، دارو بەردی ئەو ڕێگایە سەریان هێناوەتە بەرپێت، چاک دەزانن تەرمی شانازی گشت جیهان دێت و لێرە تێپەڕدەبێ. بۆ؟ کەس هەیە بێت و ڕێگە بە خۆی بدات لە ئاست گەورەیی تۆ سوجدە نەبات!

ئێستا، لەو ڕۆژەوە من و حاسڵی برام هەموو ڕۆژانی هەینی دەچینە سەر گڵکۆی کاکم کەریم، (ئەو پیاوەی ببووە باوکمان) گوڵەکانی سەر گۆڕەکەی و زەیتونەکەی ژوور سەری ئاو دەدەین، کڕنۆش بۆ گۆڕەکەی دەبەین!

## مژدە

بازنەکانی پەپولەیەک...

ئێوارەیەکی درەنگوەختەو زەنگی تەلەفۆنێک گریا!... من ئێستاشی لەگەڵدابێت کاتێک زەنگی تەلەفۆنەکەم لێدەدات، دەڵێم یاالله! خێر دیسان! ناهەقم مەگرن، چونکە تاکو ئێستا لە هەواڵی ناخۆش زیاترم بۆ نەهاتووە!

حاجی، براگەورەی جەنگی و ئامۆزای من، تازە شەهید کرابوو، وەک نەریتێکی کۆمەڵگا هێشتا ڕیشمان نەتاشیبوو و تازیەبار بووین، تەلەفۆنەکەی نایلەی هاوسەرم بوو، گوتی: ئاراس و نایلەی هاوسەری جەنگی (مژدە)یان هێناوەتە پیرانشار بۆ دکتۆر، جەنگی ئاگاداربکەوەو بڕۆنە لایان. ئاخر مژدە پێشینەی نەخۆشی نەبوو. کاتێک من گەیشتمە لایان، شیکاری خوێنی بۆ کرابوو، ئاراس گوتی: بابە تاکو ئێرە وەرە، دکتۆر دەڵێ: شێرپەنجەی خوێنیەتی و دەبێت ببیەن بۆ ورمێ.

بە ئەمبوولانسەکە، جەنگی و نایلەو ئاراس لەگەڵ مژدەی بەڕێکەوتن بەرەو ورمێ. من و کاک مەحمود زوودی بە ماشێنی کاک مەحمود بەدوایاندا، گەیشتینە بیمارستان.

دووەمین کچی جەنگی بوو، تەمەنی ٩ نۆساڵییان تەواو نەدەکرد. من چوزانم لە مەملەکەتی ڕەجمدا، کچانی ئێرە، لە حەیفی یاسای فەتوای ڕق نایانەوێ ببنە نۆ ساڵ.

دکتۆر گوتی چەند کاتژمێرێکی ماوە!... کاتژمێرە لەعنەتیەکەی سەر ئەو دیوارە ناوەستێ، هەر چرکەی دێ و پەکی خۆی لە سەر کەس ناخات!

چ ئازارێک وەکو کابووس گۆڕەشاری ڕۆحی دەدام، کاتێک

زەقزەق دەمڕوانییە هەڵوەرینی دواهەناسەکانی بەرائەت، خەتی سەر ژمێریاری شاشەی، ترپەی دڵی ڕێک ڕاوەستا! ئا لەوکاتە تێگەیشتم لە مەملەکەتی سێپەڕە[1]و بەستەڵەکدا، کچان نایانەوێ عازەب بن، لە دژی ئەو فەتوا نەگریسەی، مەرگی سووری شەوی پێش لە سێدارەدان[2].

تەرمیان بردە ساردخانە. ئەو شەوە بەقەد خەمی ئێمە مژدەش لەوێندەر سەرمای بوو! بە نایلەم گوت: دەزانم تۆ وەکو دایکێک نابێت هیچ کات لێی دابڕێی، تکام وایە لەگەڵ ئاراس و کاک مەحمود بڕۆنەوە، بۆ بەیانی گۆڕەکەی لەتەنیشت سروەی خوشکی بۆ هەڵکەنن!

هەرچەند لە جەنگی دەڕوانم، وەک تەندووری گڕگرتوو سووربۆتەوە و لە دوورەوە تین و هالآوی دێ. ڕاستە ئێمە لە قۆشەن و لە مەیدانان، گەلێک شۆڕەسوارمان بینین لە تەنیشت ئێمە تخێل بوون، بەڵام هەر برینێک ژانی تایبەت بە خۆی هەیە، لەو شەوەدا هەروەک حەسەن حەیران دەڵێ: برینێ کەون و نووم لێکرا کولاوە!

لەو شارە، نە کەس دەناسین نە شوێنێک هەیە بۆی بڕۆین. ئێستا کات دوازدەی شەوە، هەموو دنیا نوقمی خەوە. تەلەفۆنم بۆ برادەرێکم کرد بە ناوی ئاغای دانش، لە هۆزی شکاکی ڕەچەڵەکی سمکۆی شکاک، نیو کاتژمێری پێنەچوو خۆی و خاڵ و چەند پیاوێک گەیشتنە لامان. ئەو هاتنە بۆ ئێمە کە لە زێدو هێلانەی خۆمان تەرە ببووین، زۆر گرنگ بوو. لەو گەشتە دوورەی ژیانم، زۆر مرۆڤی

---

١- سێپەڕە: کاتێک لە وەرزی زستان، بەستەڵەک دەبێ، لەسەر لق و چڵ درەختان دەیبەستێ و وەک کریستاڵ دەردەوێ.

٢- لە دەستووری وڵاتی کۆماری ئیسلامیی ئێران، کچی زیندانیی مەحکووم بە لە سێدارەدان، شەوی پێش سێدارە، لاقە دەکرێن نەبادا لەو دنیا بچنە بەهەشتەوە!

بڵندڕەگەز و پاکم بینی، کە تایبەتمەندییەکانی کوردی ڕەسەن، لە وجوودیان لێوانڕێژ بوو.

ئەو پیاوە مەردو ڕەندانە، بۆ پێچانەوەی ئەو شەوە، بوون بە ئاودەنگێکی زۆر باش، ئەو شەوەمان ڕۆژ کردەوە. بەیانی لە بیمارستان تەرمەکەمان وەرگرتەوە. ئاغای دانش بە پەیکانەکەی خۆی لە گەڵمان هات، من و جەنگی لە سەر کوشنی پشتەوە، تەرمەکەمان لە باوەش گرت تاوەکو گەیشتینەوە دیلێزێ. لەوێش لە چیانە، لە تەنیشت سروە بە خاکمان سپارد، گوتم با ئەو دوو کچەشمان لێرە بنوون!

لەو خەوە قوڵ و هەتاهەتاییە، مژدە سێ تاک بازنەی وەک یادگاری لێبەجێما...

ئەوەی زۆر ئازارم دەدات، گۆڕەکانیشمان لە تەک یەکەوە نین، هەر لە ئۆمەراوە، گەڕەشێخان، کڵێسە، چیانەی خۆرهەڵات، گردەڕەشە، چوارقوڕنە، شەقڵاوە، گۆڕمان گەیشتە بیابانی خواروو سێ گۆڕیشمان لە عەرعەرە.

خوێنەری قەدر گران...

ساڵانێکە دەمهەوێ فتراقم[1] لەمەڕ ئەو چیرۆکە پڕ ناسۆر و ئازارانە داخەم و، بە کامی دڵ بیانگێڕمەوە، ئەویش، نە بۆ ئازاردانی ئەو ڕۆحە پاکەی ئێوەیە، نە بۆ منەتکردنە بەسەرتاندا، بۆ فرۆشتنەوەش نییە، نە لە توانای کڕیارە گرگن و قەزەمەکانیشدایە، بێنە ژێرباری ئەو نرخەو خۆ لە قەرەی بەهای لە بەهانەهاتوویان بدەن! بەڵکو تەنیا لە ترسی وونبوونە دەیاننووسمەوە.

حکومەتی هەرێم بڕیارێکی دەرکرد، ئەوەی لە ئاوارەیدا بمرێ بە

---

١- فتراق: تێربوونی رووحی.

شــەهید ئــەژمار دەکــرێ، واتــا نایلــەو جــەنگی، دایــک و بــاوکی دوو شەهیدن!

## حەسەنە گێل

لەنێوەڕاســتی نــەوەدەکان ماڵمــان لــە خۆرهــەڵاتی کوردســتان بــوو. لەوان ســاڵاندا، شــەڕێکی نــەگریس و قێزەون لــە باشــوور لــە مابــەینی یەکێتی لەلایەک و، پارتی و بزووتنــەوەی ئیســلامیش لــە لایەکــەی دی، بـــەڕێوەدەچوو. ئـــەو ئێســـک کرۆشـــتنەی یـــەکتری، کاریگـــەری و کاردانــەوەی لەســەر تــاک بە تــاکی ئاوارەکــانیش کردبوو، هەرکەســەو ئەویدی بە دوژمنی باوەکوشتەی خۆی دەزانــی، پارتــە سیاسیــەکانیش بێمروەتانە خەڵکیان لێک تیژ دەکرد.

کۆمــاری ئیســلامی، هــەرجارە و بەبێ جیاوازی، یارمــەتی لایــەنێکی بەشــەڕهاتووی دەدا. هــەر لایــەنێک لاواز دەبــوو و دەهــات بکــەوێ، ئێران و تورکیــا بــە نۆبــە دەســتیان بــە پشــتیەوە دەگــرت بــۆ ئــەوەی نەکــەوێ و بــۆ تاوێــک لەگــەڵ بەرامبەرەکــەی یــەکتری تــەواو بکــەن! لــەوکاتەدا یارمـــەتی پـــارتی و بزووتنـــەوەی ئیســـلامی دەدا لـــە دژی یەکێتی.

لە سالارە و دارەشمانە[1] شــەڕ گــەرم بــوو. جــەلیل فــەیلی و بــەختیار هەڵشــۆیی و مــەلا علــی بــاپیر و عــەباس بــایز، کــە هــەر کامیــان ســەر بەلایەنێک بوون، لە دژی یەکێتی لە خێوەتێکدا بوون لــە ســالارە. بــە هاوکاری ئێران، پشدەری زێدی باپیرانی خۆیان موشــەکباران دەکرد. هێندێک ناسیاوم، کــە یــەکێتیی بەروپشــت ئەتڵــەس بــوون، ئــەوانیش لــە

---

١- سالارە و دارەشمانە: دوو گوند یان دوو شوێنن، دەکەونە نزیکەی ٢٠ کلم باکووری خۆرهەڵاتی شاری قەڵادزێ و دەکەونە سەرسنووری شارستانی سەردەشت.

پشدەر خەڵکی قەڵادزێ و سەنگەسەر و دەوروبەری بوون، لەگەڵ عەباس بایز لە دژی یەکێتی شەڕیان دەکرد. لێم پرسین: باشە ئێوە یەکێتین و وەک بۆ خۆتان دەڵێن خوێنیشتان سەوزە، چۆن لە دژی یەکێتی شەڕ دەکەن؟! دەیانگوت: کاکەباس تەکلیفی لێکردووین، ناکرێ قسەی بشکێنین و ئەو شەڕەی نەکەین!

مەبەستم ئەوەیە کە بڕیاری سەرۆکخێڵ، چۆن دیسپلینی حیزبی دەشکێنێ!

مام پیرۆت وەکو ئێمە ئاوارە بوو، پیاوێکی زۆر وردبین نەبوو، کارەکەی، کە ئیشی کڕین و فرۆشتنی شتومەکی عیراقی و ئێرانی دەکرد بۆ هەردوو دیووی سنوور، لە قەڵەمڕەوی هەر کامەیاندا بوایە، دەیگوت: ئەو لەسەر حەقە!

مام پیرۆت، شەریکێکی هەبوو خەڵکی شاری نەغەدە بوو، ناوی مام حەسەن بوو، بە حەسەنەگێل دەناسرا، دەیگوت: دایکم لە خۆشەویستییان، بە منداڵی پێیگوتووم حەسەنەگێل! بەڵام دایکی دیارە ژنێکی سەرناس بووە!

حەسەنەگێل پیاوێکی سوورەی کەڵەگەتی نەفرەجاو[1] هەتا خوا حەزدەکا گێل! لۆچە گۆشتەکانی پشتەسەرو پشتەملی وەک بارێنە[2] لەسەر پشتەملی کۆپەرانەی[3] کردبوو! سمت و قونی وەک ئاخوڕی ئەسپی پۆلیسی سوارە بوو، ڕیشووی شەدەکەی دەچۆوە نێو زاری، هەمیشە قۆپچەکانی کراسەکەی لاتەڕقەوچ[4] دادەخستن، گیرفانی شەرواری هەمیشە پڕ لە شت بوو، وەک گونەبەران جۆلانەی دەکرد!

---

١- نەفرەجا: زەبەلاح، بە هەیکەل، زلێکی نائاسایی.

٢- بارێنە: ئامێرێکە لە کاتی جووتکردندا لە ملی وڵاخەکە دەکرێ.

٣- کۆپەرانە: ئامێرێکی ئامووری جووتکردن و زەوی کێڵانە لە وڵاخ دەکرێ.

٤- لاتەڕقەوچ: پێچەوانە، نارێک، نادروست.

خەتی شەروارەکەی لە پشتەوە، یان دوازدە و چارەگ بوو، یا چارەگی دەویست بۆ دوازدە!

شەڕی خۆبەخۆی باشووریان هێنایە بەرباس، حەسەنە گێل گوتی: ئێوە بە قسەی کۆماری ئیسلامی ناکەن بۆیە ئاوا خراپتان لێ بەسەرهاتووە ! ئەمنیش گوتم: چۆن بە قسەی ناکەین، ئەوە نیە هەموو ڕۆژێک تێکۆشەرێکی خۆرهەڵاتی لە ژێر قەڵەمڕەوی یەکێتیدا بۆ کۆماری ئیسلامی تیرۆر دەکەین! دیارە بە هەمو عەقڵی، بە پارسەنگی خۆی پێی وابوو ئێمە ئەو شەکرشکاندنانەی جەنابی بۆ دەزگاجاسووسییەکان دەگێڕینەوە! ئاخر چی لەوە ناخۆشترە گێلێک ئاموژگاریت بکات و بە جاسووست بزانێ! گوتم: کەس ئەو قسانە بۆ دەوڵەت ناگێڕێتەوە، بۆچی بە بەلاش خۆت ماندوو دەکەی؟!

نووسەر و ئەدیبی ئیرلەندی (ئۆسکار وایڵد) کە لە سەدەی هەژدهدا ژیاوە، دەڵێ: خەفەت شتێکە مرۆڤی بێعەقل دەرخواردی مروڤی عاقڵی دەدات!

لەوکاتە دا خەریکی بارکردنی کەلوپەل بوون، حەسەنەگێل لەگەڵ خۆ چەماندنەوە، نیومتر شەرواری چۆبووە نێو قونی، منیش پلایسێکم بەدەستەوەبوو چاوەڕێی کارەباچی بووم، بانگی کوڕەکەی مام پیرۆتم کرد گوتم: ئیبڕاهیم وەرە کارم پێتە، هاتە لام و گوتی: فەرموو! گوتم: ها ئەو پلایسە بگرە پێت لە ڕەفیسکی مام حەسەنی گیربکەو بەو پلایسە ئەو شەروارەی لە قونی دەربێنە! ئەویش تووڕە بوو گوتی: ئەی بۆ خۆت بۆی دەرناهێنی؟ گوتم: بە هەموو پێوەرێکی ئەخلاقی و تیجاری، دەبێ ئێوە بۆی دەربێنن، چونکە شەریکی بابتە، ئەوجا ئەو شەروارە تا ئێوارێ دە وێدابێ، ئارەقە دەیرزێنێ و زیانی ئابووریتان پێدەگەینێ!

## ڕۆیشتن بەنێو دۆزەخدا بۆ لەتێک نان

براکوژی، کە گیری بە ئێمە دابوو نەگەڕێینەوە بۆ باشوور خۆمان بپارێزین لە لایەنگیری‌و لە ئێران بمێنینەوە. ساڵی ١٩٩٨ ماڵمان لە ئۆردوگای دیڵێژەی سەر بە پیرانشەهر بوو. دیڵژە، خۆی بە بناری چیای قەندیلەوە نوساندووە بە دیووی خۆرهەلات، سێسەد ماڵێکی باشووری تێدا دەژیا، وەک پەناهەندەو ئاوارە. دیارە خێزانی ئێمە پێکهاتبوو لە حەوت کەس، تەنها خۆم بژێوی ژیانم دابین دەکردن. لە ئێران بەگشتی‌و لە بەشی کوردستانەکەی بەتایبەتی، بەخێوکردنی حەوت سەرخێزان، مبارەزەو بەرەنگاربوونەوەیە لەگەڵ دێوو درنج!

لەو ساڵەدا، ئەو پارەیەی بەدەستمەوە بوو، بەهۆکاری شەریکبوونم لە جەڵەبی کاوڕی کە قەت کاری من نەبوو، هەر هەموویم زەرەرکردبوو، بە ناچاری دەبوایە پەنا بۆ کارێکی دیکە ببەم. کرێکاری، زۆر سەخت بوو لە ئێران هیچ یاساو ڕێسایەکی کارکردن نەبوو، کە دەبوایە کاتژمێری کار دیار بێت. لەوان ساڵان لە باشوور گرانی‌و قاتی‌و قڕی بوو، شەڕی براکوژی پارتی‌و یەکیەتیش سەربار! خەڵکێکی زۆر ڕوویان لە ئێران دەکرد بۆ کرێکاری، بە جۆرێک هەموو شارەکان‌و هەموو کورەخانەکان خەڵکی باشووری تێدابوو. ڕۆژێک دوو گەنج ویستبویان لەگەڵ کاروانچیەکانی بەینی حاجی ئۆمەران‌و پیرانشەهر بێن بۆ ئێران، لەوێ کرێکاری بکەن. کاتێک دەگەنە سەر شاخی، لە دیوی ئێرانیش کاروانچیەکان دەگەنە یەک دەیانەوێ بچنە حاجی ئۆمەران، گەنجێکی باشوریان لەگەڵ دەبێ کە دەیەوێ لەدەست کرێکاری لە ئێران ڕابکات! ئەو دوو گەنجەی دەیانەویست بچنە ئێران، دەرکەوت دەیناسن، لێی دەپرسن: بۆ گەڕایەوە؟ کرێکاریت دەست نەکەوتووە؟ ئەویش دەڵێ کاکە کرێکاری

لە ئێران وەک لای خۆمان ٨ کاتژمێر نیە، کووره، شەش بۆ شەشە، مستەمرە، زەلامگانە! بەقسەم دەکەن دەگەڕێنەوە!
ڕۆژێک، بڕێک پارەی قەرزی کۆنم دەستکەوتەوە کە بڕەکەی زۆر کەم بوو. کەسێکم دەناسی بە ناوی (مینەڕەش) مالّی لە میراوێ بوو لە خێزانێکی زەحمەتکێش‌و کاسبکار بوون. خێزانەکەی خاتوو کوبرا کچی پیاوێکی دیاری میراوێ بوو بەناوی (کاک ڕەسوی حاجی حسین) کە کۆماری ئیسلامی لە سێدارەی دا. مینەم چاوپێکەوت بەزۆری بردمەوە مالّی خۆمان بۆ نیوەڕۆ. هەندێک پرسیاری کاسبی‌و کڕین‌و فرۆشتنم لێکرد، ئەویش بە منی گوت: کاک حازم چۆن دەبێت بێئیش دابنیشی لەکاتێک ژیان لە ئێران زۆر سەختە! گوتم: پارەکەم زۆر کەمە بەشی هیچ ناکات. مینە گوتی: کاک حازم خەلّک ئامادەیە هەموو مالّی خۆی بە قەرز بدات بە تۆ!
لەگەلّ مینەی ڕێک کەوتم بەیەکەوە کڕین‌و فرۆشتن بکەین. مینە خەلّکی گوندی (بەلکی) پشدەرو دانیشتوی میراوێ بوو. بۆ کاروان‌و هێنان‌وبردنی کالاّی ئێرانی بۆ عێراق‌و عێراقی بۆ ئێران، کوڕێکی هەلّسوڕاو و بەدەستەوەبوو. منیش متمانەی خەلّکم هەبوو شتم بە قەرز بدەنێ. واتا هەردووکمان سوودمان لە یەکتری دەبینی. ڕاستە لە ڕووی فکری سیاسی‌و ئایدیاوە هیچ ئەشیامان بۆ یەکتری نەدەبوو، بەلاّم چارەنووس بۆ پەیداکردنی نان بەیەکترییەوە گرێدابووین. بەر لەوەی لەگەلّ مینەی ببمە هاوبەشی کڕین‌و فرۆشتن. دەمویست هەندێک وردەوالّە بکڕم بە گوندەکاندا بگەڕێم، چونکە پارەکەم هەر بەشی ئەوەی دەکرد. بەلاّم ئەوەی پەشیمانی کردمەوە ئەوەبوو ڕۆژێک کوڕێکی ئاوارە کە بەر لە ئاوارەیی خەلّکی ئەو بنارەی پشتی قەلاّدزێ بوو ناوی سمە بوو، ماوەیەک بوو دەستگێر بوو لەو گوند بۆ ئەو گوند، دوو بوخچەی پڕاو پڕ لە وردەوالّەی

پێبوو، بەزۆری بابەتی ژنانە بوو، ماوەیەک بوو چاودێریم دەکرد بزانم چۆن ئەو شتانە ساغ دەکاتەوەو چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ کڕیارەکانی دەکات کە هەموویان ژن بوون.

ڕۆژێک لەبەر پەنجەرەی ژورەکەمان وەستابووم کە خانوەکان هیچیان حەساریان نەبوو، پەنجەرە ڕاستەوخۆ لەسەر کۆڵانێ بوو. لە بەرامبەر پەنجەرەکە وردەواڵەکەی داناو ژنی گەڕەکێ دەوریاندا، منیش پەنجەرەکەم تۆزێک ترازاند بۆ ئەوەی گوێبیستی چۆنیەتی فرۆشتنی وردەواڵەی سمەی بم. دیاربوو ژنێک دەرمان حەمامی دەویست، چەند جۆرێک لە دەرمان حەمامی بەدەستەوەبوو، دەیگوت: براژن ئەو جۆرەیان کە ژاپۆنیە ئەوەتا لێرەم داوە بزانە چۆنی لووس کردوە! قۆڵی ڕاستی هەڵدەکرد هەتا ئانیشکی. ئەو جارە قۆڵی چەپی هەڵدەکرد دەرمانێکی دیکەی نیشان دەدا دەیگوت ئەوە ئاڵمانیە لە قۆڵی چەپم داوە، دەستی بکەیە بزانە چۆنی لووس کردیە! هەروەها هەردوو پووزی بەلەکی خۆی هەڵدەکردو هەریەکەیان بەقەدەر ژێر پیاڵەیەک تووکی پێوە نەهێشتبوو، باوەڕتان بێت هێندەی دەرمان حەمام بە هەموو جۆرەکانیەوە لە باسک و قاچی خۆی دابوو، دەتگوت ڕێوییە گەڕ بووە و تووکی فڕێداوە!

لەو ڕۆژەوە بڕیارمدا ئەوە کاری من نیەو سەرکەوتوو نابم، وازم لەو بیرۆکە بازرگانییە هێنا. ڕۆیشتم بۆ میراوێ بۆ لای مینەی خۆم، پاش نیوەڕۆ بەڕێکەوتین بۆ داوداوە لەوێشەوە بۆ نۆکان‌و نێوزەنگو چووینە ماڵی حاجیەڕەش، ماڵی لەنێو نەخۆشخانەکەی زەمانی بەناو شۆڕش بوو، کە یەک جۆگەلەئاو، باشوور و خۆرهەڵات لە یەکتر جیادەکاتەوە، دەتوانی پێیەکت لە عێراق دابنێی‌و پێیەکەی تریشت لە ئێران. وەک داگیرکەران دەیڵێن.

حاجیەڕەش گوتی: ئەوە بۆ هەندێک مافوور (فەڕش)تان لەگەڵ

خۆتـان نـەهێناوە؟ فـەرش لـە خـوارێ، مەبەسـتی ڕانیـە بـوو، چـاک دەفرۆشێ. مینە گوتی: کاک حازم با بگەڕێینەوە بچین چەند مافورێک بێنین. گەڕاینەوە. بۆ شەوێ چووینە مـاڵی ئێمـە، بـەیانی ڕۆیشتین بۆ ورمێ. لەوێ چەند مافوورێکمان کڕی، لە پیرانشهر چەند مـافوورێکی دیکەمان کڕی. نیوە بە پارەی حازر و نیوەی بە قەرز. مافوورەکانمان لە دوو ماشێن بارکرد بۆ سەردەشت کە شۆفێرێکیان عـەلی میرزای ئالۆاتان بوو. شـەوێ لـە مـاڵی عـەلی میرزا ماینـەوە، بـەیانی هـەر ئـەو دوو ماشــێنە، بەڕێکــەوتین بــۆ قەلەڕەشــێ و گــۆڕهێلکی، لــەوێ بارەکەمان لە توێتاگاز دووتـەنی بـرایم هێرۆیـی بـارکرد بـۆ قـەڵادزێ، پــارەی گومرگمــان دا. پــاش عەســرێکی درەنــگ گەیشــتینە ڕانیــە، بارەکـەمان لـە مـاڵی مـحەمەدی مـام ڕەسـووی سـوورەدێی خـاڵیکرد. بەڵام چونکە دوو سێ جار لـە ڕێگای قەلەڕەشێ ماشێنەکان لـە قـوڕ چەقین، هەموو گیانمان لە قوڕێ هـەڵاتبوو، بـە کـەڵکی دانیشتنی سـەر هیچ ڕاخەرێک نەدەهاتین، بۆیـە گوتیـان بـڕۆن لـە حـەمامێ ئـەو جلانـە دابنێن با بۆتان بشۆین و خۆتان بشۆن. بە نۆبە لەگـەڵ مینـەی خـۆمـان شۆرد. دەتگوت لە ترسی بینینی فڕۆکە بە قوڕ سواق دراوین!

مافوورەکانمـان بـە حـاجی ئـەحمەدی سەرسـیان و خـدری فـەقێ ڕەسـوی فرۆشـت. نیـوەی پارەمـان وەرگـرت و نیـوەی بـۆ کـاتی گەڕانەوە لە هەولێر. چوینە نێو بازاڕی ڕانیە، مینە پاڵتۆیەکی سـەوزی لەبـەربوو، کـە بـەهیچ شـێوەیەک بـۆ هـەولێر نـەدەبوو ئـەو ڕەنگـەت لەبەربێت. نە ڕەنگی زەرد بۆ ڕانیەو سلێمانی دەبوو، نە سـەوزیش بۆ هەولێرو دەوروبەری!

ئـاخر ئـەو کاتـەی لـە بـازاڕی مهابـاد لیسـتی پارچـەکانی ئۆتۆمبێلو دەزگاکانمـان وەردەگـرت، ئـەو پاڵتۆیـە سـەوزەی کـڕی، هەرچـەنـدی لەگەڵ کاک مەحمود چیرەی هاوڕێم پێمانگوت: ئەو پاڵتۆیە بۆ هـەولێر

نابێ! مینە دەیگوت ئەوە زەیتوونیە، سەوز نیە. ئەمنیش گوتم: ئەوە بازگەکانی پارتین بڕیاری لێدەدەن ئەو پاڵتۆیە سەوزە یان زەیتوونی! بەڵام مینە نەهاتە ژێرباری ئەوەی کە ئەو پاڵتۆیە سەوزەو، بیگۆڕێ. لە ڕانیە پێمگوت: بۆ دەیگۆڕی؟ خۆ زەیتوونییە! مینە گوتی: نا کاکە لە هەولێر با نەمگرن! بۆیە بەناچاری مینە پاڵتۆی گۆڕییەوە کە لە ڕانیە ڕەنگی سەوز ڕەواجی هەبوو، ئەوەی سەوزی بپۆشیبا وەک برازایەکی مام جەلالی چاوی لێدەکرا! گوتی: دەچم لە بازاڕی دۆلارەکە لەسەر قولێ، دەیگۆڕمەوە بە ڕەنگێکی دیکە. لەو سەروبەندە لەچوارقوڕنە چەکدارەکانی یەکیەتی پیاوێکیان گرتبوو چونکە تەزبیحەکەی زەردبوو، لە دوای لێدانێکی زۆرو شکاندنی دەستو لاقی، ناچارییان کردبوو دەبێت هەموو دەنکە تەزبیحەکە بخوات! ئەویش دەستدەکات بە خواردنیان، بەڵام چونکە ئیمامی تەزبیحەکە گەورە بووە، ناتوانێ بیخوات، تکایان لێدەکات کە لێیبگەڕێن ئیمامەکە بشکێنێ ئینجا بیخوا، چەکدارەکان ڕێگای پێدەدەن بیشکێنێو بیخوا! ئەمنیش بە جەفەنگ بە مینەم دەگوت: ئەگەر نەتگۆڕیبا دەبوایە ئەو پاڵتۆیە سەوزە لە زۆنی زەرد هەمووی بخۆی، خۆ مانگاش پێی ناخورێ!

ئەو باشوورە وا شێوابوو، لەگەڵ شەڕی براکانو دەستی تیرۆری وڵاتانی دەوروبەر، یەک هەواڵی دڵخۆشکەرت نەدەبیست. هێندێک لەو هەواڵانەی لەبیرم مابن:

-هێرشی پارتی لە کەپکی حەمەداغای شکا تەرمیان لێ بەجێماوە.

-پارتی سەفینی گرت یەکیەتی تەرمیان لێ بەجێماوە.

-دوو کەس هاتوون مەلا چەتەی بکوژن بۆ ئیتلاعاتی ئێران.

-سبەی تانکەکانی دەوڵەتی تورکی داگیرکەر پارتی دێننەوە دێگەڵەی.

-ئێران لە پشت یەکیەتییەوەیە.

-دوو تێکۆشەری خۆرهەڵاتی تیرۆر کران.

-کەسێکیان کوشت نایلۆنێکی ڕەشی بەدەستەوە بووە، وایان زانیوە پارەیە، دوایی کە سەیری دەکەن دوو قالب سابونی کۆڕێ زیاتر نەبووە.

-دوو جەنازە لە مزگەوتی گەورە درێژکراون کەس نایاننناسێتەوە.

-ماڵێکی ۱۲ سەر خێزانیان بردۆتە سەرو گوێلاکی ماڵەپارتیەک، کە دەبێ لەگەڵ ئەوان لەسەر سفرەو خوان بن، تا ماوەیەکی نادیار، چونکە پارتی لە زۆنی خۆی دەریکردوون. هەروەها لە هەولێریش پارتی وایدەکرد.

-پیاوێک لەسەر جیاوازی فکری بە بلۆک کوژرا.

-ئەو پیرەژنە کە دەیبینی دەگریێو کانی سۆمای چاوەکانی خەریکە وشک دەبن، دوو کوڕی پێشمەرگەی دێرینی لە زیندانی ئاکرێ لەلایەن جەللادەکانی پارتییەوە بێ سەروشوێنکراون.

جیرانێکی کاک محەمەد بە تراکتۆرەوە دەچێت گازە دووتەنیەکەی کە یەکیەتی بە سوخرە بردوویە بۆ ئالانەی، مەکینەی سووتاوە، لە ڕاستی ئەشکەوتەی بەجێیانهێڵاوە .

- لۆرییەکی پڕ لە چەکداری پارتی لێرە لە ڕانیە، کۆمەڵکوژکران.

-چەند کۆمۆنیستێک لە سلێمانی تیرۆرکران، بەرچاوی بەرپرسێکیان گرتبوو.

لەگەڵ مینەی، ڕۆژی دوایی بەڕێکەوتین بۆ هەولێر. لە گەراجی ڕانیە - هەولێر، ئاسایش پرسی: کاکە بۆ کوێ دەچن؟ لەوەڵامدا هەولێر. باشە بۆ دەچنە هەولێر؟ کەسوکارمان لەوێیەو کاسبین، کەفیلتان هەیە بگەڕێنەوە؟ بەڵێ!

لەهەولێر چووینە ماڵی هەردی برام، لەدارەتوو کە لەگەڵ دایکم و

تانیای خوشکم بەیەکەوە دەژیان. ڕۆژی دوایی چووینە لای هوتێل مێرگەسۆر، کە شوێنی کڕین و فرۆشتنی پارچەی ئۆتۆمبێل و دەزگاکانی دیکە بوو. مینە لیستێکی ئەو وردەواڵانەی کە خواستی لەسەر بوو لە ئێران، وەرگرتبوو، لیستە بۆرەمان دەرهێناو پرسیارمان کرد ئەو شتانە لە کوێ وەدەست دەکەون؟ دوکانێکی ژێرزەمینەکەیان نیشاندایین کەوتبووە گۆشەیەکەوە. سڵاومان کرد گوتیان دانیشن، پرسیاری کاڵاکانمان کرد، گوتیان هەمانە دوو سێ کەس دانیشتبوون، وەڵامیان داینەوە و فەرموون دانیشن. کەسی یەکەم بەڕێزو هێمن و ئارام دیاربوو، لە برا کەرکوکیەکان بوون، یەکیان ناوی خەتاب و لەگەڵ برایەکی، ئەوانی دی، حیکمەت و عەلی عوبێد. من ئەو کاتە ئەو بەڕێزانەم نەدەناسی. کاتێک قسەم دەکرد دیاربوو دەنگ و شێوازی ئاخافتنی منیان لەلا ئاشنابوو. خەتاب گوتی خەڵکی کوێی؟ گوتم بە ئەسڵ هەولێریم، بەڵام ئێستا لە ئێرانم، گوتی برات هەیە لە دارەتووی، گوتم بۆ؟ گوتی دەنگت بە کاک هەردی دەچی، گوتم کاک هەردی چۆن دەناسی؟ گوتی هەردی خوێنی بە من بەخشیوە کاتێک بریندار بوم. گوتم کەواتە خوێنی خێزانی ئێمە لە دەمارەکانتدایە، ناتوانی فێڵمان لێبکەی بەتایبەتی خوێنی هەردی برام، لە هەر دەمارێکدا بێت، جێگای فێڵ و ساختەی تێدا ناهێڵێ. گوتی ئەگەر وایە تۆ براگەورەکەی کاک هەردی، کە دەیگوت لە ئێرانە. گوتم بەڵێ هەوم. گوتیان ئەوجا کەوای لێهات تۆ دەستوور بدەو ئێمە جێبەجێی بکەین. دیاربوو مینە زۆر خۆشحاڵ بوو بەو ناسینەو لیستەبۆری دەرهێنا گوتی: ئەو شتانەمان دەوێ.

بە دوو ڕۆژ هەموو شتەکانمان کڕی، نزیکەی ٦٠٠٠٠ شەست هەزار دیناری سویسری قەرزار بووینەوە، چونکە پارەکەمان کەم بوو. گوتیان کەی لە ئێران فرۆشتتان، جاری داهاتوو پارەکە بێننەوە.

لەکاتێکدا ئێمە سەرقاڵی کۆکردنەوەو پێچانەوەی شتەکان بووین‌و کات لەبەرژەوەندیماندا نەبوو، پیاوێکی کەڵەگەتی ڕەشئەسمەری تەبەش[1] پان جەمەدانیەکی بە ڕیشوو و کڵاوێکی زەردی لەسەر بوو، پشتێنێکی گرێچن، خەنجەرێکی کرمانی دەسک سپی، تەزبیحێکی دەنگ زەردی گەورەی لە دەسکی خەنجەرەکەی ئاڵاندبوو، پەستەکێکی لەبەربوو، وێنەیەکی کەپس کردبوو بە یەخەیەوە هەڵواسیبوو، بە دیکۆرو قەدوقیافە شەیتان شەرمی لێدەکرد! نێوەنێوە مینەی لە من دووردەخستەوە فسکەفسکی لەگەڵ دەکرد. منیش بانگی مینەم کرد: کاکەمین ئەوە لە دیکۆریڕا وا دیارە پارتیەو چەکدارە، ئێمەش کاسبین‌و بێلایەنین لە حاڵی حازر. کە من پێشمەرگەی دانەبڕاوم تۆش پارتی بووی بەشداری شەڕی خواکورکت کردییە، بەڵام ئێستا ئەوە نایخوا، لای حیزب ئێستا دیکۆری ئەو پیاوەی دەیخوا! تکات لێدەکەم لێی دووربکەوە، ئەو پیاوە بە کەسێکی خراپەکار دەچی، ئەو وێنەیەی بۆ ئەوەیە خۆی لەژێردا بشارێتەوە و خەڵکی هەژاری پێ بترسێنێ. مینەش یەک پێکەنینی بێزارکەر گرتبووی بەری نەدەدا، تاوەکو من لێی تورەبووم گوتم: ئەو قسانەی من بۆ ئەو پێکەنینە بێمانایە دەبن؟ مینەش نەیوست لەوەی زیاتر ئازارم بدات گوتی: کورە کاک حازم ئەوە دەڵێ وەرە ژنی لەشفرۆشی چاکم لەژێردەستدایە با بڕۆین ئەو برادەرەی (واتا من) سەرف بکە، ئەقڵم نایگرێ! ئەوجا ما ئەمن پێبکەنم بەو وێنەو دیکۆرەو بە هەڵە حاڵیبوونەم..

بەر لە گەڕانەوە بۆ ڕانیە، گوتم مینە با سەرێکی هیدایەتی خزمم بدەین لە باداوان، پاشان دەگەڕێینەوە. چوینە ماڵی هیدایەت. لە

---

[1] - تەبەش: نێوچاوان.

كاتێكدا كە ئێمە چامان دەخواردەوە، منداڵێک خۆی بە دەرگای داداو وەک كەسێک بەدواوەی بێ، هەناسەسوار! هیدایەت گوتی ئەوە چی قەوماوە؟ خەریک بوو بەنێو پیاڵان بكەوی! شیلانی ئامۆزام هەر بەپەلە جامەئاوێكی بەدەوی منداڵەكەی وەكرد، لەگەڵ یااللەو یا حەزرەتی غەوسی گەیلانی، نیوەی ئاوەكەی بە دەموفلچ و یەخەیداكرد. منداڵەكە هەناسەی هاتەوەبەر، هیدایەت گوتی كوڕە چی بووە؟ گوتی لەسەر جادەی بنەسلاوەی، ماڵی (ع. ق.) كە فەرماندەیەكی چەكدارەكانی پارتییە، سەیتەرەیان دانایە، ئەوەی بە چێری بری مانگا دەیگرن، یەكسەر لۆ ئاكرێ، توخوا ئەگەر چونەدەرێ بەچێرێ مەرێن مانگا، بەخوای دەتانگرن!

دوایی زانیمان ماڵی (ع. ق.)ـە، خەڵكی بنەسلاوەش زۆربەیان یەكیەتی بوون و خەڵكی دەڤەری ساڵەیی و شوان و كەركوك بوون، لەوێش بە چێرێ دەڵێن مانگا. بۆ ئەوەی بزانن كامە یەكیەتییە! دیارە ئەو جیاوازییەیان بە هەند وەرگرتبوو، چێرێكیان لە ڕۆخی ڕێگای بنەسلاوەی ڕاگرتبوو، هەر ئۆتۆمبێلێک سەرنشینی تێدابایە، بەتایبەتی پاسەكانی ڕێگای بنەسلاوەی، ڕایاندەگرت، خەڵكەكەیان دادەبەزاند بە نۆبە یەک یەک لێیاندەپرسی: ئەو ئاژەڵە چییە؟ ئەوەی بیگوتبایە چێر، بەخت یاوەری بوو، ئەوەش بیگوتبایە مانگا، بەشەق و زللە لە ئۆتۆمبێلی چەكدارەكان توند دەكرا، چارەنوسی بە وشەی مانگاوە بەندبوو. دیارە ئەمن كێشەم نەبوو، چونكە هەر لە منداڵی بەخت یاوەرمەو دەڵێم چێر، بەڵام، وەک تەلقینی مردوو بدەم، نێوەنێوە لە مینەی دووپات دەكەمەوە:

ئەی مینە!

دوو چەكداری پارتیت دێنەسەر، نەكەی زمانت تەتڵەی بكاو تێكبهاڵێت و بترسی! وەڵامیان بدەوە بە زمانێكی كوردی ڕەوان پێیان

بڵێ:

ئاژەڵم چێرە، ئاڵام زەردە، حیزبم پارتییە، دووژمنی بابەکوشتەم جەلالییە، سەرۆکم بەرزانییە، ٣١ی سی و یەکی ئابم پێ ناپاکی نیشتمانی و نەتەوەیی نیە، بە گەواهیی هاوڕێیانم بەشداریم لە شەڕی خواکورکی کردییە، لەوەتای دەستی ڕاستو چەپی خۆم ناسیە، نە قوتابیم پێ خوێندکارە، نە ئافرەتم پێ ژنە، حیزبی ئێوە نەبێ هیچیانم پێ حیزب نیە، تا دوادڵۆپی خوێنم بەڵێن دووپات دەکەمەوە قەت چێرم پێ مانگا نیە، منداڵم وردن و مەمکوژن، هەڕی لەبڕی دەرناکەم و ئاگام لە عەشتەبای نییە!

لە هەولێر لەنێو قەیسەری، لەلای حاجی سیروانی دەرمانفرۆش، ئەحمدەسووری خەیاتمان دیتەوە، بڕیاربوو لەگەڵ ئێمە بگەڕێتەوە بۆ خۆرهەلاتی کوردستان. پارەی لای حاجی عەلی پێڵاوفرۆش بوو، لە تەورێز چەند قالبێکی پێلاودروستکردنی بۆ هێنابوو، پارەکەی وەرگرتبوو لەترسی ژیانی و بۆ سەلامەتی، نەیدەویست بەتەنها بگەڕێتەوە، چونکە لەو سالانە کەسێکی خۆرهەلاتیان بۆ دوو پالتۆ کوشتبوو و زۆر شتی هاوشێوەی لەوجۆرەش ڕوویاندابوو. دایکو باوکی ئەحمدی پێیان گوتبوو دەبێ لەگەڵ کاک حازمی بگەڕێیەوە، وەک بڵێی لە ئەمانەتی مندابوو.

منو مینەو ئەحمدەسووری خەیات بڕیارماندا بەیانی بگەڕێینەوە بۆ ڕانیەو لەوێشەوە بۆ ئێران، تەنها باری دوو هێسترمان پارچەی وردی ئۆتۆمبێل کڕیبوو بەڕێمانکرد بۆ ڕانیە. بەیانی کە چووینە گەراجی هەولێر - ڕانیە، گوتیان ئەتۆو مینە دەتوانن بڕۆن، بەلام ئەحمەدەسووری خەیات خەڵکی ئێرانە، دەبێت قائیمقامی قەزای مەرکەز بیبینێ و کاغەزی گەڕانەوەی بداتێ. ئێمەش چوینە لای قائمقام هەندێک کوڕەجاش و بەعسی لێبوو، بە هەزار دەردەسەری

چووینە ژووری قائممقام، بۆ ئەوەی من ببمە دەستەبەر (كەفیل)ی ئەحمەدەسووری. كاتێک چووینە ژووریّ داواكاریەكەمان بە قائممقام ڕاگەیاند، دیاربوو بە لینگاوقوچی حاڵی ببوو، بۆیە ڕووی لە من كرد گوتی: مۆڵەتم نەدەدای بچیە ڕانیەی، بەڵام لەبەر خاتری ئەو برایەی كە مەبەستی ئەحمەدەسور بوو، بڕۆ، كێشەت نابیّ، ئەو كەفیلت بیّ. هاتینەوە بۆ گەراجی. مینە و ئەحمەدەسوور دەیانگوت لەبەرخاتری ئێمە قائممقام مۆڵەتی دای بۆ ڕانیە! لە ئاسایشی گەراجی ڕانیە. گوتیان: ها چیتان كرد؟ گوتمان: ئەوە كاغەز كاكە ئەو برادەرە خزمی قائممقامی دەرچوو، كە ئێوە نەتانهێڵا بڕوا، ئەو بووە كەفیلی ئێمەش! دیار بوو ئاسایشەكان نەوەكو ئەحمەد نانبڕاویان بكات لەلای قائممقامی، ئاسایشێكی بە گەڵداین گوتی: هەتا ئەو خزمەی قائممقامی بەڕێدەكەی بۆ ڕانیەی، نەگەڕێیەوە!

لە چوارقورنەی، میوانی شەهید عەزیزی پورزام بووین. شەویّ پیاوێكی خەڵكی چوارقورنە كە ئەندامی كۆمیتەی یەكیەتی بوو، هاتەلای شەهید عەزیز، لە دوای هەواڵپرسینی یەكتر، گوتی: خێرە هاتوونە باشوور؟ چیتان بەدەستەوەیە؟ گوتم هەندێک فەرشمان هێنابوو، بڕێكیش ئەشیای سەیارە لەگەڵ خۆمان دەبەینەوە، ئەگەر لەو دۆزەخە ڕزگارمان بێت! (كێشەیەكی كۆمەڵایەتی لە گۆڕیّ بوو، نامەویّ ناوی بێنم) گوتی: بۆ نایەن هەموو دەزگای كارگەی بلۆكی ماڵی (سەفیری ئەحمەدی خاڵە)تان بدەینیّ، لە ئێران پارەی چاك دەكات. نیوەی بۆ ئێوە نیوەی بۆ یەكیەتی! گوتم: بەهۆی خۆپاراستنمە لە تالانی، بۆیە ملم لەو كارەسەختەی ناوە، ئەوە ماڵی خەڵكە بە من قوت نادریّ!... ئای چ سفربوونەوەیەكی ئەخلاقیی مرۆڤی كوردە، دەستبردن بۆ ماڵی جیرانی خۆت، تەنها لەسەر جیاوازی فكریو سیاسی!

کاکی خوێن سەوز گوتی: ئەوە باسی چیدەکەی کاک حازم! ئەوە ماڵی پارتیانە، پارتی سەرو ماڵیان حەڵاڵە!... ئای چ ئازاربەخشە بە چاوی خۆت ببینی نیشتمانت بەستەڵەکی نەزانین و هەرەسهێنانی ڕەوشتە!

ئەو شەوە باسی پیاوێکیان کرد لە ڕانیە، گوایا بە پارە بۆمبی نارنجۆک دەخاتە نێو هەر خێزانێک خۆت بۆی دەست نیشان بکەی. دیارە یەکێک داوای لێکردبوو دوو نارنجۆکی بۆ هەڵبداتە نێو دوو خێزان، ئەویش ڕەزامەندی نیشاندابوو. دوای ئەوەی لەسەر پارەکە پێکهاتبوون، نارنجۆکەکانو پارەکەی لێوەرگرتبوو. لەوکاتەدا پێیدەڵێ: نابێ پەلەم لێبکەی، چونکە خەڵکت زۆر لەپێشە بۆ ئەوکارە، دەبێ سەبرت هەبێ تاوەکو نۆبەت دێت، وەک مەلاکان دەڵێن (الصبر من الرحمن)، کاتێک نۆبەت هات ئەوکات سەیری کاکی خۆت بکە چۆن شین و ڕۆ ڕۆ دەخەمە نێو ماڵەکانیانەوە!

لە ڕانیە چووینە ماڵی محەمەدی مام ڕەسوی سوورەدێی، کاک محمد گوتی: منیش لەگەڵتان دێم بۆ ئێران، بەڵام ڕۆژەکەی زۆر سارد و سەختە، وا چاکە نەڕۆین! مینە ئەو قسەیەی پێخۆشبوو، چونکە لە شەوی ڕابردوەوە هەولی دەدا کە نەڕۆین! مینە گوتی: کاک حازم، دەڵێی دەستبەخەنەی لە ماڵێ بەجێهێشتووە هێندە بەپەلەیە! مینە دەردی منی نەدەزانی کە لە ترسی جاسووسەکانی ئۆردوگای دیڵزێ، خواخوام بوو زوو بگەڕێمەوە بەر لەوەی گوزارشم لەسەر بدەنە ئیتلاعاتی ئێران و بڵێن حازم چۆتە باشوور کاری سیاسی دەکات، وەک هەموو جارەکانی دیکە بانگم بکەنو ئازاری ڕۆحیم بدەنو چەند داواکارییەکی بێمانام لێبکەن، کە لەگەڵ ویژدانو ئەخلاقم نەدەگونجاو لێک هەڵدەبەزییەوە!

ئۆتۆمبێلێکمان بەکرێگرت بۆ قەلادزێ، وردەواڵەکەمان لێ بارکرد،

لە ڕاستی غاباتی ڕانیەو کێوەڕەش، بەفر کڕێوەی دەکرد. لە قەڵادزێ چووینە گەراجی سونێو قاسمەڕەشی، شۆفێرێک لەندکرۆزەرێکی مۆدێل ٧٩ پێبوو، ناوی هەمزەی حاجی سوورەی شێنێی بوو، بەکرێمانگرت بۆ سونێ، پیاوێکی دیکەش سواربوو.

بەڕێکەوتین بۆ سونێ. هەتا زیاتر بەسەردەکەوتین بەفر زیاتر دەباری، بای توندترو ساردتر دەکرد، لە سەیدەحمەدان ڕەت بووین، گەیشتینە سەر زینوێ شێوەڕەزێ، ئۆتۆمبیلەکە زۆر بە ئەستەم دەیتوانی ئەو بەفرە ئەستوورە ببڕێ. لە هەمووی ناخۆشتر ئەو زریانو کڕێوە بوو کە شووشەی ئۆتۆمبێلەکەی سپی دەکردو ببووە ماشێنی بەفرین! شۆفێرەکە زۆر بەزحمەت ڕێگاکەی دەشکاند، دوو سێ جار چەقی و پاش و پێشی پێکرد، کەسمان نەماندەتوانی دەرگای ئۆتۆمبێلەکە بکەینەوە. بۆ دواینجار لە هەورازی گاڕەقەی، ئۆتۆمبێل چەقی، مەکینەی کوژاوە. ئیدی لەگەڵ زەوی لێکی بەست و بوو بە بەشێک لەو گردە بەفرانەی قەراغ ڕێگا. لە ئۆتۆمبێلەکەدا لە سەرمان نەمانتوانی ئارام بگرین، منو مینە و ئەحمەدەسوور و محەمەدی مام ڕەسووی، لەگەڵ ئەو پیرەمێردەی کە هێشتا ناوی نازانم، پیرەپیاوێکی کەڵەگەتی ڕەشئەسمەری ڕەقەڵەی داڵەبوو. لەنێو ئۆتۆمبێلەکە تەگبیرمان کرد، یەکتر بەجێنەهێڵین بەرەو گوندی دووبێ کە سەرەونشێو بوو، بڕۆین.

پلەی سەرما، بە مەزەندەی من ڕەنگە زۆر ژێر سفر بووبێت. هەرچەند هەنگاوێک دەڕۆیشتین، ترسی بەفر بەسامتر دەبوو، بە گەردەلولی زریان ببووین بە پەیکەری بەفر. هەموو گیانمان خەریک بو ببێتە چلوورە، سمێڵمان شەختەی کردبوو، ڕۆژێکی وەیشوومەو تێکوەشان! مینە ئاوڕێکی لە من دایەوە، بەفری سەر برۆو دەموچاوی سڕی بە زمانی جەستە حاڵیی کردم کە لە سۆنگەی پێداگیری تۆ بوو،

خەریکـە چارەنووسـێکی نادیـار چاوەڕێمـان دەکـات، منـیش بـە سەرلەقاندنێک تێمگەیاند کە ڕاست دەکەی ئەمن هۆکاری ئەوەم!

تـەنها بـە حـاڵ تارمـایی ڕێگاکـە دیـاربوو، لـە دوای چەنـد جـار خلیسکان‌و سەرەنگرێبوون، محەمەد لەپێشەوە دەڕواو مینە لە دوای محەمەدی‌و ئێمەش بەدوایانەوە، چەند هەنگاوێک و لە چاوانمان ون دەبن، شوێن پێکانیان هەر زوو زریان پڕی دەکاتەوە. من دەمتوانی لەگەڵ ئەوان بڕۆم، بەڵام ئەو پیرەمێردەی لەگەڵمان بوو، کەوت‌و هەڵنەستایەوە، ئەحمەدەسووریش لەلایەن داک و باببیەوە ئەمانەتی من بوو، نەدەبوو بەجێی بهێڵم، نەشماندەزانی چەندمان ماوە بۆ گوندی دووبێ. محەمەد ڕۆیشت‌و ون بوو لە چاوان، مینە پشتی کردە زریان‌و گوتی ناتوانم لەسەرتان ڕاوەستم، ڕەق هەڵدێم، دەڕۆم! ئەمنیش گوتم بێویژدان ئەو پیاوە پیرە بەجێبهێڵین دەمرێ، قسەی پێ ناکرێ‌و ناتوانێ لەسەر لاقەکانی بوەستێ. مینە دەڵێ من تەنها دەتوانم خۆم ڕزگاربکەم و ئەو ڕستەیەو لەنێو کرێوەو زریان پێچرایەوەو لە چاوان ون بوو. من و ئەحمەدەسوورو پیرەمێرد ماینەوە. باش بوو ڕێگاکە سەرەوژێر بوو، لە دوای خۆمان پیرەمێردمان ڕاکێشا، پێڵاوەکانی لەپێی داکەلاو هەڵمگرتنەوە لەبەر پشتێنی خۆمراکرد. لەو چرکەساتە سەرنویشتسازەدا، تاهیری عەلی والی و هاوڕێکانی و ئەو پێشمەرگانەی پارتی، کە پێیەکانیان ڕەش ببوو لە بەفرداو پێیان بڕینەوەو، هەر هەموو ئەوانەی لە بەفردا ڕەق ببونەوە وەک فیلم دەهاتە بەرچاوم! مەودای بینین لە چەند مەترێک زیاتر بڕ ناکات، برژانگ بۆتە سوانەی چاوو، سمێڵ چلوورەی ساپیتەی خانوو.

چ هەواڵێک! چ لەدایکبوونێکی نوێ، تارمایی دوو دەرگاو بەرهەیوانی ڕەش، وەک کونەکەپووی بەفر، چ ئاوازێک و سەمفۆنیای ژیانەوە!

حەپەی سەگێک، بە ئەحمەدەسوور دەڵێم: تەماشاکە ئەوە ماڵێکو وەڕینی سەگێک! ورەمان بەرز دەبێتەوە. ئەو پیاوە پیرە زۆر سووکتر لەدوای دەستمان دێت. خۆمان کرد بە یەکەم ماڵدا، بەر لە هەموو شت ئەو پیاوە دەبەینە ژووریو گۆریەکانی کە دڕابوون لەپێی دادەکەنینو درێژی دەکەینو بەفرەکەی لێ دادەتەکێنین، پێڵاوەکانمان دادەنێین، ژورەکە هێندە تاریک بوو تەنها لە کونی سۆبەکەوە پۆلۆی[1] داربەڕووە سوورەکان مژدەی ژیانو ئاوەدانی پێدەبەخشین. هیچی دی بەدی ناکەین لەناکاو کاک محەمەدو مینە پێمان دەڵێن: باش بوو گەیشتن! ئەوان هەر لەو ژوورە بوون، بەڵام نەمانبینیبوون. نابێ لە ئاگر نزیک بینەوە! کاتێک پیرەپیاوەکە جوڵایەوەو بەفری پێوەنەما، کچی ماڵەکە گوتی: ئای بابە ئەوە ئەتۆی؟! ئەویش گوتی: کچم ئەتۆ بۆ لێرەی؟ کچە گوتی: بابە ئەوە ماڵی خۆمانە، چۆن نازانی؟ دیاربوو گوندی دووبێ بوو، ئەو پیاوەپیرەش ناوی مام برایم بوو. بۆ شەوێ، حاجی حەمەشەلەی مامەش ئێمەی بردە ماڵی خۆیان، چونکە ئەو ماڵەی لێی بوین شوێنیان بچوک بوو.

بۆ بەیانی کەشوهەوا تا ڕادەیەک ئارام بوویەوە. کاک هەمزەی شوفێر تراکتۆری بەکرێ گرت، ئۆتۆمبێلەکەی هەتا دووبێ ڕاکێشا، بەڵام محەمەدی مام ڕەسووی، گەڕاوە بۆ ڕانیە، گوتی وا زوو ڕێگای ئێران نابێتەوە! هەمزە بارەکانی بۆ ئێمە گەیاندە سونێ کە ئەرکی ئەو بوو. پارەمان دایێ، بارەکانمان لە ماڵی فەقێ عەزیزی دانا لە سونێ. چوینە بەردقسڵێ، نازانم ماڵی کێ بوو، چایەکمان خواردەوە. گوتم: مینە ئەو ماڵە زۆر نەدار دیارن با باریان گران نەکەین! مینە گوتی: پاشنیوەڕۆ دەچینە گوندی زێوکەی. لە گوندی کونەمارەی کە دوو

---

[1] - پۆلۆ: پۆلووپشکۆ، پەنگر.

سێ ماڵ بوو، نزیک بوینەوە. کوڕێکی کەڵەگەتی سوورە، چاوی بە ئێمە کەوت، دیاربوو مینەی دەناسی، بەڵام منی نەدەناسی، لەتفەنگەکەی نزیک بۆوە، منیش گوتم: مینە ئەگەر من هیچی لێبزانم ئەو کوڕە دوژمندارە. مینە گوتی: ئەوساڵ پیاوێکی کوشتووە لەسەر کێشەی کۆمەڵایەتی.

سڵاومان لێکرد، ماندوو نەبونی لێکردین، گوتی: فەرمون بچینەوە ماڵی ئێمە لە زێوکەی. مینەش گوتی: هەر بۆ ماڵی ئێوە دەهاتین. چووینە زێوکەی، منیش ئەو ماڵەم زۆر پێ خانەدانو میواندۆست بوو. بۆیە لەگەڵ مینەی بڕیارماندا دوو هێستر بەکرێ بگرین بچن ئەو دوو بارە لە سونێ بێنن. مینەش دوو هێستری بەکرێگرت کە یەکیان باش بوو، بەڵام یەکیان هی منداڵێکی ١٠ ساڵان بوو، کە باوکی بەر مینی کەوتبوو شەهید ببوو. داکی ئەو منداڵە هێسترێکی بۆ کوڕە دە ساڵانەکەی کڕیبوو کرێباری پێبکات.

کاتێک کە گەڕانەوە لە سونێ، تەنها یەک باریان هێنابوو، گوتمان ئەی بارەکەی دی؟ گوتیان لە بەردقسڵێ پەڕینەوە، شینکەکی لێبوو، هێستر بە بارەوە هەڵدێرا بۆ نێو ڕووباری، لەنێو ڕوباری بارەکەی لێبۆوەو هێسترەکە هاتبۆوە دەرێ. ئەو بارە هەمووی بووش و ڕینگو یاتاغو پستۆنو شتی وردەو بەنرخ بون. ئەو شەوە بە خەیاڵی ئەوەی یەکی چەندمان زەرەر بەر دەکەوێ و چەند لە سەرمایە و قازانجی قەرزاری خەڵک دەبینەوە، خەومان لێنەکەوت. دەم نا دەم دەمگوت: مینە فلان شت لەنێو کامە باری بوو؟ ڕێک دەیگوت ئەوەی نێو ڕووباری! واتە شتە بەنرخەکان هەمووی لە ڕوباری کرا!

بەیانی کە لە خەو هەستام، چوومە سەرئاوێ، سەیری ئاوایی زێوکەم کرد، دوکەڵی داربەڕووی سۆپاکان توێژاڵێکی شینیان لەسەر ئەو گوندە دروست کردبوو، لوولەی هەموو سۆپاکان نیشانەی

ئاوەدانییان پێدەگوتی، کاتێک سەیری ئاسمانم کرد دەتگوت ڕێوی لێستیتیەوە، گزنگی تیشکی خۆر تازە لێوی خستبوە سەر چەرخەی ڕوومەتی سەری مامەندەیو باسکی لە ملی چەکوچو سادری دەهالاند. قەدپاڵەکانی جاسووسانو قۆتەمانو مامەندەو دەشتی سەرخانێ، هێندەی بەفر لێبارییبوو، لووس لووس گرێی تێدا نەمابوو، دەتگوت خوداوەند بە مەبەست دەیەوێ مێژووی ڕەشی خراپەکاریی براکوژەکانو نۆکەرانی داگیرکەران، کە ڕووی نێو مرۆڤایەتییان نیە، لەژێر ئەو بەفرە تاقەت بکاتو بۆ هەتاهەتایە بیشارێتەوە!

کە دەمڕوانیە هەردوو بەری ئەو دۆڵە، لە قەدپاڵەو نواڵەکان، وەک دوو توێی دەفتەری خوداوەند سپی بوون، سپی وەک نێولەپی موسا، چاوەڕوانی دەستوقەڵەمی خوداوەند بوون. گاتاو سروودو ئایەتەکانی ئاشتیو پێکەوەژیانی مرۆڤایەتی لێ بنوسێتەوە و نەفرەت لە خوێنڕێژی بەینی قابیلو هابیلەکان بکات!

ئەو دیمەنە دڵڕفێنە خەریک بوو خەمی ئەو زەرەرو زیانەم لەبیر بباتەوە، کاتێک بانگیان کردم نانی بەیانی بخۆم. دیارە محەمەدی ڕەسووی ئەحمەد باپیری، لەگەڵ ژنو منداڵی خۆیو خەیاڵی خوشکی، کە خەیاڵ خان خێزانی حەسەنی کوێخا عەوڵای زێوکەی بوو، پێکەوە دەژیان. لەگەڵ نانخواردن تەگبیرمان کرد چۆن بچین بارەکە دەربێنین لەنێو ڕوباری! لە دوای نانخواردن منو محەمەدو مینە و چەند کەسێکی ئاوایی، شۆڕبوینەوە بۆ سەر ڕووباری بەردقسڵێ. ڕووبار داوای خوێنی دەکرد! نێڵەی شەپۆلان لەگەڵ گابەردەکان ئامبازو بەرانگژی یەکتر دەبوون، مینە گوتی: کێ دەتوانێ هەتا پشتێنی بچێتە نێو ئاوەکە؟ پارەی دەدەمێ!

پیاوێک بەناوی حەمەڕەش کە پیشەی کورتاندووری بوو، خەڵکی بەردقسڵێ بوو، گوتی من دەچم. مینە گوتی: سەت دینارت دەدەمێ.

خەڵكێكی زۆرمان لێ كۆبۆوە، كاتێك حەمەڕەش چوە نێو ئاوەكە، هەر زوو هاتەوە دەرێ، بایەكەی هێندە ساردبوو، دەستبەجێ شەرواری ڕەق بوو، وەك چلوورەی بەستی! ئەو جارە مینە گوتی بۆت دەكەمە دوو سەت دینار، ناردییەوە نێو ئاوەكەی. مینە شەروارەكەی گرتبوو نەبادا ئاو بیبات لە دەلینگی هەتا نیفۆی شەرواری درا، چونكە بەستابووی، دەتوانم بڵێم شكا نەك درا! دیسان نەیتوانی بچێتە قوڵتر. ئاسنێكمان كرد بە قولاب گوریسمان لێبەست. گوریسێكمان لە نێوقەدی حەمەڕەشی هالاند، ئەو جارە چۆوە نێو ئاوەكە، مینە گوتی: بۆت دەكەمە سێسەت دینار، پاڵی پێوەنا بۆ نێو ئاوەكە، من لێی توڕەبوم گوتم: كاكە ئەوە بخنكێ دەبێ خوێنەكەشی بدەین! ئەو جارە قولابی لە گونیەك گیركرد گوتی: ڕایكێشن، كە ڕامانكێشا، یەك تای بن بارەكە بوو، ئومێدمان پەیداكرد كە دوو تایەكەی دیكەیش دەدۆزینەوە. ئاگرێكی گەورەمان كردەوە، بۆ ئەوەی حەمەڕەش چەند جاری هاتە دەرەوە لە ڕووباری، خۆی گەرم بكاتەوە. ئەو جارەیان سەربارەكەی دەرهێناو جاری سێیەم تای سێیەم. حەمەڕەش خۆی گەرمكردەوە، مینە سێسەت دیناری دایە حەمەڕەش. خەڵكەكە گوتیان: بۆ ئەوبارە بایی چەندییە؟ سێسەت دینارتان دا بە حەمەڕەشی؟! ئێمەش بۆ ئەوەی تەماعمان لێنەگرنەوەو داوای زیاترمان لێ نەكەن، گوتم كاكە نزیكەی دە هەزار دیناری سویسری دەگرێ، نیوەمان بەقەرز هێناوە. حەمەڕەش شەروارەكەی وەك كەوای مەلایان شاقەلی پەیداكردبوو، گوتم: مینە پارەی شەروارێكیشی بدێ!

چوینەوەماڵی محەمەدی لە زێوكەی، سۆبەیان گەرم بوو، دەبوایە ئەو هەموو ڕینگو وردەواڵەیە وشك بكەینەوە، نەبادا ژەنگ بێنێ. بەڕێكیان بۆ ڕاخستین، ئەو ڕۆژە هەر خەریكی وشككردنەوەی

شتەکان بووین. پارەم دا بە مینەی گوتم: برِۆ لەنێو گوندی قەلێک بکرِە سەری برِە با بۆمان لێنێن. کاتێک خەیاڵ خان بینی پارەم دا بە مینەی، گوتی ئەوە بۆچیە؟ مینەش هەرچەندی کردی لێی بشارێتەوە تا دەگەرِێتەوە، بەلاَم کاتێک ژنی خانەدانو دڵ ئاواڵەی کوردان خەیاڵ، بەوەی زانی، چاکم لێ توورِەبوو، گوتی تۆ بە پیاوێکی دنیادیدە دەچی. ئەمن قەلم سەربرِیوەو لەسەر ئاگرییە، میوانی خۆم دەناسم، بەلاَم ئەتۆ دیارە قەت میوانت نایە، بۆیە لە ماڵی خەڵکی وا بەرخورد دەکەی! من لە راست مەردایەتی ئەو ژنە دەمم بووە تەڵەی تەقیوو، زانیم کارێکی باشم نەکرد، بەلاَم مینە گوتی بەخوای خوشکم خەیاڵ ئێوەمان زۆر ئەزیەتدا ئەگەرنا کاک حازمیش ماڵی بێ میوان نیە! بەلاَم ئەو پاساوانە لاواز بوون لە ئاست ئەو کارەی من کردم. کۆمەڵگای کوردەواری ژنی چەند چاوتێرو مەزنی هەیە!

ئەو شەوە مینە گوتی: بەیانی دەرِۆینەوە داوداوەو دەچینەوە ماڵێ، رِێگا بەفرە لە دوای چەند رِۆژێکی دیکە من دێم دوو ولاَخدار لەگەڵ خۆم دێنمو بارەکان دێنمە خانێ. لەوێش ئەو شەوەمان رِۆژ کردەوە. گەرِاینەوە بۆ دیووی ئێرانێ. جاسووسەکانی دێڵزێ کە کوردی لای خۆمان، باشوور، بوون، هەر زوو خەبەریان لێدابووم.

یەک شەو لە ماڵ بوم، کاغەزێکی ئاگادارکردنەوەیان لە ئیتلاعاتی پیرانشهر بۆ هێنام کە دەبێت بەیانی بچم بۆ ئەو شوێنەی مەبەستیان بوو. من هەرچەند جاری بانگدەکرام، بە مەلا عوسمانم دەگوت ئەگەر گیرام: ماڵی ئێمەو منداڵەکانم ئاگادار بکات.

رِۆژی دوایی چووم، لە دوای کاتژمێرێک وەستان بەپێوە، بانگیانکردم. گوتیان بۆ چووبوویە عێراقێ؟ ئەتۆ ١٥ رِۆژە لە عێراقی، لە ماڵەوە نیت! گوتم چەند مافورێکم بردبوو بۆ فرۆشتن، منداڵەکانم وردنو دەخوێنن ئەگەر نانێکیان بۆ پەیدانەکەم چۆن بژین؟!

من زۆرم گوت، ئەوان بەگوێیاندا نەچوو. هێندە ئازا نەبووم، بەڵام هێندەیان کونەجەرگ کردبووم هێندەی بانگم بکەن، بڕیارمدابوو ئەوەی لە دڵمدایە پێیان بڵێم. گوتم: ئەوانەی گوزارشیان لەسەر من داوە، کاتی خۆی جاسووسی سەدام بوون، گەر بچنە پاکستان‌و هیندستانیش، بێ مەردووم ئازاردان ناتوانن، ئەزیەتدانی خەڵکی لەگەڵ خوێنیان تێکەڵاو بووە! ئەو کاتەی ئێوە شەڕتان بوو لەگەڵ سەدام، منیش دوژمنی سەدام بووم شەڕم لەگەڵدا دەکردو، ئەوانەی گوزارشیان لە منداوە، ئەوکات جاسووسی بەعسی بوون، واتا دوژمنی من‌و ئێوە بوون، ئەگەر وەفایان بۆ وڵاتی خۆیان نەبێ، بۆ ئێوەشیان نابێ. خۆی تووڕە کردو گوتی: بیبەنە سلولی تاکەکەسی، هاتن بمبەن پیلیان گرتم، گوتی: لێگەڕێن! دەستی بەقسەی بێمانا کردەوە، گوتی: تۆ بەو هەموو ڕێگا ترسناکە هاموشۆی عێراق دەکەی، ئەگەر لەگەڵ ئێمە هاوکاری بکەی، بە ئازادی بەرگەت بۆ دەکەین، بۆ هاتوچۆی عێراق. وا دەکەین لەنێو یەکیەتییش یارمەتیت بدەن. ئەوەی ئێمە دەیڵێین لە بەرژەوەندیتە، هەرچی داواکاریت هەیە داوا بکە بۆت بکەین! منیش گوتم ڕاستیتان پێدەڵێم مانەوەی من لێرە دوو هۆکاری هەیە، یەکەم شەڕی یەکیەتی‌و پارتی، دووەم خوێندنی منداڵەکانم، کە خزمەتی فەرهەنگی فارسی دەکەن. مانەوەم زەرەر بە کۆماری ئیسلامی ناگەیەنێ، نە دەرکردنم قازانجی پێدەگەیەنێ. من دەتوانم هەتا لێرەبم زەرەرم بۆ خەڵکی ئێران نەبێت. سوپاستان دەکەم چەند ساڵە لێرە گیرساومەوە وەک پەناهەندە، ئەگەر بڕیاریش لەسەر دەرکردنم بدەن، دەڕۆم. کە زانی هیچم لێ هەڵناکڕێ گوتی: بڕۆ ماڵت بپێچەوە بۆ بارکردن. گوتم: بەسەرچاو، بەڵام کەس میوانی بێ زەرەر لە ماڵی خۆی دەرناکات. ڕۆیشتم لەلای دوو برادەری خۆشەویستم باسمکرد کە خەڵکی چەپ‌و کۆنە سیاسی خۆرهەڵاتی

بوون، یەکیان گوتی: دەرت ناکەن. گوتم: ئەوەنیە دەڵێن دەبێ بڕۆی. برادەرەکەم گوتی: نایانەوێ خەڵکی وەکو تۆ بچێتەوە نەبادا بەرپرسیاریەتیەکت بدەنێ لە باشوور. منیش پێکەنیم گوتم: کاکە من خۆم لە هەر کەسێکی دی باشتر خۆم دەناسم، هەتا من لەسەر ئەو بیروبۆچوونەم بم لە ئێران‌و عێراق ئالیکی دوو کەرم بەدەست نابێت!

کاتێک گەڕامەوە دێڵزێ، لەپەنای دیواری حەمامێ خەڵک خۆیان دابووە بەرتاوێ، یەک لە جاسووسەکان لەنێویان بوو، ئەمنیش سڵاوم کرد، گوتیان دە وەرە کاک حازم لە شاری‌و لە ڕادیۆی دەنگوباس چیە؟ ئەمنیش هەر پێشم دەخوارد بە بینینی ئەو کەسە. گوتم: یەک پرسیارتان لێدەکەم، ئەگەر وەڵامتان دایەوە، هەموو دەنگوباستان بۆ دەگێڕمەوە، گوتیان: باشە بڵێ! گوتم: کێ دەزانێ ژنی ئەو کەسانەی جاسووسی دەکەن بۆ دەبنە لەشفرۆش؟ هەمویان سەیری ئەو کەسەیان کرد، هەریەکە شتێکی گوت. ئەمنیش گوتم: نەتانزانی! هۆکارەکەی ئەوەیە ژن کاتێک سەیری عیزەت‌و شەهامەت‌و ویژدانی هاوسەرەکەی دەکات، ئەو کارە قێزەونە دەکات، ئەویش دەڵێ خۆ لەشفرۆشی باشترە، من بۆ نەیکەم! کاکی جاسوس ملی شۆڕکرد نێو پیاوانی جێهێشت.

جاسووسەکەی دیکەم وەبەر دەستی نەکەوت. هەتا ڕۆژێک لەگەڵ محەمەدی مەلا نەبی و وەستا سەعدوڵاو نەبی جەباری ڕاوەستابووم، هات داوای پارەی کارەبای کرد. ئەمنیش لەخوام دەویست بێنووی پێبگرم، گوتم پارەی من زۆرە بۆ ئەوەندەم بۆ هاتووە؟، قسەیەک لەوی یەک لە من، گوتم: سەگی سەگباب زلەیەکت لێبدەم یەک کوندە میزت پێدەکەم! هەندێک جنێوم پێدا بۆ ئەوەی نابێ لێرە بیاننووسم! هیچ دەنگی نەکرد ملی شۆڕ کرد. ئێستاش بە محەمەدی مەلا نەبی دەڵێم: بۆ دەستت نەگرتم؟ ئەگەر لێم بدابایە؟! گوتی: دەمزانی دەست

ناکاتەوە مرۆڤی دز حیزە!

لە دوای دوو ڕۆژ لە دەزگای (کاروباری پەناهەندان) بانگیان کردم، گوتیان: لە ئیتلاعات دەڵێن با ماڵی نەپێچێتەوە، بەڵام نابێ بچێتەوە عێراق، مەگەر بە مۆڵەتی ڕەسمی نەبێت!

مینە گوتی: بۆرەخزمێکمان لە مهاباد ئەو پارچانەی ئۆتۆمبێل دەکڕێ و دەفرۆشێ. با سەرێکی بدەین بزانین لێمان ناکڕێ! گوتم: بۆ نا؟ ئێمە بۆ فرۆشتنمان هێناوە، کێ بیکڕێ بۆ ئێمە جیاوازی نیە. گوتم: ناوی چیە مینە؟ گوتی ناوی مەحمودە سوورە.

چوینە مەهابادێ، لەوێ سەرمان لە دوکانی ئەو کەسەدا. دیاربوو کاتێک زانی پارەکانمان ڕەواجی هەیە، هەر خۆی کردە داکبرای مینەی! گوتی: بەخۆم لێتان دەکڕم، با خەڵکی ساختەچی قۆڵتان نەبڕێ! بەهەرحاڵ، خۆی کرد بە فریشتەو پیاوێکی دەستپاک. ئێمەش هەمومان پێفرۆشت. گوتی: پارەکەی، کەمێکی ئێستا دەتاندەمێ باقیەکەی ١٥ ڕۆژی دیکە. ئەمنیش گوتم: ١٥ ڕۆژ زۆرە، با ١٠ ڕۆژ بێت، با ئێمە بێبەڵێن دەرنەچین لەلای ئەو برادەرانەی هەولێر، چونکە ٦٠٠٠٠ دینار قەرزاری ئەوانین، یەکەمجاریشە شتیان لێدەکڕین، با متمانە لە دەست نەدەین لەلای ئەوان. گوتی: بەسەرچاو! لەکاتێک خەریکی ژماردنی شتەکان بووین، دوو عەجەمی تەورێزی چاویان پێکەوت، گوتیان: پێمان بفرۆشن! مەحمودەسوور گوتی فرۆشراوە! مینەش گوتی: ئێوە بە چەندی دەتانەوێ؟ نرخێکیان گوت کە مەحمودەسورە قازانجی دەکرد. ئەمنیش گوتم: کاک مەحمود ئەو عەجەمانە قازانجت دەدەنێ بە پارەی نەقد، بۆ نایاندەیێ؟ ئێمەش شەرمەزاری هەولێری نابین! کردییە شێلەوبێلە پێی نەفرۆشتن. گوتم: ئەو شتانە بۆتە ماڵی تۆ، پێم خۆشە هەر ئێستا لە ئێمە زیاتر قازانجی لێبکەی. گوتی: کڕیاری تایبەتیی خۆم هەیە.

گەڕاینەوە پیرانشهر، من هەر لە خەیاڵی ئەوەبووم دەبێ کەی ئەو پارەمان بداتێ، شەرمەزاری ئەوانەی هەولێر نەبم. مینە لە دوای چەند ڕۆژێک چۆوە مەهاباد، کاتێک دەچێت دوو دەستەکرێیار لەسەر شتەکان دەبن، قازانج دەدەنە مەحمودەسوورە، بەڵام نایانداتێ. ١٢ ڕۆژ تێپەڕی، خەبەرێک لە پارەکە نەبوو. ئێمە لەسەر ئاوو ئاگر بۆ دانەوەی قەرزی هەولێر، بەڵام مەحموودەسوورە مێش میوانی نەبوو!

هەرچەندی ئێمە بە نەرمیو تکاو پاڕانەوە دەماندواند، بێسوود بوو، لە کاتێکدا بێبەڵێنی و لە دەستدانی متمانە لەلای هەولێرییەکان لە ناخەوە ڕۆحی دەگەستمو قوڵپێکی دەستبردن بۆ هەڵەیەک بەرامبەر مەحموودەسوورە وەک ڕەشەبا لەگەڵ خۆی لولیدەدام! بەنێو ئەو تونێلی دۆزەخەدا بگەیە مهاباد، لەوێش ئاوا بە ناشیو کاڵفامو بێدەسەلاتت بزانن! ڕەنگە لە دوای چەندان ساڵی دیکە ئەو خوێنەرەی ئەو ڕوپەرانە بخوێنێتەوە، بڵێ ئەو مرۆڤە بۆ دەبێ ئاوا توندوتیژ بێت! بۆیە هیوادارم شیتەڵ و لێکدانەوەیەکی ژیرانە بۆ کۆی ڕووداوەکان بکات، ئەوکات بڕیار بدات ئەوە کۆمەڵگاو ژینگەو دەوروبەرە پاڵنەری توندوتیژییە، ئەگەرنا کەس زگماک توندوتیژ نییە!

دیاربوو مینە دەیزانی مەحموودەسوورە تێکەڵی لەگەڵ دەزگا سیخوڕیەکان هەیەو دەستی دەڕوا، بۆیە هەر بەنەرمی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردو هەموو شێوازێکی لەگەڵ بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی دەستمان لەبن سەری بێتە دەرەوە، پارەکەی لێ وەربگرین. مینە دەیگوت: کاک مەحموود من شەرمەزاری کاک حازمیش دەبم، چونکە تۆ خزمی منیو من تۆم بە کاک حازمی ناساند! بەڵام ئەو هەموو شێروڕێوی هێنانەوەی منو مینەی نەدەبووە هۆی جوڵانی ویژدانی مەحموودەسوورە!

ئەوەی زیاتر هەراسانی کردبووم، ئەو جەنگە دەروونیە بوو کە

مەحموودەسووره پەنای بۆ دەبرد بۆ تۆقاندنمان، دەیگوت ئەو ڕۆژە دوو کەسی وەک ئێوە کەلوپەلی عێراقیان هێنابوو بۆ فرۆشتن لەو بازاڕەی، هەردووکیان گرتنماڵەکەشیان چوو. کەسێکی دیکە دوو ساڵە لە عێراقەوە هاتبوو بۆ مافورکڕین ئێستاش شوێنبزرە!

ئەو شەوە چووینە ماڵی مەحمود چیرەی. تا بەیانی جینگڵم دەدا لە داخی ئەو زوڵمەی مەحموودەسووری. بیرم لە سەد کاری توندوتیژی دەکردەوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەو مافە ڕەوایە. ڕەنگە ئەو ڕستەیە گران لەسەرم بکەوێ، بەڵام نامەوێ وەک هەم خۆم نیشان نەدەم. هەمیشە ئەو جۆرە مرۆڤانەی بەو شێوەیەو لە پەنای دەزگایەکی سیخوڕی داگیرکەران دەیانەوێ مافی خەڵک زەوت بکەن. بمببورن ئەگەر بڵێم، وەک کوردگوتەنی، ئەگەر بتوانم، پێمخۆشە وەک چۆلەکە سەریان هەڵقەنم!

ڕۆژی دوایی چووینەوە لای موحمووده سووری، پێمانگوت ئەگەر پارەکەمان نادەیتێ شتەکانمان بدەوە، خۆمان دەیفرۆشین. دیاربوو فرۆشتبووی. بەڵام ئەو ڕۆژە تۆڵەی ڕقێکی زۆر پیرۆز لە ناخمدا قوڵپی دەدا. ئەوەی زیاتر بەرچاوی تاریک کردم، ئەو قسەی مەحمووده سوور بوو کە گوتی من ئەو شتانەم لە ئێوە نەکڕیووە! ئەوەندەی لەبیرم مابێ جنێوێکی زۆر بازاڕیم پێداو تفم لێکرد، ئاسنێکی لە دەست خۆشم ڕاستکردەوە لە تەپڵی سەری بدەم، مینە توند ئاسنەکەی گرتو بەرزەفتی کردم، مەحموودەسوور بەسەر کورسیو بۆ پشتەوە بەربۆوە. ئەو خەریکی ڕاستبوونەوە بوو، سوێندێکی گەورەم خوارد گوتم لەو هەفتەیە ئەو پارەیەت لێوەرنەگرم دەتکوژم! ئەو سوێندەم زۆر بە یەقین بوو، دیاربوو دەستی بۆ تەلەفۆنەکەی برد کە ئەوکات تەلەفۆنی نۆرماڵ بوو، بۆ ئاگاداری دەزگا سیخوڕیەکەی خۆی، بۆ ئەوەی بمگرێت. بەڵام هەر زوو مینە

فیشی تەلەفۆنەکەی دەرهێناو نەیهێڵا پەیوەندی بگرێ. بەزمانی جەستە حاڵیی کردم: بە گرتنت دەدا تۆ بڕۆ!

من ڕۆیشتم. ئەو ڕۆژە چوومە لای سمایل قەرەداغی لەترسی گرتن. مینەش لەلای مەحموودەسووری مایەوە. بۆ ئەوەی تۆزێک ساردی بکاتەوە، نەوەک بەگرتمان بدات. بەڵام دیارە مینە زۆری ترساندبوو کە من ئەو سوێندەم بە ڕاستیەو دەیکوژم! مینە، لە زەینی مەحموودەسووری وێنایەکی (خولەپیزانە)ی بە مندا بوو، گوتبووی برایەکانی هەر باسیان ناکرێ! ئەوە گریمان ئەویشت بە گرتندا، دوایی چیدەکەی لە دەست برایەکانی!

لەترسی ئەوەی لە بازگەی دارەلەکێ بە گرتنم بدات، ئەو ڕۆژە لەلای سمایلی قەرەداغی مامەوە. ڕۆژی دوایی ڕۆیشتم بۆ پیرانشەهر. دیاربوو لە بازگەی دارەلەک بە ئاسانی تێپەڕبووم، لە مەحموودەسووری خەبەرێک نەبوو. گەیشتمەوە ماڵێ لە ئۆردوگای دیڵزە، هەستم دەکرد ئەو توندوتیژیو نادادییەی کۆمەڵگا لەنێو ماڵی خۆم دەمکاتە تاکێکی توندوتیژ، بە هەموو شتێک تووڕە دەبم، لە خێزانو هاوسەری میهرەبانو خواوەندی ماڵەکەم نایلەخان و دەست بەسەر منداڵەکان بەرز دەکەمەوە! لە کاتێکدا ئەوان نازانن من لە پێناوی نانی ئەوان خەریکە کەسایەتی خۆم ون دەکەمو دووچاری ئەوەبووم بە تۆنێلی تنۆکی دۆزەخدا دەڕۆم لەپێناوی بەدەستهێنانی پاروونانێک بۆ منداڵەکانم و ژیانێکی شەرافەتمەندانە. لە دوای هەفتەیەک مینە پارەکەی لێوەرگرت و بۆی ناردم.

لەو چیرۆکە پڕئازارە، پێشناوی کاکم بۆ مینەی بەکارنەهێناوە، لەبەرئەوەی نیە کە پێم وابێ مینە شایانی کاک نیە، بەڵکو زیاتر لەبەر دوو هۆکاریەکیان مینە ٢٠ ساڵێک لە من بچوکترە، دووەمیان خۆی وەک ئاسۆو هەردی بەرامبەر بە من ئەژمار دەکات، ئەگەر نا

ئێستاش پەیوەندی کۆمەڵایەتی و خێزانیمان هەیە. لە خۆشەویستیە، کە مینەم لەسەر زاری ڕاهاتووەو ئەویش وای پێخۆشەو ڕێزی من زۆر دەگرێ، ماڵی ئاوا بێت.

## نغرۆبوونی کۆمەڵگا

لە خۆرهەڵاتی کوردستان، لەلایەن چەند برادەرێکی یەکیەتییەوە، لیستی ناوی ئەو کەسانە نووسرا کە دەیانەوێ بگەڕێنەوە باشوور. گوایا یەکیەتی لە پاداشتی چەندان ساڵ ئاوارەبوونمان خانوومان بۆ دروست بکەن. ئێمە لە سەرەتای مانگی ٩ی ٢٠٠٤، گەڕاینەوە، من لە شاری ڕانیە نیشتەجێ بووم. نەک خانوو، خێوەتیشیان پێ ڕەوا نەدیتین!

لە دوای هەوڵێکی زۆر، وەکو گولی دوور ئاوایی، لە سایەی لیستی دوکاندارو فەرشفرۆش‌و چێوداری ناوچەکە، کە ناوی ئەوانیش بە ئاوارە نووسرابوو، هەریەکەو پارچە زەوییەکیان پێداین. ئێمە ١٧ ساڵ ئاوارەبووین، پێشمەرگەی دێرینی دانەبڕاو بووین، کەچی هاتینە ڕیزی قاچاخچی‌و جاشی زەمەنی بەعس. زەویەکانی ئێمە لە دوای ١٥ ساڵ ئێستاش خزمەتگوزاری نەگەیشتۆتێ‌و بۆ ئەو جیلەی ئێمە هەر نایگاتێ! ئەوکات ١٥٠٠ دۆلار واتا پازدە گەلای دەکرد، یانی لە بەرامبەر هەر ساڵێکی ئاوارەبوون ٩٠ دۆلار!

ڕۆژێک من و وەستا موکەڕەم کەرکووکی‌و شێرزاد عەبدولڕەزاق‌و وەستا سەعدوڵڵا چووین بۆ سەنگەسەر، کە گوایە ڕێکخراوێکی بیانی دەیەوێت خانوو بۆ ئاوارە گەڕاوەکانی ئێران دروستبکات. گوتیان لە کۆمیتەی یەکیەتی ناوەکان دەنووسن. مەبەستیان لەو ناوونوسینە لە کۆمیتە ئەوەبوو کە گوایا یەکیەتی خاوەنی جەماوەرێکی لەبنەهاتووە!

دووبارەکردنەوەی کولتووری بەعس بە جلی کوردییەوە! کاتێک کە چووینە ژورەوە، ئەو ناوە پڕبوو لە گونیە فایل‌و فۆڕمی پڕکراوە، ژوورەکەش پڕاوپڕ لە خەڵکی چەکداری زەمانی بەعس‌و قاچاخچی‌و مەڕدارو هەموو فیئەکانی کۆمەڵگا بە مەلای ئاییینیشەوە! لەوێ فۆڕمیان پڕدەکردەوە کە گوایا ئاوارەی گەڕاوەی ئێرانن. من زۆر بێتاقەت بوم لەوەی گەلەکەم ئاوا دەگەوجێندرێ‌و فێری بێکەرامەتی‌و درۆکردن دەکرێ! بە هەرحاڵ، برادەرەکانم هەندێک دڵی منیان دایەوە. گوتم کاکینە ئەو پرۆسەی ئاوەڕووتکردنی کەرامەتی مرۆڤەکان لە دوای چەندان ساڵی دی، نەوەکانی داهاتوو باجەکەی دەدەن. ئێمە نەدەبوایە بێین، چونکە هەر لە ئێستاوە دەزانم هیچمان بۆ ناکرێ. گوتیان چۆن دەزانی؟ گوتم کاکە ئەو ڕێکخراوە وای داناوە ٣٠٠ خێزانێک گەڕابێتەوە، کە لە بنچینەدا کەمتریشین. بەڵام ئێستاکە دەبینی میللەتێک، سەرتاپا خۆی ناونووس کردیە. ئەی ناپرسی ئەگەر ئەو هەموو خەڵکە ئاوارەی ئێران بوون، زەمەنی بەعس کێ کشتوکاڵ‌و مەڕداری‌و جاشایەتی کردووە لەو باشوورە؟ هەرواش دەرچوو، ڕێکخراوەکە گوتبووی ئێمە ناتوانین خانوو بۆ ئەو هەموو خەڵکە دروست بکەین کە لەسەدا دوو ٢%ی لە ئێران نەبووە!

دواتر جارێکی دیکە گوتیان تۆو شێرزادمان دەستنیشان کردووە بە نوێنەرایەتی ئاوارەکانی گەڕاوەی ئێران، بچنە لای عومەر فەتاح جێگری سەرۆکی حکومەت لە هەولێر. چاوپێکەوتنەکە لەلایەن ئارێز عەبدوڵلاو نیاز دەرگەڵەیی ڕێکخراوە. ئێمەش چووینە لای عومەر فەتاح‌و داواکاریەکانمان ڕادەستی حکومەت کرد. دیاربوو ئارێزو نیاز زۆر بەویژدانەوە ئەمنیان بە عومەر فەتاحی ناساند، گوتیان: خاوەنی شەهیدەو خۆی‌و برایەکانی هەموو پێشمەرگەی دانەبڕاون‌و زەوییان وەرنەگرتووە. عومەر فەتاح گوتی: ناویان بنووسن‌و زەوییان

پێدەدەین. کاتێک کە چووینە دەرەوە. گوتم زەوی ئێمە شتێکی دیکەیە، با لە پەنای داواکاری ئاوارەکان ناوی خۆمان نەنووسین. ئەگەر شتێک بکرێ با بۆ هەموان وەک یەک بێت!

ڕۆژێک هاوڕێیانی حزبی شیوعی لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل حمدامین سەرسیانی، لە ڕانیە هاتنە ماڵی ئێمەو گوتیان: ناوت لەسەر لیستی پێشمەرگەی حزبی شیوعی نوسراوە بۆ زەوی، ئێستا ناوت دەرچووە، خەریکی بەناوکردنی زەویەکەت بە! منیش گوتم: کاکە من زەوییم بەناوی ئاوارەی ئێرانەوە وەرگرتووە! ئەوانیش ئاگاداربوون، گوتیان: ئەو زەویە بەناوی پێشمەرگەی دێرینەوەیە بچۆ وەری بگرە. با لە پەنای زەوی ئاواران کە ١٥٠٠ دۆلار دەکات مافت نەفەوتێ! گوتم: کاکە من پێم وایە ئەگەر وەریبگرم، گەندەڵییە، چونکە هەر کەسێک مافی یەک پارچە زەویی هەیە وەریبگرێ. منیش بە وەرگرتنی ئەو زەویە مافم سووتاوە. ئەو زەویە بدەن بە یەکێکی دی، کە زەویی وەرنەگرتووە. هەرچەندی ئەوان لە دڵسۆزیو خەمخۆریان بۆ من هەوڵیاندا، ڕازی نەبوم. گوتیان: ئەگەر وابێ ژمارەی زەویەکە دەگۆڕینە سەر ناوی هاوڕێیەک کە زەوی وەرنەگرتووە، گوتم: زۆر باشە!

ئەو هۆکارەی هانیدام ئەو بابەتە بنووسم، ئەوەبوو لە چەند ڕۆژی ڕابردوودا، یەک لەو ویژدانمردو و ئەخلاقشۆڕو چاوچنۆکانەی بەیانیان لەپێش پاککەرەوەکانی شارەوانی ڕانیەو چوارقوڕنەو حاجیاوا لەدیوەخانی بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی ئامادەیە، بۆ ئەوەی دەست بەسەر چەند پارچە زەویەکی موڵکی گشتی یان مرۆڤێکی هەژاردا بگرێت، بێشەرمانە دەیگوت: منو تۆ جیاوازیمان چیە؟!

## ئازارەکانی گەوجاندن

ئاوەڕووتکردنی کۆمەڵگا لە بەها جوانەکانی مرۆڤبوون، شێواندنی کولتووری کەونارای گەلێک، پێخوستکردنی ویژدانو عیزەتو کەرامەتو ئەخلاق لەژێر پێی هەتیوچەکەی سیاسەتو دەسەڵاتو پیاوە گرگنەکانیان...

چەند ئەحمەقانەیە پلەی شەهیدو مافدارو ئازادیخوازو بەرائەت ببەخشی بە کەسێک کە خۆت کوشتوتەو، لەوەش خراپتر ئەوەیە کەسوکاری قوربانیەکە شوکرانەبژێری ئەو گەوجاندنە بن، لێتی قبوڵ بکەن!

بۆ قوربانیەکانی خۆپیشاندانەکەی ٢٠١٧/١٢/١٩ ی ڕانیە، کاربەدەستانی ڕانیە بڕیاریان دابوو، یادی چلەیان بۆ بکەنەوە، دیارە بۆ ئەو ڕۆژە منیش بانگهێشت کرابووم.

دەسەڵاتداران (هۆڵی زین)یان بەکرێ گرتبوو، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو یادە. کاتێک کە چوومە ژوری هۆڵەکە، ڕیزێک لە تەقەکەرەکان وەستابوون، بۆ بەخێرهێنانی میوانەکان. لە دەرەوەو لە ژورەوە هەریەکەو وێنەیەکی کەپسکراوی قوربانیەکانیان بە یەخەی تفەنگچیە بکوژەکان هەڵواسیبوو! چەند لافیتەو پۆستەری قوربانیەکان هۆڵەکەی پێ ڕازێێندرابۆوە. لە ژورەوە چەند ڕیز کورسی لە دوای یەکتر دانرابوون.

ڕیزی یەکەم: بۆ بەرپرسی ئەو حیزبانەی فەرمانی کوشتنو تەقەکردنیان دابوو.

ڕیزی دووەم: بۆ بەرپرسی حیزبە سێسەرو هەزارپێیە بودجەخۆرو هەڵوێست شیرتێنەکانی دەرەوەی دەسەڵات (ژێر دۆڕاوەکان).

ڕیزی سێیەم: بۆ مامۆستا ڕیاکار و فاسقەکانی دینداریو ڕیشسپی

و كەیخوداو بەگو دەرەبەگ و ئاغاو سەرۆكخێڵو گەورەی بەناو بنەماڵە ماقوڵەكان!

ڕیزی چوارەم: بۆ چالاكوانانی كۆمەڵگای مەدەنیو مافی مرۆڤ.

ڕیزی پێنجەم: بۆ ئەوانەی لە ڕێگای نمایشێكی درۆزنانەی چەواشەكاری دوور لە ڕەوشت، خۆیان وەك خەمخۆری شارو ستەملێكراوان نیشان دەدەن لەناكاو دەبنە (بنفرۆش).

ڕیزی شەشەم: چەند كورسیەك بۆ دایكو باوكو كەسوكاری قوربانیەكان، نێوەنێوەش، بكوژانی ڕۆڵەكانیان ئاوی سەفەرییان بۆ دەبردن!

كورسی قەپات...

لەلای چەپی ڕیزەكورسیەكانەوە، چەند گەنجێكی خێر لەخۆنەدیوو، گیرفانخاڵی لەسەر زەوی، سەریان خستۆتە بەینی هەردووك ئەژنۆیان، هۆن هۆن فرمێسك دەبارێنن بۆ هاوڕێ قوربانیەكانیانو بۆ بێسەرپەرشتیو پێشەنگیو بێدەسەلاتیی خۆیان، بەكوڵ دەگرین. تەقەكەرەكان بە چاوێكی تۆڵەسەندنەوە دەیانڕوانیە ئەو گەنجانە، لەناخەوە هەستم دەكرد بە زمانی ئاماژە پێیاندەگوتن ئەگەر داوای نان و ئازادی بكەن نۆرەی ئێوەش دێت!

دەستپێكی بەرنامە... چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز، خولەكێك وەستان بۆ گیانی شەهیدان. پارچە بلوێرێكی خەمناك، پێهەڵدانو لاوانەوەی قوربانیەكان، بۆ ئەوەی ئەو چەند دڵۆپە فرمێسكەی لە چاوی دایكو باوكو كەسوكاری قوربانیەكان قەتیس ماوە، بیچۆڕێننەوە، تاوەكو سۆمای چاوانیان وشك دەكات!

یەكەم وتار، بۆ ئەوانەی دەستووری كوشتنیان دابوون، ژیاننامەو چەند پێهەڵدانو باسی نیشتمانپەروەری قوربانیەكان، وەك ئەوەی خۆی دەستووری كوشتنی نەدابێتو قوربانی بە فڕۆكەی توركیا یان

لەشەڕی داعش شەهیدکرابێت. چاوەڕوان بووم باوکی یەک لە قوربانیەکان هەستێتە سەرپێ‌و پێیان بڵێ ئەو کوڕەی من ئەگەر هێندە کوڕی چاکی نیشتمان بوو، ئێوە لە پای چی کوشتتان؟! خۆ لە نانێکی ڕەق‌و قومێک ئازادی زیاتری لە ئێوە داوا نەکردبوو!

لەو شەوەدا، لە حەیرەتی ئەوانەی بێشەرمانەو بێویژدانانە پێوانەی ئەخلاقیان لاسەنگ کرد، ڕق و کوڵی دڵی خۆم بەو چەند دێڕە نووسینە ڕشت، کە تەنها بەو کاغەزە دەوێرام.

کوان ئەو کۆمەڵناسانەی ئێمەی کورد وەکو عەلی وەردی، بێن شیتەڵی ئەو کۆمەڵگایەی باشووری کوردستان بکەن! کە سی ساڵە دەگەوجێندرێ‌و لە ئاکارە جوانەکانی مرۆڤبوون ئاوەڕووت دەکرێ!

## گەواهی تیرۆرکردنێکی بەکۆمەڵ لە دوای ٢٧ ساڵ

بە پێویستم زانی، لە دوای مۆڵەت وەرگرتن لە هاوڕێ و مامۆستا ڕەوەند، گەواهی لەسەر تیرۆرکردن و زیندەبەچاڵکردنی ١١ پێشمەرگەی دێرین و قوتابیەکی زانکۆ، لەو کتێبە تۆماربکەم. هەرچەندە ٢٧ ساڵە بەسەر ئەو تیرۆرەدا تێپەڕیووە، لێ دیارە لە کاتی خۆی لە پێناوی سەلامەتی گیانی یان هەر هۆکارێکی دیکە، نەیویستووە وەک ئێستا بڵاوی بکاتەوە، هەرچەندە بۆ ئەوکات گرنگییەکی تایبەتی هەبوو، بەڵام بۆ ئێستاو ئایندەش تۆمارکردنی باشترە و گرنگی خۆی هەیە. لە (ڕێگای کوردستان)ی هەفتەنامەی سیاسیی گشتی حزبی شوعی کوردستان ژمارە ١٢٢١ لە ٢٠٢٠/١١/١٧ لە گۆشەی (بیرو را)دا و بە قەڵەمی ڕەوەند، کە مەبەست لە مامۆستا ڕەوەندە، نوسراوە، بڵاو بووەتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

## ( (لەپێناو ڕاستیدا

(حەقایق دەبێ بگوترێ، بەڵام مەرج نیە هەمووی لە یەک کاتدا بگوترێ - عەزیز محەمەد)

ڕەوەند

لە كۆتایی مانگی ئەیلوولی ١٩٩٥ هەندێک هەواڵی پچڕ پچڕمان لە بیرۆی سیاسی پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان دەربارەی هەوڵدان بۆ کوشتنی هاوڕێ (محمد حەلاق) پێگەیشت، هەواڵەکەمان بە هەند وەرگرت و بڕیارماندا بە دواداچوون بکەین و، پەیوەندی بە هەندێ دۆست و برادەرانەوە لە ڕیزەکانی یەکێتیەوە بکەین، بە مەبەستی وەدەستهێنانی هەندێ زانیاری دەربارەی بابەتەکە. هەواڵەکان کە دزەیان پێکرابوو لە لایەن کادیر و ئەندامانی یەکێتیەوە، پاش ماوەیەکی کەم دەنگوباسەکە فراوان بوو بەڕوونتر دەگوترا (کۆسرەت ڕەسول علی) ئەم کارە ئەنجام دەدات. لە بیرۆی سیاسی پارتی کار هەواڵەکەمان لە ڕیزەکانی پارتی کار بە فراوانیی بڵاوکردەوەو، لەناو جەماوەریش دەنگوباسی هەوڵدانەکە لە ئارادابوو. هاوڕێ (محمد حەلاق)یش بە وریاییەوە هاموشۆی بارەگای بیرۆی سیاسی پارتی کاری دەکرد و شەوانیش پێشمەرگەکانی لە ماڵەوە لە گەڵیدا دەمانەوە. هاوڕێ (محمد حەلاق) ئاگاداری کردمەوە کە ئەو هەواڵەی باس دەکرێت دەربارەی کوشتنی منە و ڕاستن و بەردەوام بوو گوتی: لە یادتە کە بەیەکەوە لە ساڵی ١٩٨٩ لە ناوزەنگ بووین من هەستم بە مەترسی دەکرد و شەوان لە کەپرەکەی خۆم نەدەنووستم و دووردەکەوتمەوەو ئاگاداری تۆشم دەکرد و، ئینجا حزبیش (حزبی شیوعی عێراق)ت ئاگادارکردو پاشان بە بڕیاری حزب ڕەوانەی دەرەوە کرام، ئێمە لە بیرۆی سیاسی بەردەوام بوین

لە كۆكردنەوەی هەواڵ و دەنگ و باس و گەیشتینە ئەو ئەنجامە كە ئەو هەموو پڕوپاگەندەی دەكرێت ڕاستن و پیلانێك لە ئارادایە، بەڵام ئەو پیلانە چۆنە و چۆن جێبەجێ دەكرێت كێ ئەنجامی دەدات؟ نهێنی پیلانەكەمان نەدەزانی. ئێمە لە بیرۆی سیاسی پارتی كاری سەربەخۆیی كوردستان بەردەوام بووین لە پەیوەندی لە گەڵ ژمارەیەكی زۆر لە كادیر و ئەندامانی یەكێتی لە هەولێر و كۆیە و كەمتر لە سلێمانیش، هەموو هەواڵەكانیش وەك یەك بوون و دەگوترا قسەی وا هەیە (محمد حەلاق) بكوژرێ.

تا ناوەڕاستی مانگی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٩٥ كاتژمێر ١:٣٠ دوای نیوەڕۆ بە تەنیا لە بارەگای بیرۆی سیاسی پارتی كار بووم، كە لە شەقامی ٣٠ مەتری نزیك ئامادەیی كوردستان بوو، لە ناكاو بەبێ ئاگاداركردنەوەی پێشوەختە بە جلی كوردیەوە كاك (كۆسرەت) هاتە ئەو ژوورەی كە لێی بووم، ئەو كاتە بەڕێزیان سەرۆك وەزیرانی كوردستان بوو، دوای ئەوەی ڕۆژباشی كرد و منیش بە گەرمیەوە پێشوازیم لێكرد و لای خۆم زۆرم پێخۆش بووكە بە سەردان بۆ بارەگای بیرۆی سیاسی پارتی كار هاتووە و بوار دەبێت باسی پڕوپاگەندەكانی كوشتنی هاوڕێ (محمد حەلاق)ی لەگەڵدا بكەم، كاك كۆسرەت هەندێ پرسیاری بارودۆخمان و هاوڕێیانی كرد و باسی بارودۆخی سیاسی ئەوكات و شەڕی ناوخۆ و هەژاری و بێكاریمان لەگەڵیدا كرد، بەڕێز (كۆسرەت ڕەسول عەلی) هاتە قسەكردن و گوتی: هاوڕێ ڕەوەند باش بوو لێرە بووی، حەزم دەكرد برادەرانی تریشتان لێرە بوونایە، من بۆ كارێكی گرنگ هاتووم ئەویش ئەوەیە ئێوە واتە پارتی كار پڕوپاگەندەی زۆر لە دژی من لە ناو جەماوەر بڵاودەكەنەوە كە گوایە من هاوڕێ (محمد حەلاق) دەكوژم. بۆ زانینتان من كاكە حەمەی حەلاق بە هیچ جۆرێك ناكوژم لەبەر ئەو

هۆیانە:

محەمەد حەلاق کوڕی خێزانێکی دیار و نیشتمانپەروەرە و هەموو ئەندامانی خانەوادەکەی تێکۆشەرن.

هاوڕێ محەمەد حەلاق سەرکردەیەکی ئازا و لێهاتووی پارتیزانی و پێشمەرگایەتی و ئێستاکەش سەرکردەیەکی دیاری حزبێکی نیشتمانپەروەری کوردستانە.

دایکی، شەهیدی ڕێگای ئازادی کوردستان و بەختەوەری میللەتی کوردە.

برایەکی بە تەمەن بچووک و پێشمەرگەیەکی ئازای شەهیدی کوردستانە.

هاوڕێ محەمەد حەلاق نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزە. ئاگادارتان دەکەم کە مام، لە دەرەوەی کوردستانە و لە بەیرووتەوە فەرمانم پێکراوە دەبێت هاوڕێ محەمەد حەلاق بکوژرێت، بەڵام من ئەو کارە ناکەم و ڕەتم کردۆتەوە، بەڵام شتێکی گرنگ هەیە دەمەوێت ئاگادارتان بکەمەوە کە من ناتوانم دەستەبەری ئەوە بکەم کە لە هەولێر و لە دەرەوەی هەولێر ئەو کارە ئەنجام نەدرێت، لەبەرئەوەی یەکێتی حزبێکی گەورەیە و بە هەزاران ئەندام و لایەنگر و کادیری هەیە و کەسانی واش هەنە کاری وا بکەن.

بۆیە تکایە چارەیەکی (محەمەد حەلاق) بکەن و هەرچەندە ئەو بابەتە پەیوەندی بە ئێوەوە هەیە، بەڵام من بە باشی دەزانم کاکە حەمەی حەلاق سەفەری دەرەوە بکات و جەوازی هەیە، دیسان داواکارم بایەخ بەم بابەتە بدەن و هاوڕێیان ئاگادار بکەیتەوە و خۆتان چ بە باش دەزانن ئەوە ئەنجام بدەن.

سوپاسی کاک (کۆسرەت)م کرد و گوتم: ئەو پڕوپاگەندەیەی لە سەرەتاوە کرا، ئێمە نەبووین چونکە ئێمە ئەو هەواڵەمان نەدەزانی،

بەڵکو برادەرانی یەکێتی دزەیان بە هەواڵەکە کرد و بڵاویانکردەوە، ئێمە ناوی تۆمان نەبردووە و باسمان نەکردووە، چونکە ئێمە چۆن دەزانین ئێوە ئەم کارە دەکەن، ئەوەش هەر سەرچاوەکەی ئەندامانی یەکێتی بوون، دووبارە سوپاس بۆ بەڕێزتان و هیوادارین سەرکەوتوو بن.

لە بارەگای بیرۆی سیاسی مامەوە و بە تەلەفۆن ئاگاداری ئەندامانی بیرۆی سیاسیم کرد کە پێویستە بۆ کارێکی گرنگ کۆببینەوە. ڕێککەوتین بەیانی کاتژمێر ١٠ بیرۆی سیاسی لە ماڵی هاوڕێ محەمەد حەلاق کۆببێتەوە، لەم کاتەدا هاوڕێ وریا سەعید کە سکرتێری پارتی کار بوو لە کوردستان نەبوو.

لە کات و شوێنی دیاریکراودا هاوڕێیانی بیرۆی سیاسی کە بریتی بوون لەم هاوڕێیانە (مامۆستا لەشکری، موحسین یاسین، سەلاح مەزن، ئەبو حیکمەت، محەمەد حەلاق و ڕەوەند).

لە کۆبوونەوەکەدا بە درێژی و بە ووردی باسم لە سەردانەکەی بەڕێز کۆسرەت ڕەسول عەلی کرد و بابەتە سەرەکیەکەم ڕوون کردەوە، هەروا جدیەتی مەسەلەکەم خستە ڕوو و مەترسی خۆم لە بەرامبەر بڕیارەکەی یەکێتی پیشاندا و پێشنیارەکەی بەڕێز کۆسرەتیشم خستە بەر دیدی هاوڕێیان. بە درێژی بیروڕا لە لایەن هاوڕێیانی بیرۆی سیاسی ئالوگۆڕکرا و هاوڕێ ئەبو حیکمەت پێشنیاری ئەوەی بەباش زانی کە هاوڕێ حەمەی حەلاق سەفەری سوید بکات، بەر لە هاوڕێیان هاوڕێ حەمەی حەلاق هاتەگۆ و گوتی: من سەفەری دەرەوە ناکەم و کوردستان لەبەر هیچکەس و لایەنێک بەجێناهێڵم و ئێمە لە پێناو کوردستانێکی ئازاد خوێنمان ڕشتووە، تکایە واز لەم بیرۆکەیە بێنن. وتوویژ بەردەوام بوو پاشان هاوڕێ مامۆستا لەشکری پێشنیاری کرد کە باشە هاوڕێ محەمەد حەلاق

بچێتە دهۆک و ماڵەکەشی بۆ ئەوێ بگوازێتەوە، ئەم پێشنیارەش سەری نەگرت و پەسند نەکرا.

دیسان وتوویژو پێشنیار و بۆچوونی جیا جیا خرایەڕوو بەڵام هیچی پەسند نەکران، پاشان من هەندێ قسەم دەربارەی بابەتەکە کرد و مەترسی خۆم بۆ هاوڕێیان ڕوون کردەوە و گوتم:

هاوڕێ مەحەمەد حەلاق هاتووچۆ نەکات و هەر لە ماڵ بێت چۆن دەبێت و چۆن وا دەژی؟ و لە ماڵەوە خۆی بەند بکات، بۆیە من بە باشی دەزانم بە ماڵەوە بچێتە ڕەواندوز خانوویەک بکڕین و هاوڕێ مەحەمەد سەرپەرشتی ناوچەی سۆران و دهۆکیش بکات، ئێمەدەتوانین هەندێ جار کۆبوونەوەی بیرۆی سیاسی لە ڕەواندوز ئەنجام بدەین، ئەم پێشنیارە پەسندکرا و هاوڕێ محەمەد حەلاق لەگەڵ هاوسەرەکەی و پێشمەرگەکاندا سەفەری سۆرانی کرد، حەوت ڕۆژ لە سۆران مایەوە و پاشان گەڕایەوە هەولێر و لە ماڵەوەیان لەگەڵ هاوڕێیان سەردانمان کرد و گوتی: لە سۆران لە بارەگا بووین و شوێنەکە بۆ خێزان گونجاو نیە و هەتاکو خانوویەک پەیدا دەکەین و ئێمە خۆمان ئامادە دەکەین و بۆ سۆران دەچین.

لەم کاتەدا پارتی کار خەریکی خۆئامادەکردن بوو بۆ ئەوەی دووەمین کۆنگرەی پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان گرێ بدات، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژی ١٩٩٥/١١/٢ لەگەڵ هاوڕێ ملازم ڕابەر چووینە ڕەواندوز بۆ ئەوەی کۆنفرانسی ناوەندی سۆران گرێدەین، دوای تەواوبوونی کۆنفرانسەکە ئێوارە بۆ هەولێر گەڕاینەوە و بۆ بارەگای بیرۆی سیاسی چووین، کاتێ گەیشتین چیمان دیت، خەڵکێکی زۆر لە نێر و مێ و ئەندامانی بیرۆی سیاسی و ناوەندی سەرکردایەتی لە بارەگا بوون، هەموویان خەم و پەژارە بە سیمایانەوە دیاربوو، گوتیان هاوڕێ محەمەد حەللاق و هاوڕێیانی لە

بازگەی كۆیە كەوتونەتە ناو كەمینی چەكدارانی یەكیەتی نیشتیمانی كوردستانەوە و شەڕ ڕوویداوە و نازانین سەرەنجامی هاوڕێیانمان چیە و ئەو هێزە لە بازگەی كۆیە بووە بازگەكەیان چۆڵكردووە و وادیارە هاوڕێیەكانیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ لایەكی نادیار بردووە، ڕادیۆی نیشتیمانی پارتی كاری سەربەخۆی كوردستان كە هاوڕێ هندرێن ئەحمەد بەڕێوەبەری بوو، هەواڵەكەی بڵاوكردەوە و داوای كرد كە فشار بخەنە سەر یەكێتی بۆ ئەوەی ژیانی هاوڕێیانمان بپارێزێ و ئازادیان بكەن.

سەرەتا یەكێتی نكۆڵی لەم تاوانە كرد و بێ دەنگی هەڵبژارد، بەڵام كە تەواوی حزبە كوردستانیەكان و جەماوەری گەلەكەمان هاتنەگۆ یەكێتی ناچار بوو دان بە تاوانەكەدا بنێ و شوێنی زیندەبەچاڵكردنی هاوڕێیان ئاشكرا بكات و هاوڕێیان و خانەوادەی شەهیدان و جەماوەر تەرمەكانیان لە (مەعەسكەر سەلام)ی نزیک سلێمانی لە ژێر خاک دەرهێنا. ئەگەر فشاری حزب و لایەنە كوردستانیەكان و جەماوەر نەبووایە ئەستەم بوو یەكێتی دان بەم تاوانە دابنێ.

هاوڕێ (محەمەد حەلاق) ڕۆحت شاد و یادت نەمرە، خۆزگە لە ژیان دەبوویت و ڕۆڵەكانی گەلەكەت دەدیت كە چۆن وەكو ڕۆژی جەژن بەرەو سندووقی دەنگدان بۆ سەربەخۆیی كوردستان دەنگیاندا. ڕۆحتان شاد شەهیدانی ڕێگای ئازادی كوردستان و بەختیاری گەلەكەتان.))[1]

شایانی باسە، لە دوای دەرهێنانەوەی تەرمەكان و ڕادەستكردنەوەیان بە دەستی هەریەک لە كەسوكارەكانیان و بەخاسپاردنیان، لە كاتی ناشتنی تەرمی شەهید محەمەد حەللاق لە

---

١- رەوەند، ڕۆژنامەی ڕێگای كوردستان- هەفتەنامەی سیاسیی گشتی حزبی شیوعیی كوردستان، ژمارە ١٢٢١ی ڕۆژی ٢٠٢٠/١١/١٧، لاپەڕەی گۆشەی بیرورا.

(گۆڕستانی دەروێش خدر) لە شاری کۆیە، هێزێکی چەکدار، بەمەبەستی چاوترساندن و بڵاوەپێکردنیان، بە دۆشکا تەقە بەسەر ئامادەبوانی مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەدا دەکات.

درووود لە گیانی پیرۆزی شەهید محەمەد حەلڵاق و هاوڕێکانی و تەواوی شەهیدانی ڕێگای ئازادی و سەربەخۆیی گەل و نیشتیمان.

## جاش

لە سەرەتای حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو،ماڵی خاڵم حاجی عبدالله لە گەڕەکی سێتاقان بوو لە شاری هەولێر. منداڵانی گەڕەکی سێتاقان و سەیداوە، ڕۆژانە شەڕەبەردیان بوو، کەندێکی زۆر پان و بەرین و قووڵ ئەو دوو گەڕەکەی لێک جیادەکردەوە، پڕبوو لە کوچکەبەرد. گۆنگەری ئەو شەڕەبەردە دەکەوتە ئەو کەندە، دەتگووت جەنگی مەغلوبەیە! دەبوون بە دوو دەستەی شەڕ، دەستەیەک پێشمەرگەو دەستەکەی دیکە جاش، بەڵام هیچیان ئامادە نەبوون ببنە دەستەی جاش، چونکە لە فەرهەنگ و ئەدەبییاتی مێژووی گەلەکەماندا ناوێکی قێزەونە! بۆیە وا ڕێککەوتبوون هەر ڕۆژەی دەستەیەکیان ببنە جاش.

ڕۆژێک چوومە ماڵی خاڵم، دیاربوو ئەو ڕۆژە نۆرەی منداڵانی سێتاقان بوو ببنە جاش. کوڕە خاڵێکم بە ناوی سەمیر لە شەڕەبەرد زۆر ئازابوو، هێرشی کردبوو منداڵانی سەیداوەش وەک جاشێک بە دیلیان گرتبوو. کاتێک هەردوو دەستەی سێتاقان و سەیداوە کەوتبوونە دانوستاندن، یەکەم خاڵ منداڵانی سێتاقان داوای ئازادکردنی سەمیریان وەک دیلی جەنگ کردبوو، ئەوانیش گوتبوویان بێبەرامبەر ئازادی ناکەین، کەرێکی بەرەڵا لەژێر قەڵەمڕەوی ئێوەیە، لە کاتی خۆی ئەو کەرە هی سەیداوەی بووە، بۆمان بێننەوە سەمیر

ئازاد دەكەین، ئەوانیش ڕازی بوون كەرەكە بە سەمیر بگۆڕنەوە. كاتێك لە سەری كۆلانی ماڵێ خاڵم، سەمیر دەركەوت، یەك ڕەوە منداڵی بەدوواوەبوو، خاڵۆژنم گوتی: ئەوە چۆن بوو ئازادیان كرد!؟ گوتیان: وەڵلا بە كەرە بەرەڵایەكەمان گۆڕیەوە! خاڵۆژنم گوتی: ئەیەڕۆ بۆ؟ كوڕەكەم هەر كەرەكی دەینی!؟ بریا هەر دیل بووایە باشتر بوو. سمەكەچەڵ گوتی: پلكەبەگیسی! ئاخر ئەوڕۆ ئێمە جاش بووین! خاڵۆژنم گوتی: دە وەڵلاهی ئەگەر جاش بووبن، كەرەكیش ناهێنێ!

خوێنەری قەدرگران! ئەو كوڕە خاڵەم سەمیر، ئێستا پیاوێكی ماقوڵ و خێرخوازی شاری هەولێرە، بۆیە مۆڵەتم لێوەرگرت بابەتەكە بگێڕمەوەو ناوەكەی وەك خۆی بنووسم.

بەداخەوە لە دوای ٥٠ پەنجا ساڵ، لەو چەند ڕۆژەی ڕابردوو، بینیمان لە شاری كۆیەی ئەنفالستان، چ سووكایەتیەك بە پێشمەرگە دێرینەكان و چ ئازاردانی ڕۆحیانەتی ٦١ شەستویەك شەهیدەی پێشمەرگە كرا، لە میانەی ئەو گرنگی پێدانەی یەكیەتی، بە پرسەی (مەلا ع.) جاشی بكوژی ئەو پێشمەرگانە!

ساڵی ڕابردووش لە شاری هەولێر، بینیمان پارتی و كۆیلە گەوجێندراوەكانی، چۆن بۆ كوڕی (ش. هـ)ی سێ پشت جاش، مۆڵ ببوون و وەك گاگەل بۆ شێخەكەیان دەیانبۆڕاند، تەرمەكەیان بە ئاڵای كوردستان داپۆشیبوو، ئای لەو ڕۆژە پارتی چ سووكایەتیەكی بە ئاڵای كوردستان كرد!

جێگای داخە ئەوە سێ ساڵی ڕەبەقە، دەسەڵاتدارانی هەرێم، پرۆسەیەكی زاڵمانەیان دەستپێكردووە كە من ناوم ناوە پرۆسەی بە تێكۆشەركردنی خائینان! وەك پەشێوی مەزن دە فەرموێ: قەحپەو گەوادیشتان بەشكرد!

## خوێنەری قەدرگران!

هەمــــووی دووســـــێ ســــاڵێکە، منـــیش وەک ئەنـــدامێکی تـــۆڕە کۆمەڵایەتیـەکان، لـەتـاو دارمـانی بـارودۆخی سیاسـی و ئـابووری و زانسـتی و تەندروسـتی و دادگـەری و کۆمەڵایـەتی و ئـەخلاقی و... هەفتانـە لـەسـەر ڕوداوە گەرمـەکانی ناوچەکـە بەتایبـەتی کوردسـتان، ئەوانەی کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لەسەرم دانابێت و چرنۆکیان لە ویـژدانم گرتبێت، بەتایبـەتی نـادادی و بەرتەسـککردنەوەی ئـازادی و گەوجاندنی هاوڵاتیان، بە گوێرەی توانـا هەسـتاوم بـە نووسـینی چەند بابـەتێک، بـە ئومێـدی ئـەوەی ببێتـە زەنگێکـی جارسـکەر بـۆ گـوێی بەرپرسان و ئاشناکردنی هاوڵاتیان بە ئەرک و مافەکانیان، بێ ئەوەی کەوتبمە ژێر کاریگەریی هیچ حیزب و ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو، یان وەک تارمایی لایەنێکی سیاسی بمبینن. هەوڵمداوە بێ جیاوازی ڕەخنە لە تەواوی لایەنەکان بگرم، هەڵوێستەکانم لە جۆگەلەی هیچ حیزبێک نەکاتەوە لە دژی بەرامبەرەکەی. هەوڵمداوە زەختـە[1] لە ملی ئەوانەوە بـوەژێنم کـە نیشـتیمانیان کردۆتـە دۆزەخ و زەمهـەریر بـۆ ئـەو هاوڵاتیانەی بەیعەت بە پیسخۆری حیزبەکانیان نادەن و نابنە کۆیلەو ئەڵقەلەگوێیان.

بە پێویستم زانی لە کۆتایی ئەو کتێبە، هەندێک لەو بابەتانەتان بۆ بنووسـمەوە، ئامـاژە بـە کـات و پاڵنـەرو هۆکـاری نووسـینیان بـدەم. مەبەسـتمە خوێنـەری بـەڕێز لـەوە تێبگـات ئێمـە زۆرمـان هـاوارکرد، سەرانمان کەمیان گوێگرت.

---

١- زەختە: نەقیزە.

## دەستەی بەناو دەستپاکی

دەستەی دەستپاکی یان پەشتەماری داپۆشینی عەورەتی مافیاکان.

هرچی بگندد نمکش میزنن، وای بحال روزی که بگندد نمک!

(هەرچی بۆگەن بکات خوێی پێوەدەکەن، وای بەحاڵی ئەو ڕۆژەی کە خوێ بۆگەن بکات!)

لە ٢٠١٣/٥/١٣ دەستەی دەستپاکی هەرێمی کوردستان، لە دانیشتنێکی پەرلەماندا، سوێندی یاسایی خوارد. هەموو پێکهاتەو دەستەڵاتەکانی دەستەی نەزاهە لای من ئەرشیفە، هەر کەسێک خواستیەتی، بۆی دەنێرم. من بە دەستەڵاتێکی پیرۆز و باڵای دەزانم.

چەند بەڕێوەبەرو بەڕێوەبەری گشتی و کارمەندی بۆ دامەزرێندراون، سێ باڵەخانەی هەیە، بودجەی مانگێکی کارمەندەکانی، ٢٢٠٠٠٠٠٠ دووسەدو بیست ملوێن دینارە، جگە لە دەرماڵە و خەرجیەکانی دیکە، ئەوە بەو زانیاریە کەمەی من هەمە!

بەش بەحاڵی خۆم زۆرم ئومێدو خەونی ئەرخەوانی لە سەر ئەو دەزگا گرنگەو سەرۆکەکەی، کە لە برادەرانی حیزبی زەحمەتکێشانە، هەڵچنیبوو، بۆیە هەنگاو هەنگاو لە کارەکانی ورد دەبوومەوە، بڕیارمدا تا تەمەنی نەبێتە هەشت ساڵ و خوردێک هیچی لەبارەیەوە نەنووسم و نەیڵێم.

لەبیرمە ساڵی ٢٠١٣ کە تازە دامەزرابوو گوتیان: کورسی و قەنەفەو پێداویستیمان نیە. ساڵی ٢٠١٤ گوتیان: کارمەندی پێویستمان نیە. ساڵی ٢٠١٥ گوتیان: باڵەخانەمان نیەو لە خانووی کرێداین. ساڵی ٢٠١٦، ٢٠١٧، ٢٠١٨، ٢٠١٩، ٢٠٢٠...

ئاخر بەڕێز! ئەگەر لەسەر عارەبانەی نۆکاوفرۆشتنیش بوایە، ویژدانەن دەبوو چەند وەزیرو بەرپرسێگی دزو گەندەڵ و پیسخۆر

لە زیندانەکان ببینین و لێپرسینەوەیان لەگەڵ کرابا! ئێستا هاووڵاتی مافی خۆیەتی بپرسێت ئەوە هەشت ساڵە بەو هەموو دەستەڵاتەو بودجەی بۆت تەرخان کراوە چیتان کردووە؟!

## سەرۆکی دەستە جەنابی حاکم!

دڵنیام نیو ئەوەندەی بەرپرسێک بە دوای باڵندەیەکی دەگمەندا وێڵە، بۆ ئەوەی لە باخەکەیدا لە قەفەزی بکات، ئەگەر بەڕێزتان نیو ئەوەندە، بەدوای پیسخۆرەکانەوە بای، ئێستا دەیان بەرپرست، لە زیندان توونـد کردبوو، یاسای (**من این لك هذا**)ت، بەسەردا جێبەجێ کردبوون! ڕەنگە بڵێی واقیعی هەرێم دەستوپێی بەستووین! لەبیرتە ڕەفیق سابیر لە پەرلەمان کە لە دەستەی نەزاهە بوو، لە دوای ماوەیەکی کورت، کە تێگەیشت ناتوانێت لێپێچینەوە لەگەڵ ئەو فیرعەونانە بکات، کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی کرد، گوتی: چەند کەیسی گەندەڵیم جوڵاندووە، دەبینم دەستەڵاتم بەسەر دزەکاندا ناشکێ، بۆ ئەوەی ڕووزەردی بەردەمی هاونیشتیمانیان و مێژوو نەبم، هەندێک پێوانەی ئەخلاقی و ویژدانی هەیە، نامەوێت پێشێلیان بکەم! بۆ ئەوەی نەبم بە پاشدز، ڕێگە نادەم دەستەڵات وەک دەسماڵکاغەزی لە دوای پیسخۆری دەم و فلچی خۆیم پێ بسڕێتەوە!

من، ئازادیەکانم و ئەو چاوڕوانیانەی هاونیشتیمانیان هەیانە لە من، بە هیچ پلە و پۆستێکی ناگۆڕمەوە، ناشمەوێت پارەی ئەو گەلە ماڵوێرانە بەهەدەر بدەم، بۆیە دەست لە کار کێشانەوەی خۆمرادەگەیەنم.

ئای چ مێژوویەکی شەرەفمەندانە و سەربەرزانەی بۆ خۆی تۆمارکرد، کە بەداخەوە هەموو کەس ناتوانێت لە ئاستی ئەو

بەرپرسیاریەتە دابێت!

بەڕێز سەرۆکی دەستەی دەستپاکی/

باوەڕ بکە هێندەمان ئومێد لەسەر بەڕێزتان و دەستەکەتان هەڵچنیبوو، هەنگاو هەنگاو دەمانزانی گەیشتوویت بەکوێ، هەر بۆ ئەوەی باوەڕ بکەیت کە نائاگا نین، لەو سەردانەی بەو دواییەت لە گەڵ چەند ڕیشسپی و پیاوماقوڵی سیاسی بۆ سەری ڕەش کردت، ئێمەی ماف زەوتکراوو چەوساوەی دەستی دەستەڵات و پیسخۆرەکان، دوای نوێژی تەڕاویح، نزاو پاڕانەوەمان بۆ کردی لەو سەردانە مەیدانیەت چەند دز و پیسخۆرێک لە بڵیندایی دەستەڵات بهێنیتە بەردەم دادگای گەل، بۆ ئێمەی چاولەدەستی ئێوە، ببێتە حەبێکی هێوەرکەرەوە بۆ چەند ڕۆژێک، دوایی زانیمان کە بەداخەوە!

## سوتانی بەرهەمی جوتیاران

بە بەرچاوی حکومەتی هەرێمەوە دەغڵو دانی جوتیارانی ناوچە دابڕێنراوەکان (ناوچە ئەتککراوەکانی دەستی حکومڕانانی هەرێم) دەسوتێندرێ و جوتیارەکان شەهید دەکەن، لە هەرێم بەرپرسان، مێش میوانیان نیە!

دەسەڵاتدارانی هەرێم، لەجیاتی پارێزگاری لە دەغڵو دانی جوتیارانی کوردی ناوچە ئەتککراوەکانی دەستی دووبەرەکی، خەریکن (زینی وەرتێ ئەستێرۆکان) دابەش دەکەن. لە تیڤیەکان بینیم دەغڵو دانی خەڵکی مەخموور دەسووتاو، لە خانەقین و دەوروبەری چوار کەس بە دەستی کۆنەبەعسیەکانی دوێنێ و داعش و حەشدی ئەورۆ، شەهید کرابون، کاکەییەکانی (داقوق و عەلیسەرا) مەترسیی قڕکردنیان لەسەرە. هەر لەوکاتە (تەلەفزیۆنی ڕوناهی) زمانحاڵی

کوردانی ڕۆژئاوا گوتی: ١٤ لیژنەی ئاگرکوژێنەوەو فریاکەوتنی خێرا، کە هەمویان ڕاهێندراون، بۆ ئەوەی بەرهەمی جوتیاران بپارێزن، ژمارەی مۆبایلی ئەو لیژنانە لای هەمو جوتیارێک بەردەستە!٠

من بیرم کردەوە شتێک بنووسم بەڵام ئەوەبوو لەنێو دەفتەری ساڵی پارمدا ئەو بابەتەم دۆزییەوە، کە ڕێک ئەو ڕووداوە دەشێت:

لەداقوق و عەلیسەراو خانەقین و سەرگەڕان، تەبارەی گەنمی کوردان دەسووتاو جوتیارەکان بەدیاریانەوە دەگریان، بەرهەمی ڕەنجی ساڵێکیان تەنها سووتماکێکی لەدوا بەجێ ما، سووتماکێکی ڕەش، وەکو مێژووی حوکمڕانیی سی ساڵی ڕابردووی هەرێم!

هەر لەو کاتەی جوتیارەکان دەگریان، لەنێو پەرلەمان، بەبۆنەی دانانی سەرۆکی نوێ بۆ هەرێم، شایی و لۆغان و سەماو سوڕدان بوو! منیش زووخاو و دەردەدڵی خۆم لەو پەخشانە شیعرەدا هەڵڕشت:

لەبەرهەمی ئەو شازادەیەی ئێوە سمتی بۆ بادەدەن
لە پەلکانەو لە سەرگەڕان
مرادخانی و کڵاوی بە سیم، جەمەدانی پێنج ڕێز جەلە
وەک حەیرانی سەرچیایی، قەدەغەیە
هۆکارەکەی لێتێکچوونی کەڵەباب و
ئەو بانگدانە ناوەختەیە!

لەسای سەری سەرسەریانی سەرانی کوردە ئێستاکە
لە داقوق و عەلیسەرا
کاکەییبوون، لە گوناهی کەبیرەیە
چەکی دەستی جوتیاری تەبارەسووتاو
بەس گریان و نزگرەیە

بەرپرسان کوێرن نابینن
مەقامی عەلی مەردان و سەڵتەو کەوای سەلاح داودەو
ئاوەرکراسی مالی خۆیان
بەسەر نوکی شمشێرەکەی قەعقاعەوەیە!

## دیل کوشتن

لە تیڤیەکان، چاوپێکەوتنی مەلا بەختیار لەسەر کتێبەکەی (لە بری بیرەوەری)، باسی دیل کوشتنی نەوشیروان و قرچوبڕکردنی مرۆڤەکان لە زەمەنی بەناو شۆڕشی شاخدا...

بابە تۆ چەند دیلت کوشتووە؟!

لەو ڕۆژانە چەند پرسیارێک، بوونەتە دەردو کوانی زۆر بەژانی سەر دڵم، لە قولایی جەرگمدا جێ خۆش دەکەن! ئێمە وەک پێشمەرگەی دێرین، هەمیشە نرکەو ناڵەمانە، زوخاو و خوێناویان پێهەڵێناوین بەرپرسەکان! ئاخر ئەوان پێشمەرگایەتیان وەک تەزبیح و بەرماڵ، کردبووە ڕازپۆشی خۆیان، لەپەنایدا هەرچی ناڕەواییە، هەرچی بێڕەوشتیە، کردیان. ئەو سەردەمە گیانبرژێنە کە ئێستاکە تووشی هاتم، ئەوە کاری ئەمڕۆ نییە، تەمەنێکە دەمسووتێنێ!

ئەمانە ئەو پرسیارانەن کە منداڵەکانم نێوەنێوە بەڕوومدا دەدەن و، ناخمی پێ دەئەنجن:

**بابە تۆ چەند دیلت کوشتوە؟**

**یەکەم دیل کە کوشتت کێ بوو؟**

بابە ئەوانە بۆ کوژران؟ سەعید ئێلچی و دکتۆر شوان، محەمەد حەللاق، وریا، سولێمانی موعینی، ٧٠ پێشمەرگەی پشتئاشان، مالی

حەمــەداغای مێرگەســور، دیلــەکانی قەراســنجێ، ٨٠ گــەریللای نێــو هــەولێر، ڕێبــازو مــەلا ســولێمان، ســەدان پێشــمەرگەی هــەکاری و، سەدانی دیکە...

به هەموو وجوودمەوە، بەو پرسیارانە خەریکە وەکو بەفری سەر ئاگر دەتوێمــەوە، پرســیارەکان هــەر تاســان و ناهومێــدیم نیشــان دەدەن، دۆش داماوم لە حەیبەتان، بەناچاری، خۆم لە وەڵامەکانیان دەدزمەوە!

بابە پێشمەرگایەتی یانی چی؟

پێشمەرگایەتی: ئەو کردەیە بوو نەغدینەی گیانی خۆم پێ بەخشی بۆ داگرتنی خۆری ئازادی، شانمان لە شانی مەرگدا. ئێمە عەوداڵ و گەڕیــدەی دوای یەکســانیی وەک خۆرەتــاو، بــووین. ئێمــە وەکــو وشکەسۆفی لە سەر خۆڵ مەلەمان دەکرد، خەبەرمان لە دەریا نەبوو! لە دوای چل ساڵ بێئەوەی بەخۆم بزانم، لە دەریای تاواندا خنکام، تینووی لاوانەوەیەکی خودام! ئەو کەسانەی لایان وایە هەوساری کارو ژیانمان لەنێو لەپی خۆماندابوو، ئۆباڵی نەزانییان لە ئەستۆی شۆڕی سەرکردەکانماندایە! ئەوەتا، وەک ماری بیابان گیان دەگەزن، ژیان ژاراوی دەکەن. بەبێترس لە خودا، بێ سڵەمینەوە لە مێژوو، هــەرچی ناپاکیــان هەیــە، بە گەردنــی خەونــە ســەربڕاوەکانی ئێمــەی پێشمەرگەیەوە هەڵدەواسن!

دەستێکی خاوێن و نوورانیمان دەوێ پاک و پیسمان لە یەکتری هەڵاوێرێ، ئەوە مەحەکە دەزانێ کامە زێڕێکی بێخەوشەو، کامە پیس و خەوشدارە!

ئەوەی هانیدام ئەو بابەتە بنووسم، کوڕی یەک لە پیاوەکانی بەعس کاتێک چاوپێکەوتنەکەی مەلا بەختیاری بینیبوو، نوسیبووی چاک نەبوو پێشمەرگە نەبووین!... ئای خودایە گیان هێزم پێ ببەخشە! وەک ئێمەی پێشمەرگە، ئێمەی بەوەفاترین و حەڵاڵترین ڕۆڵەی دایکی

نیشتیمان، كەتنێكمان كردبێت!

## دانپێدانانی چەند گورگەمێشێک

ئەشكەنجەدان و ناچاركردنی گەنجی كورد، بۆ چوونە نێو دەزگای هەواڵگریی بێگانە و تیرۆركردنی تێكۆشەرانی پارچەكانی دیكەی كوردستان و، دانانی ئامێری (جی پی ئێس)، داماڵینی كۆمەڵگا لە بەهاكانی مرۆڤبوون، كۆمەڵگا هەڵوەشێننەوەو كتومت هەر وەكو خۆتان، هەموومان كۆپی بكەنەوە!

لێدانی دڵمان بژمێرن، ڕووناكی چاومان قەمتەركەن، فیلمی زوومی گلێنەمان بشۆنەوە، نەوەک گرتەی شەوی سووری ئێوەی تیادا تۆماركرابێت، یان پلیكانی پەراسووی برسییێكمان نیشاندابێت. نەبادا لەنێو وێنەكانی چەتەی دەریاو مافیاكانی پاترۆل و پارەسپیكەرەوەكان، چەندین وێنەی ئێوەشی تێدابێ، فاڵچی بێنن هەموو برگە و پەڕەگرافی خەونەكانمان شیكەنەوە، نەوەک شەوێک خەونمان بە مەرگی ڕەشی ئێوەو فەنابوونتانەوە بینیبێ! هەنگاوەكانمان سندم بكەن، نەوەک دەستی ڕێگایەكی ئەوتۆ بگرین، هەڵكشان بۆ ئازادی بێ! خوانەكانمان لێ سەراوبن كەن، نەوەک تێر بین بەدوای سەپكتاندا ڕانەكەین!

هیوا بۆ دواڕۆژێكی گەش چوار مێخەكەن، كفنی چلوورەی لەبەركەن، پەڕوباڵی پێكەنینمان بسووتێنن، وڵات بكەنە وەرزی شەختە، زەردەخەنە با بیبەستێ، قاقا بەسەرپێ نەكەوێ، بزە لە خوێندا نقوم كەن، زیندانەكانمان لێ پڕكەن! كەرامەت ئەنجنئەنجن كەن، كۆیلەبوون و بێعیززەتی و جاسووسی لەسەر هاوزمان لە ناخی مرۆڤی كورددا موتربە كەن! كڵاوڕۆژنە دەرخۆنەكەن، ڕێگا مەدەن ستوونی ڕووناكی خۆریش ڕووپەڕی تێنووسی منداڵەكانمان

ڕۆشن بکات!

وا خەریکە تەمی مەرگ و مەمکەمژەی قووڵایی لمی بیابان، لە یادی نەوەی ئەم ڕۆژگارە، دەبەنەوە. تاوانی فەتوای ڕق و چەقۆ بە خوێنەکانی سەربڕین و قریشکەی لەکچکردنی پاکیزەکان دەسڕنەوە!

ئێوە، بارانی ڕەشی مەرگ و نەهامەت بوون... ئایەتەکان بێنوێژ دەکەن، بەردی ڕەجمی بەخوێن سووربوو دەشۆنەوە. لەژێر ئەو ئاسمانەی ئێوەدا هەورەکان هەرنابرینگێنن، بەهار نایە، گێژەلوولکە و کرێوەیە، ئاپۆرایەک هەتاکو چاومان بڕدەکات، تابوور تابوور کۆڵەوار و نەخوێندەوار بەڕێوەیە!

گەر قەتماغەی سەر برینمان هەڵدەینەوە، هەگبەی تاوان و بوخچەی گوناهتان دانە دانە بکەینەوە، بێگومانم کە تۆفانی خوێن هەڵدەستێ. ئاخر، عەورەتی گوناهی کەبیرە، بە پەشتەماری هیچ عوزر و بەهانەیەک، ناشاردرێتەوە!

نەبیستراوەو نەدیتراوە، لە دوای سی ساڵی دەسەڵات، مرۆڤێک وا پەروەردە بکەی، وەکو (محمود مەڕەکانی) نێفەک و مەمکی دایکی خۆی بۆ قرۆشێک ببڕێتەوە، گرتە ڤیدیۆو وێنە لەسەر هاوزمانی بۆ داگیرکەر بنێرێتەوە!

ئێوە کوڕی دایکی نیشتیمان و ڕۆحیانەتی نەتەوە نین، سەرمایەداری دایکتانە، لە پشکتان بەدگومانم!؟ من دڵنیام لە دوای ئێمە خوێندەواری باخۆشتر دێن، ڕۆمانی دۆڕاندن و ئەتککردنی نیشتیمانێک، لەسەر دەستی چەتەکانی بەناو کوردایەتی و هەتیوچەکەی سیاسەتکردن دەنووسنەوە! من گەشبینم خەونە ڕەنگاڵەییەکانمان لە پەراسووی موعجیزەیەک شین دەبنەوە!

دڵنیابن بەرگەی ئەو ئازارەش دەگرین، تا دوایی دەمێنینەوە! لەلام یەقینەو دڵنیام، ئەو خەمەش دەپێچینەوە!

## کۆچ

لە دەست بێمروەتی دەسەڵات بەرامبەر کۆچی بەکۆمەڵی گەنجەکانمان و خنکانیان لە دەریاکاندا، خاوەنداری نەکردن لەو سەروەتە مرۆیەی گەلەکەمان.

دیسان کۆچ...

کۆچ لەتاو نیشتیمانێکی دزراو،

ڕەو بە ئومێدی ژیانێکی ئاسوودە...

گەنج، هێزو شنگ و توانای هەر گەلێکە، چی لەوەی ناخۆشترە زەقەزەق لە چۆڕانەوەی ئەو هێزە بۆ نێو دەریای بێ بن بڕوانی! بەو پایزە لە پەرپرۆچکەی ئاسمانێ، قازو قورینگ و مراوی، پۆل پۆل بە عیشقی گەرمەسێر دێنەوە، باڵندە غەمگین و ڕەنگاڵەییەکانی وڵاتی من، بە پێچەوانە کۆچ دەکەن.

دەستم دامێنتان ڕەو مەکەن! مەردی خودا و مەردی مەیدانی نیشتیمان بن، وەرن با بە هەر هەمووومان، ڕەو بەو مافیا خودانەناس و وڵاتنەناس و ناموسنەناسانە بکەین، چۆک بە کێوی فشۆڵ و خاڵی لە غیرەت و عیززەتیان دابدەین، کە دەستی ڕەش و چڵکن و هۆکاری کۆچی ئێوەن!

ئاماری کۆچی گەنجان لە دەڤەری ڕاپەڕین، لە هەڵکشانێکی تاقەتپڕوکێندایە. لە ماوەی ڕابردوو، ژمارەی لێدانی فیزا، گوایا ١٢٠٠٠ دوازدە هەزار کەسی تێپەڕاند!

ڕۆژێک لە ماڵی خزمێکمان، یەک لە ئامیر مەفرەزە تایبەتەکانی بەعسی ساڵی هەشتاکان، دیاربوو لە لیستی (بە تێکۆشەرکردنی خائینان)دا ناوی هەبوو بۆیە کرابوو بە ئامیر فەوجێکی چەکداری حیزبێکی فەرمانڕەوا! لاقی خستبووە سەر لاقی و یاری بە سویچی

ئۆتۆمبێلە دوامۆدێل و گرانبەهاکەی دەکرد، دەربارەی کۆچی گەنجان شەکرێکی شکاند گوتی: خەڵک لە مەغرووری دەڕوا، ژیان قەت هێندەی ئێستا خۆش نەبووە، ئێستا سلفی لە وەنەوشەی بدەم، کوێم پێ خۆشبێت بۆی دەچم!

ڕاستی دەکرد، بۆ جەنابی زۆر خۆش بوو، چونکە بە مووچەو دزینی ئازووقەی فەوج و بەو هەموو دزی و حیزبییەی دەیکرد، مانگانە لە ٥٠٠٠٠٠٠ پێنج ملوێن دینار ڕەتی دەکرد، هەرسێک کوڕەکەی کە خوێندکاری نێوەندی و ئامادەیی و زانکۆ بوون، بە نەقیب و ئەفسەر لەلای خۆی مووچەیان هەبوو. ژنەکەی، چونکە لە هەشتاکان ئەندامی (**اتحاد نساء العراق**)ی بەعس بوو، بە ژنی شاخ خانەنشین کرابوو! هەردوو کچەکەشی بەناوی پەیامنێری تیڤی حیزبەکەیەوە، مووچەیان هەبوو!

دڵێک، هەرچەندی گەورە بێت، توانای هەڵگرتنی ئەو هەموو غەدرەی قەت نییە!

ئەمنیش پێم وابوو شیکردنەوەی زانستیانەی هۆکارەکانی کۆچ و هەڵهاتنی گەنجان، لەگەڵ ئەو کۆنەهینە، وەک ئەوە وایە قەتارو ئەڵڵا وەیسی بۆ کابرایەکی ئەرجەنتینی بڵێم، ناچار بووم بەقەدەر ئەقڵی خۆی بیدوێنم، بۆیە گوتم:

دەگێڕنەوە ڕۆژێک ڕێوییەک گوێی لە بانگدانی کەڵەبابێک دەبێت، بە سۆراغی ئەو دەنگەدا دەڕوات، دەبینێ کەڵەبابێک لەسەر دیواری کاولەئاشێک. مام ڕێوی سڵاوی لێدەکات، پێیدەڵێ: من تۆبەم کردووە، لەوەبەدوا دەمەوێت کشتوکاڵ بکەم، ئەگەر تەشریفت بێتە خوارەوە لەو هەموو زەوییەی هەتانە، بڕێکم بۆ دیاری بکەی، دەبم بە نیوەکاری ئێوە. کەڵەبابەکەش پێیدەڵێ: کاکم براگەورەمە لە ژوورەوەیە، زەوی دابەشکردن لە دەسەڵاتی بەڕێزیاندایە، ڕێوی

خـەنی دەبێـت دەڵـێ ڕەنگـە کـاکی کەڵـەبابێکی لـە خـۆی قەڵـەوتر بێت! کاتێـک دەچێتــە ژورەوە دەبینـی پیـرەسـەگێکی کەنـەفت، سـۆمای چاوەکـانی، چیرۆکـی زەمــەنێکی دوور دەگێڕنــەوە. ڕێـوی سـڵاوی لێدەکات پێیدەڵێ: بـەو بـرا بچووکـەت بڵـێ بێتـە خـوارەوە زەویـم بۆ دیاری بکات، دەبم بە جوتیاری ئێوە. سەگەکە دەڵێ: گوێم گران بووە، وەرە پێشــەوە بـا گـوێم لێت بـێ! ڕێـوی دەچێتـە پێشـەوە، سـەگەکە پەلاماری دەدات، بەڵام چونکە گیرەی نەماوە، هەندێکی هەڵدەگرۆفی. ڕێوی خۆی ڕادەپسکێنێ ڕزگاری دەبێت. کاتێک بە لای کەڵەبابەکەیدا ڕادەکات، کەڵەباب لێیدەپرسێت: ها! کاکم زەوی بۆ دیاری کردی؟ لە وەڵامدا ڕێوی دەڵێت: بەو خوایەی، خاوەنی ئەو براگەورەیەی بی، دوو جوتیاران لەنێو زەوی خۆتان نابینی!

بەداخــەوە، ئــەو هــەموو تاقەتــە مرۆییــە، بــە بەرچاومانــەوە لــە نیشـتیمانی دایـک ڕادەکـەن! باوکێـک ئەگـەر تۆسـقاڵێک کەرامـەت و ویقاڕی باوکانەی تێدابێت، کاتێک یەک لە منداڵەکانی لە داخی باوکی ماڵەکە جێدەهێڵێت، ئەو باوکە ڕووی خۆی ڕەش دەکات و ماڵەکەیان بۆ چۆڵ دەکات! کەچی مافیاکانی کوردایەتی مێش میوانیان نییە!

ئەم پارچە هۆنراوەم لە ٢٠١٥ نووسی، کاک عادل عەزیز، بە دەنگی خـۆی تۆمـاری کـرد و بـڵاوی کـردەوە. پێشکەشـە بـە هـەڵاتووەکانی دەستی ڕەشی غەدری جەردەکانی وڵات!

لەم هەرێمی کوردستانە، بەرپرس ویژدانیان ئیفلیجـــــە،
هەندێک قەرەقۆلی تورک و، بڕێکیش پیاوی بەسیجـــــە،
بازرگانی و ڤێلاکڕین لە هەندەران، نەریتی شێخی خەلیجە،
بۆ من جیاوازی چی هەیە!
مافیا لێرە قوتم بدا یان قرش لە دەریای ئیجە!

***

بۆ ئەو منداڵە کوردانەی، لە دەریای ئیجەدا خنـــــکان،
لە داخی مافیاکانی کورد، سەریان هەڵگرت بۆ هەندەران،
مەبەستیان گەشتیاری نەبوو، ڕاکردن بوو بەرەو ژیـــان،
لە تەمەنێکی بەهاری وەکو پەڕەی گوڵ هەڵـــــوەران

***

قرشـــێکی نـــاو دەریـــای ئیجـــە، پرســـیاری کـــرد لـــە سەگێکـــی نوگرەسەلمان،
پێمبڵێ چ شتێک زۆر خۆشە! بۆ شەوچەرەی نیوەشەوان،
سەگە گوتی: زۆرم خواردووە گۆشتی گیسک و گۆشتـی بەران،
بەڵام هیچ شتێک ناگاتە، تامی گۆشتی کۆرپەی کوردان!

***

قرشەکە قرپی هاتەوە، گوتی: بەزیادبێت لە یـــــەزدان،
کوڕێکی دەشتی کۆیەم خوارد، کۆتایی شەو دەمەو بەیان،
سەگە پێیگوت: ئەو خێزانە بە بنەماڵە، خۆشە گۆشتیان،
منیش باوکی ئەو کوڕەم خوارد لە زیندانی نوگرەسەلمان

***

بۆچی هێندە بێ بەزەیین شەپۆلەکان!
دەڵێم ئاو لە خۆم حەرامکەم، دووای دیتنی تەرمی ئالیان،
کارەساتێکی بە سـۆبوو، هەموومانی بە کوڵ گریـــــان،
تەنها ئەوەی پێی نەجولا ویژدانی دز و جـــەردەکـــــان

## پێشمەرگە

ئازارەکانی سوکایەتیکردن بە ناوی پیرۆزی پێشمەرگە...
پێشمەرگە، یان...؟

پێشمەرگە، بەو کێوە ئەفسانەییە دەگوترێت مەرگی خۆی پێش مەرگی کەسانی دیکە دادەنێت. ئەو مرۆڤە دڵئازا و بەخشندەیەیە، کە تاکە مووچە و بەراتی، ئازادی و خۆشبەختیی گەل و نیشتیمانەکەیەتی. لە ڕۆژگاری تەنگانەدا چەکی شەرەف لە دژی ئەو داگیرکەرو ڕەگەزپەرستانەی نکۆڵی لە بوون و مافی نەتەوەییمان دەکەن، دەکاتە شانی. پێشمەرگە، ناوێک هێندە پیرۆزە لەسەر زارو ویژدان و یادەوەری کوردان.

هیچ زمان و قەڵەمێک ناتوانێ لە (پێشمەرگە) زیاتر، هیچ تاریف و پێناسەیەکی دیکە بە باڵای ئەو دیاریی خودایەدا ببڕێ، کە کورد زۆر بەسادەیی، ناویان ناوە پێشمەرگە!

پێشمەرگە، ئەو ناوە ئەفسووناوییە، بەرگ و پۆشاکێکە لە نووری خودا، پاکژ و بە نوێژ، لایەقی هەموو کەس نیە بیپۆشێ، تەنهاو تەنها بە باڵای ڕۆڵەی حەڵاڵزادەی نیشتیمان بڕاوە، چونکە، بەهاکەی خوێن و فرمێسکە!

دەمێکە خەمێک، خەمێکی یەکجار سەخت و ئاگرین، وەک ئەژدیهای حەوتسەر دەمی ناوەتە هەناومەوە، کاتێک دەبینم بە کۆیلەو خزمەتکار و پاسەوانی کۆنەبەعسیانیش، دەگوترێ پێشمەرگە!

من، لە پێشمەرگە دێرینەکانی هەموو لایەنەکان دەپاڕێمەوە، با ئەمڕۆ نەخەینە سبەینێ، وەرن بە هەموومان، ناوی پیرۆزی پێشمەرگە، لە بەکرێگیراوەکانی حیزب و بکوژی هاوڕێ پێشمەرگەکانمان، بستێینەوە.

تاوانێکی نەبەخشراوە: لەسەر ناسنامە و پێناسی باخەوان و، پاسەوانی شەوانی سوورو، خزمەتچی مێزی شەڕاب و، مەیتەری ئەسپ و، بەخێوکەری سەگ و تولەو تاژی و، دایبیگۆڕی منداڵی بەرپرسان و نیشتیمانفرۆشان، بنووسرێت پێشمەرگە!...وای! چ گوناحێکی کەبیرەو، چ کوفرێکی نەبەخشراوە!

ئاخر دەکرێ، ئاخر بە چ دین و چ مەزەبێک ڕەوایە: ئەو جرو جانەوەرە، هەڵگری هەمان ناوی شەهیدان، خەلیل و، سەید فەتحی شاخۆران و، ڕێبازو مەلا عەلی و، مامەڕیشەو، عەلی حاجی و، بەکر تەلانی و، عباس و، سەعدی گچکەو، سەید سەلیم و، سەید سەڵاح ئیلینجاغی و... بن.

لێتان ناشارمەوە، کە خەونم بەو ڕۆژەوە دەبینی، ببینم تابلۆی ئۆتۆمۆبیل لەسەری نوسرابێ پێشمەرگە! بەداخەوە ئێستا، کە کوڕە بەرپرسە مەفرەزەخاسەکان و بکوژانی پێشمەرگە، لێیاندەخوڕن! وەک ئۆتۆمۆبیلی مەنزوومەی شیمالیی بەعس و دائیرەی ئەمن ببینم!

سەرنج بدەن: زۆربەی ئۆتۆمۆبیلەکان، دزیاری و تۆزوبا و، وەک خۆیان بێ داک و بابن! ئەویش هەر بۆ ئەوەی لە کامیرای چاودێریی هاتوچۆ دەرنەچن و، لەسەر کوڕی خەڵکی هەژاریش، خۆیان بە هەیبەت نیشان بدەن!

هیچ دوژمنێکی گەلی کورد نەیتوانیووە، بە قەدەر جەلـلاد و دەسەڵاتدارە خۆفرۆشەکانی هەرێم، ناوی پیرۆزی پێشمەرگە لە بەرچاوی خەڵک و خۆیش و بێگانە، سووکو ڕیسوابکات!

بیرم کردەوە ناوێکی پڕ بە پێستی خۆیان لێبنێین: ناویان بنێین پاسەوانی سنوور، بەڵام دەبینین سنوورەکانیان ڕادەستی داگیرکەران کرد! گوتم ناویان بنێین پارێزوانانی گەل، بینیمان لە شەنگال و مەخموورو کەرکووک و عەلیسەرای کاکەییەکان و خورماتوو و

خانەقین و...، چۆن بێشەرمانە هەڵاتن و خەڵکی بێدیفاعیان، بە ئەهلی ئەنفال و چەتەکانی بیابان سپارد! گوتم ناویان بنێین پاسەوانی دەستکەوتەکان، ئەویش، خۆتان دەبینن دەستکەوتەکانیان یەک لە دوای یەک دۆڕاندو نەیانتوانی بیانپارێزن!

من، وەک پێشمەرگەیەکی دێرینی ئەو گەلە، داواتان لێدەکەم، داوێنتان دەگرم، دەست لەسەر ویژدانتان دابنێن، بوێرانە ناوێکی پڕ بەپێستی خۆیانیان بۆ دابنێن...

## ڕەوشت

زۆرجار مەودای بەڕەوشتی و بێڕەوشتی تاقە مەترێکە. ئەوەی هانیدام ئەو بابەتە بنووسم ئەوەبوو، بەیانی لە ماڵ هاتمەدەرەوە دەمویست باخچەکەی بەرامبەر ماڵی خۆمان ئاوبدەم. هەر تاقەمەترێک دوور لە سەتڵی خۆڵەکە، دابییەک فڕێدرابوو، منیش خستمە کیسەیەک و لەنێو سەتڵەکەم دانا.

بەداخەوە، کە ناوی بێڕەوشتی دێت، ڕێک وێنەی کردەیەکی چەند خولەکیمان دێتە بەرچاو، کە پێیدەڵێن سێکس، لەبەینی دوو ڕەگەزی جیا بە ناشەرعی و دوور لە نەریتی کۆمەڵگاکەمان. بەڵام من، وەک زۆر کەسی دیکە، تێڕوانینم بۆ بێڕەوشتی فرەڕەهەندە. زۆر کردەوە هەیە بێڕەوشتیە، بێئەوەی هەموو کەس پێی بزانێت وەک فڕێدانی ئەو دابییە، شکاندنەوەی نەمامێک، شکاندنی شووشە لەسەر جادەو ڕێگای هاتوچۆی خەڵک و شوێنە گشتیەکان، گەواهی بەدرۆ، دزی و گەندەڵی و پیسخۆری، قەڵەمفرۆشی، خاکفرۆشی، شۆفاری (جاسوسی)، ساختەکاری بە هەمو جۆرەکانی، ناپاکی نیشتیمانی، بەڵێنشکێنی، دیلکوشتن، خیانەت و دەستکێشی بۆ داگیرکەران، قەزاوەتی

نادادپەروەرانە، خۆنەبوون و...

ڕووداوێکی ڕاستەقینە: لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو لە یەکیەتی سۆڤیەت، بۆ پارتە کۆمەنیستەکانی دنیا زەماڵەی خوێندن هەبوو، هەر پارتەی چەند کورسیەکی بۆ دادەنرا. لەو بەینەدا هاوڕێیانی حیزبی شوعیی عێراقیش دەچنە سۆڤیەت. یەک لەو برادەرانە، برادەێکی کچی هەبووە و هاموشۆی ماڵی کچەی کردووە، ڕۆژێک ژنێکی جیرانی کچەکە، بەو هاوڕێیە دەڵێ: تۆ کوڕێکی کۆمەنیست و نیشتیمانپەروەری، ئەو ماڵە جیرانەمان کە تۆ هاموشۆیان دەکەی، بێڕەوشتن، بۆ تۆ جوان نییە بچیە ماڵیان. کوڕەکەش دەڵێ: کچەکەی ئێوەش برادەری هەیەو دەیهێنێتەوە ماڵتان، بۆ بەوانە دەڵێی بێڕەوشت؟ ژنەکە دەڵێ: لەبەرئەوە پێیان ناڵێم بێڕەوشت کە کچەکەیان تۆی خۆشدەوێ، ئەوانە بەر لە ٣٥ ساڵ لە شەڕی دووەمی جیهانی، گەنمیان شاردۆتەوە، نەیانداوەتە لەشکری نیشتیمانی کە پارێزگاری لە خاک دەکرد! واتە بەشدارییان نەکردوە لە پاراستنی نیشتیمان، بۆیە خەڵک بە بێڕەوشت ناویان دەبەن و کەس ناچێتە ماڵیان!

ئەوەیە پێوانەی گەلێکی وشیار بۆ بێڕەوشتی!

## پیس و پاک

سەنگەر یان لەوەڕگا؟

بۆ مەزادخانەی مرۆڤە بوودەڵەو سوكەكان... بۆ ئەو دەسەلاتدار و پارەدارانەی، بەسەر ئێش و ئازاری شان و هەیبەتی پێشمەرگە دێرینەكانی وەكو ئێمەدا هەڵكشان!... بۆ ئەوانەی لەودیووی دیوارەكانی دانایی و خۆناسین و بەهای مرۆڤبوون ژیان دەكەن، یان خۆیانی لێ نەبان دەكەن، بێشەرمانە كەرامەتیان هەڕاج دەكەن! ئەو جۆرە لە سیستمی مرۆڤكوژین، هەڕەشەیەكی ترسناكە لە سەر ڕەوشت و غروورو كبریای تاك بە تاكی مرۆڤی كورد.

## سەنگەر...

لە فەرهەنگ و ئەدەبییاتی كوردیدا، بەو شوێنە یان بەو كەڵەكەبەرد و مەتەرێزە دەگوترێ، مرۆڤی جەربەزە بە چەكەوە خۆبەخشانە، شەڕی تێدادەكات و داكۆكی لەسەر مافی ڕەوای گەلێكی تێدا دەكات. زاراوەیەكی سەنگین و پیرۆزە لە ئەدەبیاتی شاخ. بۆیە داوا لە ڕاگەیاندنكاران و نوسەران و ڕۆشنفكران دەكەم، گەشتێك بە نێو دونیای زەین و فكردا بكەن، دەست لەسەر ویژدانتان دانێن، ناكرێ ئەوانەی پیرۆزی و سەربەخۆبوون و كەرامەت و حەقیقەتی مرۆڤبوونی خۆیان، لەبەر تەرازووی فرۆشتن دادەنێن و تەنها ماڵ و سامان ڕووگەیانە، بێ ویژدانی و تاوانە، پێیان بگوترێ (سەنگەری گواستەوە)، بەڵكو تەنها و تەنها دەستەواژەی (گواستنەوەی لەوەڕگا) شایستە و پڕ بە پێستی كەسایەتی و عیززەتیانە.

بە هەمان شێوە، بۆ ئەو بەناو نوسەرانەش كە لە زەمەنی بەعسدا

لە ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەکانی ڕژێمدا، وتار و پێداهەڵدانیان بۆ سەرۆک زێڕە بە ١٠ دە دینار دەنووسی، ئێستاش زۆربەیان لە ڕۆژنامە بێخوێنەرەکانی دەسەڵات، بەکرێ و دەستموست ڕاستوچەپ بێشەرمانە دەنووسن، ناکرێ بەوانەش بگوترێ نوسەر، بۆ ئەوانیش دەستەواژەی (قەڵەمفرۆش، قەڵەم چاوشۆڕ، جاشقەڵەم) کاڵای پڕ بەباڵایانە!

لای هەموان ڕۆشنە کە ئەو جۆرە لە ئیدارەدانی مەملەکەت، بەرهەمی پاشخانی ئەقڵیەتی دۆگمای خێڵەکی و جاشایەتییە. گومانی تێدانییە، ئەو چارەنووسە دەستکردە ژاراوییە، هەست و ناخی ڕۆشنفکران وێران دەکات. باری ئەو شەرمەزارییەش، تەنها ڕووقایمی کاسەلێس و کۆیلەفرۆشراوەکان و کرێارە هیچ و سووکەکان، هەڵیدەگرن!

## نادادی

چاوشکاندنی چالاکوانان و ئازادیخوازان بۆ پاشگەزبوونەوە لە داواکاریی مافەکانیان، بە داتاشینی تۆمەتی بێبنەما بۆیان و، بەنارەوا زیندانیکردنیان، گومان لە ئازادبوونی خۆم دەکەم. خاوەنداریکردن لەو چالاکوانانە، ئەرکێکی ئەخلاقی و ویژدانیە.

دەگێڕنەوە، ئەحمەد ناوێک زۆر لە دەسەڵاتداران و دادگاکان و مەلایانی سەردەمی خۆی ناڕازی بووە. لەسەر نادادیی، ناڕەزایەتی دەربڕیووە، بەرپرس و دادوەران و کەسانی ئایینی، دەیانگوت: ئەحمەد کوفران دەکات! بۆیە ناویان نابوو (کوفرئەحمەد). مەلایەک، هەر لەخۆیەوە لە نوێژی هەینیدا دەڵێ: هەر کەسێک کوفرئەحمەد بکوژێ، بە ماڵ و منداڵەوە بە پێڵاوەوە دەچێتە بەهەشت! دیارە

یەکێک لەو کاڵفامانەی کە لە گەورەیی مرۆڤ ناحاڵییە، بیردەکاتەوە دەڵێ: واچاکە ئەو بەهەشتە بۆ ماڵ و منداڵم مسۆگەر بکەم، دەبێت بچم کوفرئەحمەد بکوژم! خەنجەرێک لەبەرپشتی دەنێ، کە لەتیژییان زرێی هەڵدەگرێ! دەڕوا و پرسیاری کوفرئەحمەد دەکات، یەکێک پێیدەڵێ: ئەمڕۆ دادگاییکردنی چەند تۆمەتبارێکە لە مەیدانی شار، کوفرئەحمەد، بۆ ئەوەی بزانێ دادگاییکردنەکە تا چ ئەندازەیەک دادپەروەرانەیە، لەوێدەبێ.

کابرا دەچێتە مەیدانەکە و بەرێکەوت پرسیار لە کوفرئەحمەد دەکات و دەڵێ: ئەرێ کاکە کوفرئەحمەدت نەدیووە لەو دەوروبەرە؟ کوفرئەحمەدیش زیرەک بووە، کە چاوی لەو پیاوە کردوە زانیویەتی بەنیازی کەتنێکە، پێیدەڵێ: ڕاوەستە با ئەو دادگاییکردنە تەواوبێ، ئینجا کوفرئەحمەدت نیشان دەدەم. کابراش لەتەک کوفرئەحمەد، دەست لەسەر پشکەی خەنجەر و، بە خەیاڵی مسۆگەرکردنی بەهەشت، ڕادەوەستێ!

دادگایی دەست پێدەکات، پیاوێک کە لاقی هەڵبەستراوە، داوای تۆمارکردووە لەسەر خاوەنماڵێک، کە چووە دزی لەو ماڵە بکات، بەڵام دیواری بەسەردا ڕووخاوەو و لاقی شکاوە! دادوەر بانگی خاوەنماڵ دەکات و پێیدەڵێ: ئەو دیوارەت بۆ وا بە ترەکەڵەک داناوە؟ کاتێک ئەو دزە هەژارە هاتووە دزیت لێبکات، بەسەریدا ڕووخاوەو لاقی شکاوە! دەزانی بە ماددەی... دەبێ سەرت بپەرێندرێ؟! خاوەنماڵ دەڵێ: گەورەم من تاوانم چیە؟ وەستاو کرێکار دیواریان داناوە! دادوەر دەڵێ: ڕاستە، بڕۆن وەستایەکە بێنن! وەستا دێ و دەڵێ: گەورەم ئێمە هەر کەسێ نانی باشمان بداتێ، بەهێز دەبین و دیواری پتەوی بۆ دادەنێین، ژنی ئەو ماڵە تاوانبارە، چونکە خواردنی باشی نەداوینێ! دادوەر دەڵێ: ڕاست دەکەی، بڕۆن ئەو ژنە بێنن! ژنە دێ و

دەڵـێ: گـەورەم منـداڵێکی زیرەکوشـیتم هەیـە هـەتاوەکو لای نیـوەڕۆ گـرووی گرتبـوو، ژێـر نـەدەبۆوە، هــەر ئەوەنــدە فریاکــەوتم نانوماستێکیان بدەمێ! دادوەر دەڵێ: ئەویش ڕاستە، بڕۆن ئـەو منداڵـە تاوانبارە بێنن! منداڵەکە دێنن، دادوەر دەڵـێ: ئـەی منداڵـی تاوانبـار بۆ ورکت گرتـووە و لێنەگـەڕای داکـت نـانو چێشـتی بـاش بـۆ وەسـتاو کرێکارەکـان سـازبکات؟ منداڵەکـەش زۆر سـاوایە و قسـە نـازانێ، تـا داکۆکی لە خۆی بکات. دادوەر دەڵێ: بزانن! چونکە بە کەتن و تـاوانی خۆی شک دێ، ئەرقومێ ناکا و نقەی لێوەنایە! بیبەن ملی بپەڕێنن!.

کاتێـک جـەللادەکان دەیبـەن سـەری بپـەڕێنن، دەبینن منداڵەکـە ملـی زۆر کورتە و بەشمشێر سـەری ناپەڕێندرێ، دەگەڕێنـەوە لای دادوەر دەڵێن : گەورەم! ئەو منداڵە ملـی زۆر کورتـە، شمشـێر نایگرێتـەوە، بۆ کەسـێکی مـل درێـژ نەبـەین لـە جیـات ئـەو منداڵـە سـەری بپـەڕێنین؟ دادوەر دەڵێ زۆر باشە، یەکیکی ملدرێژ پەیدا بکەن!

جەللادەکان، لەو نێوە چاودەگێڕن و ئەو پیاوە خەنجـەر بـە کەمـەرە دەبیـنن کـە چـووە کوفرئەحمـەدی بکـوژێ، ملـی لـە هـەموان درێژتـرە. بانگیدەکەن، ئەویش کە ئەو شتانە دەبینـێ، هـەتا پێـی تێدایـە ڕادەکات. کوفرئەحمەدیش بەدوای دەکەوێ و بـانگی دەکـات: کاکـە وەرە، مـەڕۆ، ئەمن کوفرئەحمەدم! ئەویش بەدەم ڕاکردنەوە دەڵێ: توخوا ئـەو جـارە ئەگەر نارەوایەتی و بێویژدانی دادگاکانت بینی و کوفرت کرد، نـاوی منیشی تێبکە!

## لێپرسینەوە

بە نیازی ئەوەی خەڵک ڕوحیەتی لێپرسینەوەی لە بەرپرسان، لا دروست بێت...

کفتە بە کفتە پێتان دەبژێرین!

هادیاغای گوندی (سەربەشاخ)ی، لە خێڵی بەوەج و ئازای (سیان)ن. زۆر بەسەرهاتی خۆشی هەیە، یەک لەوانە، زۆری ڕق لەو کەسانە هەستاوە، لە تازییە دەبوون بە بارگرانی بۆ خاوەنمردوو، ئەوانەی نانیان لە ماڵی خاوەنمردوو دەخوارد.

لە گوندەکانی نزیک گوندی (سەربەشاخ) یەکێک دەمرێ. ژنانیش لە خوایان دەوێ تازیە هەبێت، کۆدەبنەوە دەچن بۆ ئەو تازیمانەیە، نیوەڕۆش بۆ نانخواردن لە ماڵی مردووەکە دایدەکوتن. هادیاغاش پێدەزانێ، پاش نیوەڕۆ خوێندەوارێک بانگ دەکات، پێیدەڵێ دەفتەرەک و قەڵەمێکی بێنەو لەگەڵم وەرە!

دەچن بۆ سەر ڕێگای ژنانی ئاوایی، دەبینن لە بستووێ، وەک ڕەوە قەلی ڕەش بەدیاردەکەون، دەگەنە لای هادیاغاو ئەویش ماندوونەبوونیان لێدەکات، لێیان دەپرسی ئەوە نیوەڕۆ لە ماڵی خاوەنمردووی نانتان خوارد؟ ئەوانیش دەڵێن بەڵێ! دەپرسی شیوی چیان لێنابوو؟ ئەوانیش دەڵێن کفتە، بە نووسەر دەڵێ بنووسە هەریەکەو بەرامبەر ناوەکەی، ژمارەی ئەو کفتانەی خواردوویەتی! دەڵێ وەرە فاتم چەند کفتەت خوارد؟ دەڵێ دوو، نووسەر دەنووسێ. بەوشێوەیە هەمین، خەجیج، بەگم، سافیە، زارێ و... ئێوارە هەموو خەڵکی گوندی کۆدەکاتەوە، دەفتەرەبۆری حەق و حیسابان دەردێنی، هەریەکەی چەند کفتەی خواردووە، کفتەو دیناریان جەزا لێدەستێنی!

هیوادارم هەوڵدەین هەموو تواناکانمان یەکخەین، بۆ ئەوەی هەر

كەسێک کفتەو قوتی ئەو نیشتیمانە دزراوەی حەپەلوش کردووە، کفتە بە کفتە حیساب پرسیان لێبکەین!

## شۆفار

نیشاندانی چەند کەسێک دانیان بە تێوەگلانی خۆیان لەگەڵ میتی تورک، نا.

جاسووس، سیخوڕ، شۆفار، خائین، ناپاک، گورگەمێش. ئەو ناوانە، هەموویان بەکاردێن، بۆ ئەوکەسانەی کە ویژدان و ئەخلاق و نامووسی خۆیان لەبەر تەرازووی فرۆشتن دەنێن، کە بەزۆری کرێ و دەستموستی ئەو خراپەکارییە، خۆی لە وەرگرتنی چەند قڕۆشێکدا دەبینێتەوە.

من پێم سەیرە کاتێک ئەو هەقدەستە، کە لە بەرانبەر بە کوشتدانی چەند مرۆڤێکدا وەریدەگرن، چۆن نێولەپیان کون نابێت! ئاخر، بە هەموو پێوەرێکی ئاینی و ئەخلاقی و ویژدانی و مرۆڤایەتی، یەک لە کارە هەرە دزێوەکانی نێو کۆمەڵگایە!

هاووڵاتی بەڕێز! تۆ ئەگەر دینداری، خودا لە قورئان و لە هەموو کتێبە پیرۆزەکانیدا، نەهیی لە ئیشی خراپ کردووە و دەفەرمویَ (جاسووسی مەکەن!) ئەگەر چەپیت، مارکس دەڵێ: هەر گەلێک جەللاد و خوێنڕێژ بە ڕزگارکەر بخوێنێتەوە، ئەو گەلە وەک گوێلک وایە چەقۆی قەساب بلێستەوە!

وەبیرتان دێنمەوە، کاتێک ئێمە پێشمەرگە بووین و بەو شاخ و کێوانەوەبووین، ڕاستە زۆر فایلدار و خائین لەنێو ڕیزی هەموو حیزبەکاندا، خۆیان حەشاردابوو، بەڵام شۆڕشگێڕانی ڕاستەقینەی هەموو لایەنەکان، بە دوای بنبڕکردنی ئەو دیاردە دزێوەوە بووین. لە

هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو، چەند موختارێکی جاسووس بە قەوانی فیشەک گوێیان کونکرا، چەندانیان گوێیان بڕدراو چەندانیان بەسزای گەل گەیەندران. بە داخەوە، دەسەڵاتدارانی هەرێم، ئەو هەستە شۆڕشگێڕیەیان خنکاند!

کەسایەتی کەسی جاسووس، مووی نەرمە! لە سەردەمی ئاوارەییدا لە ئێران ئەوانەی بوونە جاسووس، زۆربەیان ژنەکانیان دەستیان بە لەشفرۆشی کرد، چونکە تەماشای بێشەهامەتیی مێردەکانیان دەکرد!

داوا دەکەم لە خێزان، لە مامۆستایانی ئایینی، مامۆستایانی قوتابخانە، ڕۆشنبیران، لەبەرتان دەپاڕێمەوە نەوەیەک پەروردە بکەن، جاسووسی بە تاوانێکی نەبەخشراو بزانێت، نەفرەتی لێبکات و بە لووتکەی کارە حەرامەکانی بزانێت. ئەرکی تاک بە تاکی مرۆڤەکانە، ئەو سیخوڕانە دەستنیشان بکەین.

## گورگەمێش

چاوساغی و دەستکێشی لەشکری داگیرکەری تورک بۆ نێو خاکی بابوکالان.

ناسۆری نیشتیمان

ڕێژنەبارانی نەگبەتبوون، دابارینە سەر ئەو خاکە...

لەو ڕۆژەوەی بۆ داگیرکەران بوون بە پرد، هەرچی پیرۆزیمان هەیە دەستتان بۆ برد، چیتان نەکرد!؟ چیتان نەبرد!؟ نیشتیمانێکتان لە کچ کرد، کەرامەتی مرۆڤی کوردتان ئەتک کرد، کانیاوەکانتان بێنوێژ کرد، ڕووبارتان لە تینوان خنکاند، بوون بە چاوساغی ڕەشەبا، تەزرەو وەیشوومەو زریانتان بە قوژبنی ماڵمان فێرکرد!

لەسەر دەستی ڕەشی ئێوە، هەردوو پاشووی شەپۆلەیاخییەکان

شـكان، ڕووحییــەتی خاكپـارێزی لــە نــاخی گەنجــەكانمان مــرد، سەرجەلەی مێژووی گەلێكتان گومانڕێژ كرد!

بەرەبابـە مەلعوونـەكان، هــەتا لـە ژیانـدا مـابن، وەك سـەگی ڕاو ڕستمان دەكەن، لـە برای خۆمانمـان بـەردەدەن، فێری دیلكوشتنمان دەكـەن، نیشـتیمانمان لـە بـەرچاو دەكـەن بە دێـو و درنـج! كـاتێكیش دەمرن، هەریەك گردێك داگیردەكەن!

چ بۆنساردێك ئەو وڵاتـەی داگرتـووە! هـەر هـەموو بۆنسـاردتان لـێ دێت!

گومـان دەكـەم كـە ئێـوە كـوڕی هـەتاو بـن! مـن دڵنییـام لەگـەڵ حەججاجەكەی بـەعس، یـەك تـوخم و تۆرەمە و، دەرهاوێشتەی یـەك هەناوبن!

ئومێدەكانیان لـە دینگـەی بەرهـەیوانی داگیركـەران شـەتەك داویـن، ڕۆژێك نییە بـە نووسینی قەڵەمفرۆشـان و پـەللاری كەللەوشكان بـەر شەللاق و ڕەجم نەكرێین!

ئامانجە پیرۆزەكانمان وەكو عیسـا لـە خـاچ دران، ئـەوەی نەدەبوایـە بكرێ هەمووی كرا!

هەركـەس دەرخۆنـەی مێژووتـان هـەڵداتـەوە، بێگومـانم دەڕشـێتەوە! هێند دەستپیس و داوێنپیسن، قورئانێكتان بە ئەمانەت لەلا دانێم چوار پـەڕی لێدەكەنـەوە! هــەموو چـەنگو نینـۆكم چـوو هێنـدەی گـەڵای هـەڵوەریووی هیواكـانم كۆبكەمــەوە! هـەردوو شـەویلاكم شـل بـوو هێندەی خەونە سەربڕاوەكانم، بۆ منداڵان حینجە بكەم و بگێڕمەوە!

لـە پـاییزی تەمەنمـدا كەوتمـە دەسـت شـەللاتی و لۆمپـەن، دەبنـە چاوساغ بۆ داگیركەر، وەكو چاوسـاغ ئـاڵا بـۆ توركـان هەڵدەدەن! من دڵنیـام كـە نـەفرەتی ئـەو شـەوگارە ڕەشـە و تـووك و نـزای دایكـانی ڕەشپۆشی نیشـتیمان، نغرۆی ئازارێكتـان دەكـات! لێم یەقینـە ڕۆژێك

دادێ دەستی زوڵم و سەرکوتکردن و ناپاکی، بە شکاوی بکەنە وەباڵی ئەستۆتان! ڕۆژێک دادێ بە زەلیلی دەکەونە دەست خزمەتکار و گارسۆنی مێزی شەراب و دەرکەوانەکانی خۆتان!

## بێهەڵوێستی

لە داخی ئەو بێدەنگی و بێهەڵوێستیەی هاوڵاتیان لە بەرانبەر ئەو بێدادی و ناحەقی و زوڵمەی لە چالاکوانانی بادینان دەکرێ لە زیندانەکانی ئاسایشی حیزب.

گمەی کوکوختییەکان...

ئەی ئەوانەی لە زمانی کوکوختییەکان حاڵی دەبن و تێیاندەگەن، دەمەوبەیان گوێڕادێرن چ پەیامێک بە گوێی مرۆڤەکاندا دەدەن، لە حەژمەتی بێدادی ئەو مەملەکەتە، چ مەحشەرێک بەرپا دەکەن! ئا بەو سەبای ساڵحانە، کوکوختییەکان، ئایەتەکانی یەکسانی و دادپەروەری ئەزبەر دەکەن!

توخوا ئێوە تێیاندەگەن!؟

لە گمەی زکرێک، شینێک بۆ کۆچی پۆل پۆلی نەورەسەکان، بە گوێی خالقیاندا دەدەن!

لەگەڵ ئەنگوتنی سروەی دەمەو بەیان، لە عەرش و مەحشەری خوداکانی زوڵم و بێدادی، زیندووەکان تەڵقین دەدەن، پیمان دەڵێن: توخوا ئێوە شەرمناکەن!؟

کوندەبۆکان، ئەو بولبولانەی کە نەغمەی ئێوە دەچڕن و بۆ ئێوە یەخە دادەدڕن، بە بەرچاوتانەوە لەنێو قەفەز قایم دەکەن، کەچی ئێوە سەر شۆڕدەکەن! دار دەقەڵشێت و بەدەنگ دێ، و بەرد دەقەڵشێت و بەدەنگ دێ، کەچی ئێوە ئەلفازتان لە زار ناگەڕێ!

كوكووختیەكان تەفسیری ئەو قەبیحاتە دەخوێننەوە، مەگەر ئێوە نابینان و كەڕو لاڵن! بۆ بێدەنگن!؟ بەبەرچاوتانەوە، داگیركەری حەرامزادەی دەوروبەرتان، هەركات ویستیان ستیانی ئەو نیشتیمانە بترازێنن و كراسەكەی هەڵدەنەوە!

كوكووختیەكان پێماندەڵێن: سەرمان لە ئێوە دەرناچێ! نازانین چ مەخلوق و مەعدەنێكن! گوماندەكەین ئێوە لە جنسی مرۆڤ بن! لە جینات و لە شەجەرەو سەرجەلەتان بەگومانین!

توخوا وەرن وەكو عیسا، خەونە سەربڕاوەكانمان لە پەراسووی موعجیزەیەكدا، هەر هەمووان زندووكەینەوە! توخوا وەرن با وڕێنەكان بەئاگا بێنینەوە، دەرگا و قەمتەرەو دوودەری ئەو خامۆشییەو ئەو بێهۆشییە لە ڕێسمە ببەین، كۆدی تەلیسمە ژەنگگرتووەكان بشكێنین و بكەینەوە! مرۆڤی كوردی یەقین و ڕاست، لە بناغەڕا دروستكەینەوە! بەر لەو ڕۆژەی هەڵوەرین و ژیان لە دار بكەینەوە، ئەو ئایندە و ئاقیبەتە تێكشكاوە بە ئومێد موتربە بكەینەوە! ڕووبارەكانمان بسمیلكەینەوە، غوسڵ و چڵكی بە حیزبیبوون دەركەین، ئابڕووی خۆمان بشۆینەوە! نیشتیمانمان بە ڕەنگی پێش ئالوودەبوون، بە ڕەنگی سەردەمانی زوو، سەردەمی پاكیو بەرائەت، بە ڕەنگێكی ئاوێزەیی ڕەنگ بكەینەوە! زكرێكی نوێ دابەستین، تەمی یەئس و نائومێدی بڕەوێنتەوە!

دەخیلتان بم وەرن با هەموو پێكەوە، دەست لەنێو دەست بەڵێن بۆ ئەو نیشتیمانە دزراوەمان نوێ بكەینەوە، بەرگێكی نوێی بەبەرداكەین بە خەمی دایكی شەهیدان، بە دەستی پێشمەرگە دوورابێ و لایەق بە سیماو قەلافەتی خۆی و شەهیدەكانی بێت، لە جیهان بدرەوشێتەوە! ئەو عەزیا حەوتسەرانەی نیشتیمانێكیان قووتداوە، پێمان لەسەریان داگرین، ئایندەی منداڵەكانی خۆمانیان پێ قێكەینەوە! داگیركەر و

نۆکەرانیان ئابڕووبەدەر بکەین، لە حەوت کێوان خۆنەگرنەوە!

## مرۆڤەکاڵا

بۆ ئەوانەی وەک کاڵا کڕینو فرۆشتنیان پێوەدەکرێ و، دەستەونەزەریشن بەو سووکایەتیە!

هەڕاجکردنی خود...

لە مەزادخانەی کڕینی مرۆڤە یەکبارمەسرەفەکان، ئەوانەی وەک تیغی سەفەری دەکەونە سەر گوفەک و زبڵدان.

مرۆڤ کاتێک بەهاو نرخی خۆی لەدەستدا، واتا هەموو دنیای دۆڕاند! مرۆڤی وشیار ئاستی بەرزی دنیابینی، ڕێی پێنادات ئازادییەکانی بێبەهاو، کەرامەتی ئەتک بکرێت!

خوێنەری قەدرگران!

ئەوەی سیخورمەی لە خالیکەو بنهەنگڵی کوتام و پاڵپێوەنام ئەو بابەتە بنووسم، دوو ڕۆژ بەر لە ئێستا یەک لە تیڤییە ڕۆبۆتەکان، وێنەی سێ خۆفرۆشی کۆنەجاشی سەردەمی بەعسی نیشاندا، گوایا لەوەڕگایان گواستۆتەوە!

ئای چ سووکایەتییەکە بە مرۆڤی کورد دەکرێ!

ئەو کڕین و فرۆشتنە، بە قووتی منداڵی ئێمە، بە پارەی مووچەی مامۆستا، دەکرێ و، گیرفانی پیاوکوژ و نۆکەری بودەڵە ئاوس دەکرێ!

چ خەسڵەتێکی نامۆیە، چ ئەتکێکە بە کولتوور و کەونارای گەلی کورد دەکرێ!

ئەو بازرگانانەی کڕینو فرۆشتن بە مرۆڤەوە دەکەن، هەرگیز چاوەڕێ ناکرێ ببنە عەلەمداری ئازادی و دادپەروەری!

لە حیزبە قۆنتەراتچی و سەرمایەدارەكان تكا دەكەم، نەزیفی ئەو سووكایەتییە ڕاگرن بە مرۆڤی كوردی دەكەن!

لەجیاتی ئەوەی بێن مرۆڤی كورد فێری ئەلفوبێی خۆشەویستیی نیشتیمان بكەن، بە خاكەوە گرێی بدەن، بێشەرمانە فێری سواڵ و فێری سەبەتەی نانی چاوشۆڕیی دەكەن!

لێتان دەپاڕێمەوە... چیدی تاكی سادەو نەخوێندەوار، مەكەن بە پەشتەمار، بۆ داپۆشینی عەورەتی خەڵكی مەلعوون و ستەمكار!

ئەو دكرەساتەی سی ساڵە دەسەڵاتداری نەزان و خۆسەپێن، بەو گەلە مەزڵوومەی دەكا، نە ڕەشەبا بە دەواری شڕی دەكا، نە دوژمن باشاریان دەكا! ئەی ئەوانەی سەركوێرانەو بێشەرمانە، لەبەر لێزمەی ڕێژنەدرۆ وەك مریشك لەسەر هێلكەی پیسو بۆگەن كڕیان خستوون، لە پاداشتی ئەو هەموو خوێن و فرمێسكە، ئازادییان قەمتەر كردوون، ئاوازی هەڵفڕینیان لێ زەوتكردوون!

ماكی نیگەڕانیەكانم، قووڵترین نائومێدیەكانم، داماڵینی مرۆڤی كوردە لە بەها جوانەكانی مرۆڤبوون. وەرن با پێكەوە یەكپێ هەستین، مرۆڤبوون بكەین بە چەق، بیكەین بە میحوەر بۆ ژیان! پێیان بڵێین: ئیدی بەسە! مەمانكەنە دەسكی تەوری بڕینەوەی قەدی خۆمان!

## مرۆڤە بێسەرەکان

وردبوونەوە لە حەشیمەتێکی بێئامانج و بێڕوئیا و تێکقژقژانێکی بێبەرنامە.

کە ئێواران لەو بازارە بێرەحمەی باشوور دەڕوانم، کەسی دووڕوو و چرووکی ئەوتۆ دەبینم، لە ناسینی پەشیمانم! سەرنج دەدەمە چواردەورم، لە سێبەری خۆم بەشک و بە گومانم! مافی ئەوەم نییە خۆم بم، غەوارەم لە نیشتیمانم! ئەو حەشاماتەی ڕۆژانە دەیبینم، زۆربەیان بێسەر دەگەڕێن، هەیە بەدوای نانێکدا وێڵە! هەموویان تێکدەقژقژێن، هێندێک دەڕۆن، هێندێکیان دێن، هەندێک سفووری نیوەڕووت، چەند شەروارکورتی بە ڕدێن!

ئەو خەڵکە هەر کێشەوەی دەکات، دەڵێی مێشی کوورەی هەنگە، هەیە سەری خۆی هەڵدەگرێ، لە داخی مافیاکانی کوٚرد نیشتیمانی خۆی جێ دێڵێ و مەملەکەتی خۆی پێ تەنگە. هەرکەس پەڕپوتو ناکەسە، نانی ئەو خەڵکەی لە چەنگە، زۆر پیاوی مەردیش دەستتەنگە! هەندێکیان ساڵەهای ساڵە، عەودالی دوای دادپەروەری و دیموکراسین، لێیان بۆتە دیدارحەسرەت، ڕۆژانە خۆی دەخواتەوەو، لەگەڵ دارو بەرد لە جەنگە! هەیە مەستی پارەو پۆستەو، مربووی نێو ڕەوسە دۆلارەو، پێش دەرگای پڕ لە دەبەنگە. هەرکەس ڕەوشت و ویژدان و کۆ بەهاکانی لە دەستدا، بەرپرسێکی بێنەزیر و زۆر گرنگە! لەبۆ مانەوەی دەسەڵات، سەنتەر و پایەو پارسەنگە! زۆربەی قەوارەو حیزبەکان، کەوتوونە بەر لێزمەی گومان، بۆیە بایکۆت دەریایەکی یەجگار قووڵ و کپ و مەنگە. هاواری ئەو حەشیمەتە، فریادێکی زۆر بێدەنگە! لە داخی ئەو دەستپیسانەی، نیشتیمانیان لە دەریای سووکایەتی و بێمروەتی هەڵبژاردندا نغرۆکرد، بایکۆت لێرە

لەشکرێکی بێ جەنراڵ و بێ تفەنگە! ئاپۆڕایەکی ناڕازیی بێڕێکخستن، پەرتوبڵاو، بێسەرپەرشت و پێشەنگە! بێ پۆستەر و، بێڕێکلام و، بێ لۆگۆ و، بێ ئاڵاو بێڕەنگە! لە تنوکی تاریکی ئەو شەوەزەنگە، ئای لە کوێیە ئەو هونەرمەندە چەلەنگە!؟ بێت کۆمەڵگا بەردەشۆر کات، لەوەی نەنگە، لەوەی لەنگە، بۆمان یەکخا ئەو تابلۆیە هەمەڕەنگە! دنیا گەواهیمان بۆ بدات، کوردستان دەدرەوشێتەوەو، خاوەن مرۆڤی دەستپاک و چاپووک و چەلەنگە!

## کۆپیی بەعس

ئەو چالاکوانەی بادینان دوو پەنجەیان شکاندبوو لە ئاسایشی پارتی.

فوغان بۆ ئومێدە هەڵوەرێندراوەکان...

کاتێک بەیانی هەڵدەستم، لە حەژمەتی ژان و مەراقی سفتاحێکی زۆر لە دوێنێ بە ئازارتر، دەرگای ماڵێ دەکەمەوە. خەمەکانمان ئەوەندە قورس و سەنگینن بەربا نادرێن، مەگەر فڕێیان بدەینە قووڵایی گۆمەکانەوە.

دەلاقەکم بۆ نەماوە هەناسەکی سارد و سڕی لێ هەڵکێشم. کە بە چاوی خۆم دەبینم ئەتوارتان چەند شەرماوەرە، من خەجاڵەتی دەکێشم! پایز با زەحمەت نەکێشی، ئێمە خۆمان وەکو قابیل یەکتری هەڵدەوەرێنین. هاوین گڕت خەرج مەکە! گەورەکانمان نامەی بەختی هەر هەمووومان دەسووتێنن! زستان سایەقەت کۆکەوە، سەرانی ئەو مەملەکەتە داهێنەری بەستەڵەکی نەزانینن، ژەهری ئیفلیجی پەروەردە دەپرژێنن.

هەر کەس فێری کڕنۆش نەبێت، یان تۆمەتی بۆ دەتاشن، یان بۆ

چارەنووسێکی نادیار دەیڕەتێن. لە دەرەوەی حاشییەتان پەنجەکانی هەر نووسەرێک، چاوشۆڕی دەرگاتان نەبێ و ناپاکی ئێوە بژمێرێ، یەک یەک و دوو دوو دەشکێنن.

کاتێک لە فکرانڕادەچم، ئەو هەموو خوێن و فرمێسک و کۆڕی شینە بەربا درا، لەسەر دڵم بۆتە مەراق. خەونە ڕەنگاڵەییەکانم، لە فەلاقەو لە داربەستە ئەمنیەکانی نەوەی خێڵ شەتەک دراون، ڕۆژ نییە بە بەرچاومەوە نەدرێنە بەر قامچی و شەللاق!

ولاتێکتان بە سەرخان و ژێرخانەوە بە سەریەکەوە هەڕاج کرد، دەنگمان نەکرد. لەسەر قەڵەمڕەوی شاخێک، گەنجی کوردتان قرچوبڕ کرد، دەنگمان نەکرد. بەزیندوویی سەیرانگاو هاوینەهەوارەکانتان داگیرکرد، دەنگمان نەکرد، بە مردووییش هەریەک گردێک داگیر دەکەن، دەنگمان نەکرد! دوژمنی بابەکوشتەی کوردتان، ئەوانەی بە خوێنمان تینوون بێرە فێرکرد، دەنگمان نەکرد. لێرە بەس مردن هەرزانە، باج و خەراج هەموو شتێکتان گران کرد، دەنگمان نەکرد. دادگاو دادوەر و یاساتان هەموو لچەو دەستەمۆ کرد، دەنگمان نەکرد.

چیتان نەکرد؟ چیتان نەبرد، پیرۆزییەکانتان ئەتککرد، کەرامەتی مرۆڤی کوردتان کەوڵکرد، بەو حاڵەش هەر دەنگمان نەکرد! ئەرێ ئێوە لە باوکتان نەبیستووە چی ڕوودەدات!؟ کاتێک پشیلەت تەنگاوکرد! من دڵنیام ئەمجارەش بەهار دێتەوە، بەستەڵەک دەتاوێتەوە، گژوگیا دەڕوێتەوە، ئاگری خەرمانی کوردان دەکوژێتەوە، ناوی ئێوە لە مانشێتی ڕۆژنامەکان دەسڕێتەوە، ئەو مێژووە شەرمەزارە بە سەرتاندا دەڕشێتەوە!

## هەڕاجکردنی نیشتمان

ڕادەستکردنی سامان و خاکی کوردستان، بە دوژمنی بابەکوشتەی کوردان ئەردۆگانی فاشیست.

هەمووومان لە یادمانە بە پاساوی ئابووری سەربەخۆ، لە تەسلیمبوونێکی ٥٠ ساڵەدا، لەلایەن هەرزەیەکی سیاسی و تاجیرێکی دەستپیس و کۆڵەوارێکی ئابووری، بەناوی (ڕێککەوتن) بێئەوەی کەسی سێیەم نێوەرۆکی ئەو دزی و پاشدزییە بزانێت، نەوت و دارو بەردی ئەو مەملەکەتە، لە قەبەر دووژمنی تینووی خوێنی کوردان، ئۆردۆگان کرا. لەو ڕۆژەوە، سفرەی هەموو ماڵە کوردێک سەراوژێر کرا، موچە بڕا، حاڵو گوزەرانی پێشمەرگەو هاوڵاتی شێوێندرا.

لە سەنگەرەکانی ڕووبەڕووبونەوەی لەشکری ئیسلامی لە عیراق و شام (داعش)، پێشمەرگەیەکی خێزاندار کە منداڵی شیرەخۆرەی هەبووە، بە شیری قودوو منداڵەکەی بەخێوکردووە، فیشەکی بەرەکانی شەڕیش هەر بەخۆی کڕیوویە، لەوکاتەی داعش هێرش دەکەن، ئەویش تەبای هاوڕێکانی، دەستڕێژێک دەکات. کاتێک لەگەڵ هاوڕێکانی دێنەوە شوێنی حەوانەوە، تەماشای مەخزەنی فیشەکەکانی دەکات، بۆ ئەوەی بزانێ چەند فیشەکی تەقاندووە، لەناکاو شەپێک لە ڕانی خۆی ڕادەکێشێ و دەڵێ: پەککوووو! هەر بەلاش لەو گۆڕەی دوو قۆدی شیری منالەکەمم هاوێشت!

ئاخر ئەو هەموو فیشەک و چەکە پێشکەوتووەی، لە سەروپێخانەکەی هەولێر و، دەستڕێژی دۆشکە لە ئاسایشی سلێمانی لەسەر کچی بەرپرسێک و، ئەو هەموو هێزو جبەخانەیەی ناردووتانە سەر گەرێلاکان، ناچارکردنی گەنجی کورد بۆ سیخوڕی میتی تورک، بۆ لە پارێزگاریکردنی خدر جیجە و شەناغە و سەرگەڕان و لهێبان و

کولەجۆو عەلیسەرای کاکەییەکان بە خەرج نادەن!؟

تاکەی کوڕە شەللاتیەکانی بەرپرسان، لە یانە شەوانەکان و قەحپەخانەکان، شاباشی دۆلاربارانی بەسەر کچە لەشفرۆشە مۆدێلەکاندا هەڵدەن و بەرپێیان سەوز بکەن لە دۆلاری حەرام!؟ کوڕی هەزارانیش لەنێو سەنگەرەکان، بەرپێیان سوور سوور هەڵگەڕێ لە گۆماوی خوێنی خۆیان!؟

دەکرێ هێزی بەناو پێشمەرگەش بدرێتە کەرتی تایبەت! بیدەنە کۆمپانیای ئەو مستەشار و ئەنفالچیانەی زەمەنی بەعس و لیواکانی ئێستا! ئەوان شارەزان، چونکە لە ڕابردوودا بەر لەوەی ئێوە خانەنشینیان بۆ بکەن، شاخەکان و گردەکانیان بە قۆنتەرات لە بەعس وەردەگرت، بۆ دەرپەڕاندنی ئێمەی پێشمەرگە و ئەنفالکردنی هاوڵاتییان!

هیوادارم مرۆڤی کورد قۆناغی گەوجاندن تێپەڕێنێ! ژیرانە ڕێککەوتنی ژێربەژێری مەلعوونەکان ببینی، کەوا وەک کوورەی مەنجەنیق داگیرکەران بۆیان داخستووین!

## خەون

پێشبینی لە لێواری تەقینەوەیەکدا وەک بۆمبێکی قورمیشکراو!
خەونم دیووە...
سەرەقەڵەمی هەندێک خەونی پچرپچڕ و جرناوفرناتان بۆ دەگێڕمەوە. خەونەکانی شەوی ڕابردوو بە مانشێتی جۆراو جۆر خۆیان لە زەینم هاڵاندووە. ڕۆژی ئەمڕۆ هەرچەند دەکەم، پەرەگرافی خەونەکانم نە لەیادم بەردەبنەوە، نە بۆشم کۆدەکرێنەوە، نە کۆلکەمەلایەکم دەستدەکەوێ تەفسیرم بۆ لێکداتەوە! لەو خەوەمدا، دەستم نابووە بەرچەناگەم، بە سەرسوڕمانەوە دەمڕوانییە شکاندنی ئەو بێدەنگییە وەڕەزو جاڕزکەرە. هەنگامەو ئاپۆڕای حەشیمەتێکی یەکجار زۆر لە منداڵانی گەڕەکێ، گایێکی خوداری زەبەلاحیان لە ئەرزێدابوو، بەرزەفتیان کردبوو، پرزەیان لێبڕیبوو، منداڵان هاواریانکرد: مرد! هەر کەسێ لەولاڕا دەهات بە هەشتاوی درِی بە خەڵکەکە دەدا، پێی لە پشتی پێیان دەنا، بۆ ئەوەی لە مردنی گایەخودارەکە دڵنیا ببنەوە. یەکێک دەیگوت: با وای لێبێت بێستانی ئەو منداڵە بێباوکانەی هەر بە بڕکەوە لووش دەدا! یەکێک دەیگوت: کاغەزو تێنووس و دەفتەر ڕسمی منداڵانی هەر هەموو خوارد! یەکی دیکە دەیگوت: ئاوی کانی بەرماڵانی هەڵقوڕاندووەو ئەوەتا خەڵک تەریفە بووینە لە تینوان! پیرێژنە دوکاندارەکەی گەڕەکێ، کەرتە بلۆکێکی پێداداو گوتی: تەماشاکەن ئەو گێرکەو مێروستانانەی دەچنە زاری و لە کەپووی دێنە دەرەوە، هەریەکەیان دەنکە برێشکەیەک یان گەنمەشامی یان گوڵەبەڕۆژەیەک لە لووتی دێننە دەرەوە، ئەوە هەمووی هی دوکانەکەی منە کە دوێنێ حەپەولوشی کرد! چەند منداڵێک بە بەردەقانی و دارلاستیک، ئەو شێتەیان دابوەپێش خۆ، کە

هـەرڕۆژەی شووشـەبەندی دوکـانێکی دەشـکاند، یـان گۆبەنـدێکی سازدەکرد، ئەویش یەکبەخۆی دەیهاڕاند: هەمووی خەتای دایکم بوو فێری کردم ئەو زەڕو کەتنانە بکەم!

لـەولاوە ڕیزێـک مـەلای پێشنوێژی بێدەستنوێژ، بـە گوریسێک لـە یەکتری جەلە کرابوون. ئـەوەی سـەرنجی ڕاکێشـام هەریـەک مەندیلی ڕەنگێـک بـوو، دیـاربوو دەیـانگوت: ئـەو پێشـنوێژانە سـیپارەو ئایەتەلکورسییان بەراواژوو خوێندۆتەوە و پاشنوێژەکانیان فریوداوە! ئـەو پێشـەنگی و پێشـنوێژیەی لـە سـەریان فـەڕز بـوو بیکـەن، نەیانکردووە!

هەندێک خوێندەواریان هێنان، هەریەکە بارستە فایلێکی نوسینەکانی لەمـەڕ خۆیانیـان دابـووە دەسـتیان، سـەربەرکیان پڕ لـە قەڵـەمی دوو نوک بوو، دیاربوو سـەرەچەنگیان دەدان، گوتیـان: ئەوانە بڕوانامـەیان ساختە کردووە و چاوی مێژوویـان بەستاوە. سور سور دەیـانزانی ئەو مارکێتـە هێلکـەی بێ زەردێنـەو ماسـتی هـەڵبوزڕکاو و چیپس و کێکی ماوەبەسـەرچووی ژەهـراوی تورکی، بـە منداڵی هـەژاران ساغ دەکەنەوە، حەبی گەچیان پێدەفرۆشن، کەچی ئـەوان مۆری ساختەی بۆ لێدەدەن، بەرواری بۆ تەزویر دەکەن!

هەنـدێک ئەفەنـدی ملەسـتووری عـەبا بەشـانیان هێنـان، هەریەکـەیان تـەرازوێکی لاسـەنگی بە دەسـتەوەبوو، هـەر هـەموویان زنجیر لـەپێ، گوتیـان: ئەوانـە دادوەرن، سـوێندی بـە درۆیـان خـواردووە، گوایـا: سـەرۆک لـە بەشـی خـۆی زیـاتر سـاوار و گەنمـەکوتا و دانـدۆک و ترخێنەی بۆ ماڵێ خۆی گل نەداوەتـەوە! گەواهی درۆیـان داوە گوایـە: دەرمـانی سـەرو سمێڵڕەشـکردنەوەو مکیـاجی ژنـی بەرپرسـانی حاشییەی سـەرۆک، هـەمووی بـە پـارەی حـەڵاڵ کڕاوە! دادوەرێکیـان هەر بە تەنها ڕاگرتبوو، گوتیان: ئەوە، لەجیاتی ئەوەی دزەکـان بگرێ،

هـەرچی بولبـول و کـەناری هەیـە لـەنێو قەفـەزی باخەکـەی، هـەر هەمووی زیندانی کردوون!

هەر لەخۆوە ترسم لێ نیشت، ئەمنیش لەخۆم کەوتمە گومان، تۆ بڵێی پێیان زانیبێت!؟ لە کولێرەخانەکەی گەڕەکێ لە جیاتی ٨ کولێرە، ٩ کولێرەم خستبووە کیسەکەمەوە!

کاتێک بەخەبەرهاتم، هـەموو گیانم شـەڵاڵی ئارەقـەی ببـوو، بەدەم چاوهـەڵگڵۆفان و لـەرزینی دەسـتەکانمەوە، دۆلکـەئاوەکـەم بەسـەر زارمەوەکرد، چەندەم ئاوەکە خواردەوە، دووهێندەم بە سینگمداکرد!

## شەقوەشێن

ئەو دیمەنەی هەمووومانی تاساند... کۆیلەیەکی حیزب بە پلە نەقیب، شـەق لـە سـەری خوێندکارێکی زانکۆ هەڵدەدات، بـە تـاوانی ئـەوەی داوای مافێکی سەرەتایی خۆی دەکات.

دەمەوێ بە شیعرێکی شێخی سەعدی دەست پێبکەم، شیعرەکە، بە هـۆی پڕمانـایی و بەرزیـیەکەیەوە، وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمـانی ئینگلیزی و، دەفەرموێ:

ئادەمیزادان ئەعزای یەکترن،
لە دروستبوونا لە یەک گەوهەرن،
ئەگەر ئەندامێ کەوتە بەر ئازار،
ئەندامانی تر دەوەستێن لە کار،
تۆ کە لە دەردی کۆمەڵ بێخەمی،
ناشێ کە ناوت بنێن ئادەمی!

منیش دەڵـێم: فریاکـەون بمانگـەنێ، مـن تـەنها داوای نـان دەکـەم، پاسـەوان و کۆیلـە و چڵکـاوخۆری بەردەرگـای ملهووڕەکـان، ڕاوم

دەنێ، دەست بە قامچی ڕەپێم دەنێ! ساڵەهایە، هەدا نادەم، لە پێناوی ئازادی و نان دەدەم باجم، کاتێک بەیانی هەڵدەستم ئێستاش لە ژێر پێی حەجاجم!

نیوسەدەیە دەمانەوێ، ئازاری ڕەشی بەعسییان، بە ئیسفەنجێک لە دیواری زەینی گەنجان بسڕینەوە، کەچی بەیانی هەڵدەستین، نەوەی خێڵی ئەمنی کوردی، پۆستاڵەکەی عەلی مەجید، سپی سپی دەکەنەوە.

دەریایەک خوێن، کێویک کەللەسەری شەهید، لە خەباتی چینایەتی و نەتەوەیی، بۆ یەکسانی، نزیکەی قەڕنێکی ڕەبەق!

بەیانی کە هەستام بینیم، پۆستاڵی تێر زاری برسی دایتە بەرشەق!

دەستم دامێنتان هەستنەوە، داوەپرچی دەرهێندراوی هەموو کچە خوێندکارەکان کۆکەنەوە،

کەلافە ئاوریشمی قژی ئەو کچۆلە کۆچبەرانەی، بە تەلدڕووی سنورەکانی بەلاڕوس و پۆڵەنداوە بەجێماوە، داو بە داوی، هەر هەموویمان بۆ بێننەوە، بۆ ملی ئەستووری زوڵم، تەنافی لێ بهۆننەوە!

## خۆساغنەکردنەوە

تاوانی حیزبەکانی دەرەوەی پارتی و یەکێتی، لە بابەت پێشەنگینەکردن و خاوەندارینەکردن لە هاوڵاتیانی مافخوراو و ناڕازی...

زۆرمان هاوار کرد، کەمتان گوێلێگرت!

گەر دەتەوێ بزانی بارەگای حیزبەکانی دەرەوەی پارتی و یەکیەتی، بۆ سووتێندران!؟

تکایە ئەو بابەتە بخوێنەوە کە حەوت مانگ و دە ڕۆژ بەر لە ئێستا نووسراوە، وەک ئاوێنە، وێنەی ئێستام نیشان داون.

مامۆستا عەلی باپیر، لە چاوپێکەوتنێکی کەناڵیNRT فەرمووی: دەسەڵات، میللەتی ئاوا بێدەنگی دەست ناکەوێ! چەند ڕۆژێکیش بەر لەو فەرمایشەی بەڕێزیان، سۆران عومەریش گوتی: ئەو میللەتە شایەنی ئەوەیە خراپتری بەسەربێنن!

ئەو نووسینە، لەبەر ئەو دوو بەڕێزە نانووسم و ڕووی دەمم تەنها لەوان نییە. دەمێکە هەست بە هاوارێکی خنکێندراو دەکەم لە ناخی مرۆڤە برسییەکان، بۆیە بە پارتە سیاسیەکانی دەرەوەی پارتی و یەکیەتی واتا گۆڕان و یەکگرتو و کۆمەل و شیوعی و زەحمەتکێشان و چەند حیزبۆچکەیەک ڕادەگەیەنم: ئەوە ئێوەن بوونەتە ڕکەی بەر دیواری دەسەڵات و مانەوەی، ئەگەرنا ئەوان دەمێکە لەبەردەم نارەزایەتیی خەڵک نەتەیان[1] بەرداوە! دەیانەوێ ئەوەی لەو میللەتە بێخودانەیان دزیووە، بچن لە گۆشەیەکی ئارام، لەگەڵ منداڵ و نەوەکانیان بیخۆن، بەرلەوەی خەلکی مافخوراو پێیان لەسەر زگی دابگری وەکو بۆق لە زاریان بیهێنێتەوە دەر، بە ئاشکراکردنی چەند کەیسێکی گەندەڵی دەسەڵات ناگۆڕدرێ، بەڵکو بە پێشەنگایەتی و بە ڕێکخستنی کۆمەڵگا کە ئەرکی ئێوەمانانە، دەگۆڕدرێ.

ئەرێ پێم ناڵێن میللەت سەیرە؟ یان ئێوە بە ئەرکی ئەخلاقی و ویژدانی خۆتان ڕانابن؟ بۆ ئەوەی بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆن پێکبێنن لەئاست چاوەڕوانی ئەو خەڵکە ستەملێکراوە بن کە ئەرکێکی پیرۆزی هەنوکەییە.

ئێوە دەزانن لە ساڵی ٢٠١٧ کاتێک لە پشتدەرو بیتوێن خۆپیشاندانی بێپێشەنگ کرا، خەڵکی نارازی بارەگای لق و مەڵبەندیان سووتاند، بە هۆکاری گەندەڵی و کپکردنی ئازادی. بەڵام لە خۆتان نەپرسی:

---

١- نەتە: ورە، ئیرادە، نەترە.

بارەگـای گـۆڕان و یـەكگرتوو كتابخانـەی حزبـی شـوعی و چەنـد شـــوێنێكی دیـــكە لەســـەر بێئیرادەیـــی و بێجورئـــەتی و سەرپەرشتینەكردنی میللەت سوتێندران!

لـە هـەموو دنیـا ئۆپۆزسـیۆن ڕووداو دەئـافرێنێ بـۆ ئـەوەی خـەڵك بێنێتـــە ســـەر شـــەقام. بەڵام لـــەو مەملەكەتـــە ئـــەتككراوەی ئێمە، بە پێچەوانەوە ڕووداوی زۆر گرنگ ڕودەدەن، كەچی لەلای ئەو حزبە عاجباتیانەی بەناو ئۆپۆزسیۆن، نە بـای دێت و نـە بـاران! ئینجا لەسەر ئەوحاڵەش، چاوەڕوانن میللەت فەرمووی دەسەڵاتیان لێبكات!

شاعیر دەڵێ:

**ئیش بەبێ زەحمەت مەحاڵە بوونی**

**پیاو ماسی بگرێ تەڕدەبێ قونی!**

هــەر ئۆپۆزســیۆنێك دروســت بێــت، بـاجی تەسـلیمبوونی گـۆڕان و دەست بە كڵاووەگرتنی ئێوە دەدات! من وەكو پێشمەرگەیەكی دێرینـی گەلەكـەم، لـە پـایزی تەمەنمـدا ئۆبـاڵی هـەر ڕووداوێكـی نـەخوازراو و پشـێوی، چەنـد دەكەوێتـە ئەسـتۆی گەنـدەڵكاران، هێنـدەش دەكەوێتـە ئەستۆی شۆڕی ئێوەوە! من لە ڕوانگـەی هەستكردنم بەو مەترسییە، ئەگـەر ڕوو بـدات، دڵنیـام بارەگـاو بەرژەوەنـدی ئێـوەش سـەلامەت دەرناچێ! پێشنیار دەكەم ئەو پارتانەی ناتوانن، ئەو ئەركە پیرۆزە كە خـۆی لـە پێشـەنگایەتی میللەتـدا دەبینێتـەوە، دوور لـە تونـدوتیژی و خراپەكاری بـەجێ بگـەیین، لەوڕۆ زووتـر نییە خۆتـان حـەل بكـەن و دەست لەیەخەی میللەت بەردەن!

## ئەزموون

خوێنەری قەدر گران!

مرۆڤی ژیر و ئاقڵ، دەبێ پەند و وانە لە ڕابردووی خەڵکانی پێش خۆی ببینێ بۆ ئەوەی هەڵەکانیان دووبارە نەکاتەوە. ئەو چەند خاڵەی نووسیومن، مەرج نیە هەمووی لە خودی خۆمدا بەرجەستە بووبن، وە یا هەر هەموویان تەنها من نووسیبمن، ڕەنگە تاکوتەرا لە ئاکامی خوێندنەوەو بەرگوێکەوتن و وتەی خەڵکی زانای تێکەوتبێت، وە یا دووبارەبن و بە وتەی خەڵکی دیکە بچن. مەبەست لە نووسینیان، تەنها ئامانجمە ئێوە وەک من لەسەر سەت پەنگر هەڵنەکزێن و دەستتان نەسووتێ، چونکە من گاشەبەردی گەورە گەورەم هاتۆتە سەرڕێ و نەدیتە لێیان هەڵنگوتووم و، لەپڕ سەرانگرێی نێو کەندو زەندۆڵان بووم، خۆم تەکاندووە و هەستاومەتەوە. ئێستاش لە کاتێکدا ماشەری هەودای تەمەنم وا هەڵدەکرێ، بۆ ئۆغر زۆرم نەماوە، لە ئێوارەی تەمەنمدا زەردەپەڕەو، بەرەو ئاوابوون ڕادەخوشێ. ئاخر ناکرێ مرۆڤێک کە ٦٧ ساڵی تەمەنی لە نیوەی دووەمی چەرخی بیست و سەرەتای سەدەی بیستویەک، بەسەربردبێت، هەگبەکەی پڕنەبێ لە کەوتنو هەستانەوە هەڵەوپەڵەو ئەزموون و وانە، نەخاسمە لەو سەردەمە پڕ لە شەڕوشۆڕو بگرەوبەردەو کێشمەکێش، بە تایبەتی ئەگەر ئەو مرۆڤە خۆی لە سیاسەت هەڵقورتاندبێ و قەرە بە قەرەی کوردایەتی هەنگاوی هەڵێنابێت و ئاوارە بووبێت، تێکەڵاوی دابونەریتی پارچەکانی دیکەی کوردستان بووبێت.

بریا، ئەو وانە و ئەزموونەی لە ڕەوتی ژیانم هەڵموێزنیووە، کراسێک بوایە و لەبەرخۆمم دادەکەند و لەبەر منداڵەکانم و هاوتەمەنەکانیانم دەکرد. بریا، ژیان وەک یاری گۆڵێن دوو گێم بوایە،

بۆ ئەوەی لە یەکەمیان ئەزموون کۆکەیتەوە و لە دووەمیان بەرچاوت ڕوون بێت بۆ ئەوەی بە بەرنامە و بە کامی دڵ بژی، بەڵام داری بریا بەر ناگرێ!

تکایە ...

١. پاکو خاوێنی خۆت بکە، پاکو خاوێنی ژینگە بپارێزە.
٢. ددانەکانت بپارێزە و خزمەتیان بکە، لە پیریدا بە کەڵکت دێن.
٣. شەوان زوو بخەوە و بەیانیان زوو هەستە.
٤. بە ئاوی زۆر گەرم خۆت مەشۆ تەمەنت کورت دەکات.
٥. خواردنی خۆماڵی و کوردەواری بخۆ، لە درووستکراو خۆت دوور بگرە.
٦. کات بە فیڕۆ مەدەو ڕێزی بگرە.
٧. خواردن زۆر بجوو و بیهاڕە، یارمەتی گەدەت دەدات بۆ هەرس.
٨. گۆرەویەکانت بە دەستی خۆت بشۆ.
٩. لە هەر شوێنێک نیشتەجێ بووی، درەخت بروێنە مەڵێ لێرە دەڕۆم.
١٠. هەموو ڕۆژێک ڕووداوەکان یاداشت بکە با لە یادی نەکەی.
١١. سەیری چاوی ئەو کەسە بکە کە قسەت بۆ دەکات.
١٢. گەر منداڵەکەت سزادا هەوڵدە تێیگەیەنە لەسەر چیە.
١٣. جلوبەرگی گەشتکردنت با جیاواز بێت لە جلوبەرگی ڕۆژانە.
١٤. پیادەڕۆیی و وەرزش بکە.
١٥. بەبێ هۆکار یان بە قسەی خۆت پێمەکەنە.
١٦. مەرج نیە نووسەر بیت بەڵام مەرجە خوێنەرێکی باش بیت
١٧. ماددەی هۆشبەر و جگەرە مەکێشە کەسایەتی و تەندروستیت وێران دەکەن.

١٨. قومار مەکە ئێستا و ئایندەت دەسووتێنێ.

١٩. ڕێز لە کەسانی گەورەت بگرە، دەنگیان بەسەردا بەرزمەکەوە، پێشیان مەکەوە، لەبەریان هەستە.

٢٠. منداڵی کەس مەگرێینە لە پێناوی منداڵی خۆت پێبکەنێ.

٢١. درۆ مەکە مەگەر بۆ پاراستنی گیانی خۆت یان مرۆڤێکی دیکە نەبێت.

٢٢. بە گۆرانی و هەڵبەستێک مەڵێ خۆشە تاوەکو تێی نەگەی چی دەڵێ.

٢٣. ئاگرێک مەکەوە نەتوانی بیکوژێنیەوە.

٢٤. ئەگەر مەلەوانێکی لە زەبر نیت، مەچووە قووڵایی ئاو، گرنگە مەلەوانی فێر بیت.

٢٥. بۆ خوێندن و فێربوون هیچکات درەنگ نیە.

٢٦. لە توانستە داراییەکانت کەمتر و زیاتر خەرج مەکە.

٢٧. تەنها یەکجار ڕێگە بدە پارەی چایەکەت بۆ بدەن جاری دووەم تۆ پارەکە بدە.

٢٨. وەڵامی هیچ پرسیارێک مەدەوە تا بە وردی لە پرسیارەکە تێنەگەی.

٢٩. پەرە بە توانستەکانت بدە، ئەوەی دژایەتیت دەکات بە ناچاری دەبێتە شاگردت.

٣٠. هەمیشە بەر لە چەند خولەکێک لەو کاتەی دیاریت کردووە چاوت بە یەکێک بکەوێ لە شوێنێک کە هەرێت پێداوە، ئامادەبە بۆ بینینی.

٣١. گەر دەتەوێت منداڵەکەت درۆزن دەرنەچێت درۆی لەگەڵ مەکە.

٣٢. وەڵامی سڵاوی هەرکەست دایەوە ناوی بێنە.

٣٣. ئەهلی دین و سیاسەت لەیەکتر جیا بکەوە.
٣٤. ئەگەر ویستت ئامۆژگاری کەسێک بکەی با بە تەنها بێت.
٣٥. ئەزمونەکانت بنووسە با لە دوای خۆت سوودی لێ ببینن و ڕۆحیانەتت شاد دەکات.
٣٦. لەو کاتەی هاوسەر دیاری دەکەی هەوڵدە پێکهاتەی خێزانی لە خۆت نزیک بێت.
٣٧. بە دوای شتی لاوەکی مەکەوە و دەستبەرداری ئامانجە سەرەکیەکە بیت.
٣٨. دووری لەو کەسانە بکە شتێکیان پێ نەماوە بۆ لەدەست دان
٣٩. ئەگەر نزیکەکانت نەتشکێنن بە کەس ناشکێی.
٤٠. بۆ ئەوەی لە دەرەوە سەرکەوتوو بیت لەماڵەوە یەککگرتووبە
٤١. ئەگەر هەموویت دەست نەکەوت، دەستبەرداری هەمووشی مەبە.
٤٢. سووکایەتی بە هیچ ئاینێک مەکەو گەمژانەش پەیڕەوەی لێ مەکە.
٤٣. لە سەر مافەکانت بێدەنگ مەبە و ئەرکەکانت پشتگوێ مەخە.
٤٤. هەر ڕووداوێکی ناخۆش دووچاری بووی، سەرەتا زۆر گەورەیە و دووایی بچووک دەبێتەوە.
٤٥. لە بەڵێنەکەت خاوەنداری بکە، کەسایەتیت بەهێزدەکات.
٤٦. پێت بە پێڵاوەوە لە پێش کەس دامەنێ پێڵاوت بۆ بۆیاخ بکات
٤٧. لە پێناوی مشتێک پارە یان پلەو پۆست قوربانی بە ئابڕوو و کەسایەتیت مەدە.
٤٨. ئەگەر تێکشکای و کەوتی، باوەڕت بە توانای خۆت بیت بۆ هەستانەوە چاوەڕێی بەهێزێک مەکە هەڵتبستێنێتەوە.
٤٩. داننان بە هەڵەکەت بەرامبەرەکەت هێور دەکاتەوە.

٥٠. لەو شێخانە نزیک مەبە کە بە خوێنی هەژاران دەستنوێژ دەشۆن.

٥١. بڕیاری بەپەلە و عەجولانە مەدە بەرلەوەی پەشیمان ببیتەوە

٥٢. تا دەتوانی نهێنی خەڵک بپارێزە و کەموکوڕییان بۆ داپۆشە.

٥٣. بە ئەقڵ و ویژدانی خۆت بکە، بۆی هەیە زۆرینە هەڵە بێت.

٥٤. هیچ کارێک بۆ بەیانی دوامەخە، بۆی هەیە بەیانی کاری دیکەت بۆ پەیدابێت.

٥٥. ئەو شادی و خۆشگوزەرانیەی لە گێلیدا هەیە، لە وشیاری نایەتەڕێت.

٥٦. گەشتەکەت گەر ژنی تێدابوو، لەو کاتەی بە نیازی جووڵەی، ٦ کاتژمێر زووتر بۆ ژنەکان دیاری بکە، ئەو کات ڕەنگە زۆرت دوا نەخەن.

٥٧. هەمیشە تایبەتمەندییە باشەکانی منداڵەکەت بخەڕوو بۆ ئەوەی هەوڵی باشترین بدات.

٥٨. هەڵەکانی ژیانت بێنەوە پێش چاوت بۆ ئەوەی دووبارەیان نەکەیتەوە.

٥٩. خۆشباوەڕ و ساویلکە مەبە وابزانی هاوڕێکانت تا دوایی لەگەڵت بمێننەوە و پشتت تێناکەن.

٦٠. گەر لێبوردنێک قەرزار بووی، هەوڵ مەدە بە گلەییەکی بێبنەما خۆت دەرباز بکەی.

٦١. دەڵێن ئەوەی چەند زمان بزانێ ئەوەندە کەسەیە، من دەڵێم چەند کەسی باش هاوڕێت بێت تۆ ئەوەندە کەسەی.

٦٢. کەم بدوێ زیاتر گوێ بگرە.

٦٣. هەرشتێکت کڕی بۆ نمونە جووتە گۆرەویەک، گەر بایی پارەکەی لەبەرنەکەی و کەڵکی لێوەرنەگریت واتا گێلیت کردووە.

٦٤. ڕیزگرتن لە بودەڵە و دەستوداوێن پیسەکان بێڕێزییە بە خەڵکی پاکڕەوشت.

٦٥. زانیت هەر کەسێک خۆی پێ لە تۆ گەورەترە تێیبگەیەنە منیش لە تۆ بچوکتر نیم.

٦٦. بزانە قەرز دەدەیت بە کێ بۆ ئەوەی بەرلەوەی پێی بڵێی، بۆت بگەڕێنێتەوە.

٦٧. گەر خانووت کڕی بزانە دەبیە جیرانی کێ.

٦٨. تاوەکو کارێکی چاکتر نەدۆزیەوە کاری پێشووت بەجێ مەهێڵە.

٦٩. گەر پێت ناخۆشە بێڕێزیت پێ بکرێ، بەڕێزەوە هەڵسوکەوت بکە.

٧٠. باسی چاکەی خەڵک بکە بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە چاوی لێبکەن.

٧١. گەر شتێکت لە یەکێک وەرگرت هەوڵبدە بەرلەوەی داوای بکاتەوە بۆی بگەڕێنەوە.

٧٢. قسە بۆ یەکێک بکە گوێت بۆ بگرێ.

٧٣. گفتوگۆ لەسەر شتێک مەکە کە بەرامبەرەکەت نیەتی .

٧٤. لەسەر شتێکی کەم لەگەڵ ناسیاوەکەت تێکی مەدە، ڕەنگە ڕۆژێک فریات بکەوێ هەرگیز بیرت لێ نەکردۆتەوە.

٧٥. کاتێک لە سەر هۆشی، مەهێڵە کەس لە جیاتی تۆ بڕیارت بۆ بدات.

٧٦. هەتا زیندووی، بێهیوا و ئامانج مەژی.

٧٧. ئەگەر کێشەت لە گەڵ یەکێک هەبوو خۆت بخەرە شوێنی، ئەوکات بڕیار بدە.

٧٨. زۆر ڕەزیلی و دەست پێوەگرتن زیانی زیاترت پێدەگەیەنی.

هەروەک لە کوردەواری دەڵێن: ڕەزیل هەمیشە نانێکی زیاتری دەڕوات!

٧٩. داکۆکی لەسەر هەڵەکانت بەرامبەرەکەت زیاتر تووڕە دەکات، دانپێدانان ئارامی دەکاتەوە.

٨٠. نە چاکە لە یاد بکە و نە خراپەش.

٨١. هەوڵبدە ببیە جێگای متمانەی خەڵک بە هەر نرخێک بێت.

٨٢. کاتێک بۆ خەوتن ڕاکشای کارە باشو خراپەکانی ئەو ڕۆژەت بژمێرە و ڕاڤە بکە.

٨٣. شەوان ئەو کارانەی یەکەمینەکانن بۆ بەیانی دەستنیشانیان بکە

٨٤. هەر کەسێکت بینی زوو مەبە برادەری کە بووی بە برادەری هەر کەسێک لەسەر شتی بچووک لەگەڵی تێک مەدە.

٨٥. ساویلکە مەبە، خۆت ڕادەستی دوکاندار مەکە کاڵایەکی باشت بداتێ، چونکە ئەوە بۆی نافرۆشێ بە تۆی ساغ دەکاتەوە.

٨٦. بۆ ئەوەی خزمێکت یان دۆستێکت لە دەست نەدەی، هاوبەشی بازرگانی لەگەڵ مەکە.

٨٧. بە ماندووبوون حەسانەوە بەدەست دەهێنی.

٨٨. هەتا دەتوانی گەشت بکە، چاوی مرۆڤ دەکاتەوە دەزانێ لەودیووی کێوەکان چی دەگوزەرێ.

٨٩. دایک یان باوک کاتێک منداڵەکەی سزادا ئەوەی دیکە لەبەرچاوی منداڵەکە داکۆکی لێ نەکات باشە.

٩٠. لە گەرمەی هەندێک پێشهاتدا ئەقڵ و فکر حوکم ناکا هەوڵدە خۆت بەرزەفت بکەی.

٩١. خاک و نیشتمانی خۆت خۆشبوێ و گرێدراوی زێدی خۆتبە.

٩٢. تۆ تەنها بۆ خواردن و ڕیتن لەسەر ئەو خاکە ناژی، بەڵکو ئەرکت لەسەرشانە.

٩٣. کاتێک هەڵسەنگاندن بۆ مرۆڤێک دەکەی گەر تەنها ترسنۆکە تۆمەتی دیکەی مەدە پاڵ.

٩٤. بازرگانی و هاوبەشی لەگەڵ کەسێکی لە خۆت بەهێزتر مەکە کە نەتوانی مافی خۆتی لێوەرگری.

٩٥. هەوڵبدە هاوڕێکانت یەکتریان خۆشبوێت.

٩٦. گەر بە هیچ شتێک تووڕە نەبووی گومان لە بوێریت بکە.

٩٧. ئەگەر هیچ نادادی و زوڵمێک لە ناخەوە ڕۆحی ئازار نەدایت گومان لە مرۆڤبوونت بکە.

٩٨. گەر لە گەڵ ئازاری خەڵک فرمێسکت دانەباری، گومان لە سۆز و بەزەییت بکە.

٩٩. ڕێز لە ئاو بگرە و لە پێویستی خۆت زیاتر ئاو بە فیڕۆ مەدە .

١٠٠. تۆ بۆ ئەوە لە ژیانداى جیهانی خۆت و خەڵکانی دیکەش ڕووناک بکەیتەوە.

١٠١. تاوەکو دایک و باوکت لە ژیاندا ماون دڵیان مەشکێنە کە مردن کێلیان بۆ مەڕازێنەوە.

١٠٢. هەمیشە لە دژی دەسەڵاتداران بە ئەگەر لە بەرژەوەندی خەڵکی هەژاردا نەبوون.

١٠٣. دەوڵەمەندیو پارەی زۆر مایەی خۆشبەختی نییە.

١٠٤. سەنعەتێک بزانە، لەوپەڕی دنیا وەک بازیبەندی زێڕ فریات دەکەوێ.

١٠٥. گەر لە پێداویستیت زیادبوو هەندێک پارە پاشەکەوت بکە.

١٠٦. ئەو پێڵاووجلوبەرگو شتانەی بەکارییان ناهێنی بیدە بەو کەسەی بەکاریان دێنێ.

١٠٧. دیاری بۆ کەسانی خۆشەویستت پێشکەش بکە.

١٠٨. دەستی هاوکاری هیچ کەس مەگێڕەوە.

١٠٩. کەلوپەلی هەرزان مەکڕە کارەکەت ڕاهی ناکات.

١١٠. پێشوەختە پارەی کرێکار مەدە، تاوەکو کارەکەی تەواو دەکات.

١١١. خۆت بە کەس بەراورد مەکە ڕەنگە بەرامبەرەکەت زۆر ناڕۆشنبیر بێت.

١١٢. دوورکەوە لەوانەی پارەیان لە ئابڕوو لا گرنگترە، چونکە هەموو بێئابڕوییەک لەپێناو پارەدا دەکات.

١١٣. ئەوەی ئازادی لا گرنگ بێت ناتوانێ بە کۆیلەیی ڕازی بێت.

١١٤. چەند دنیا بەڕووتدا دڵڕەق بوو نەکەی بشکێی.

١١٥. خاڵی لاوازی خۆت بۆ کەس دەرمەخە.

١١٦. مرۆڤ بە هەموو کەس دەوێرێ تەنها بە منداڵی خۆی نەبێت.

١١٧. خۆ لە خەڵک بە گەورەترزانین نیشانەی قەزەمیو گرگنیی کەسایەتیە.

١١٨. بەرلەوەی دەست بە هەر کارێک بکەی ئەو ئامێرانەی پێویستن بۆ ئەوکارە ئامادەبکە.

١١٩. خۆشیو شیرینی ژیان قوتدانی ئاسانە، مرۆڤی ڕاستەقینە ئەوەیە تاڵیەکان قوتبدات.

١٢٠. گەر خۆت بەدەستهێنا واتا دنیات بەدەست هێنا، گەر خۆت دۆڕاند واتا هەموو دنیات دۆڕاند.

١٢١. ڕابردوو لە کۆڵی ئاینده شەتەک مەدە.

١٢٢. ئازادی شایەنی ئەو ژنەیە، ئازادی خۆی لە کۆیلەکردنی بەرامبەرەکەیدا نابینێت.

## تێبینی:

خوێنەری بەئاگا و وردبین! دەکرێت پرسیارگەلێکت لەلا دروست بووبێت، وەک: بۆچی وێستگەکانی ژیانی نووسەر، پچرانی تێکەوتووە؟ بۆچی نووسەر لەو هەموو ساڵ پێشمەرگایەتیەی، یاداشتی چەند داستانێکی نەکردووە کە بەشداربووە تێیاندا!؟
چونکە، ساڵی ٢٠٢٠ یەکەم کتێبم بەناوی (٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا)، کە یاداشت و بیرەوەرییەو، لە ٥٠٩ لاپەڕەدا چاپ و بڵاوکراوەتەوە، لەو کتێبەدا زۆربەی داستان و وێستگەکانی ژیانمی تێدا تۆمارکراوە. ئەو کتێبەی لەبەردەستتدایە، تەنها خاپەرۆکی بەجێماوی چەند یاداوەری و یاداشتێک و، چەند هەڵوێستێکە لەمەڕ ڕووداوەکان، کە لە کتێبی یەکەمدا پەرێزپاکژ یاداشت نەکراون و، وەک خاپەرۆک جێماون بۆ ئەم کتێبە.
یان دەکرێ بپرسی: بۆچی زمانی پەخشان بەسەر ئەدەبیاتی ئەم کتێبەدا زۆر و زاڵە؟ هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانم شانیان لە شانی کردوومە ڕککە، دەیانەوی لەسەر سککەی نوسینی زەمەنی خەباتی شاخ و پەڕگری ئایدۆلۆجی و حزبایەتی و سیاسەت بمترازێنن و بمخەنە سەر سککەی نووسینی بابەتی ئەدەبی پەخشانئامێز. دیارە، وەک دەڵێن دۆست ئاوێنەی دۆستە! دیارە زیاتر من لەو گۆشەیە دەبیننەوە. نموونەیەک لەو بەڕێزانە کە زۆرم لێ نزیکەو ڕایەکانی بەلامەوە گرنگن، شاعیر و جوانتووس هاوڕێ (بەکر ئاڵەیی)یە، هەمیشە وەک نارازیبوونیک زۆر جار دەڵێت: "دیسان سیاسەت!" ئەوەیش بە هۆکاری ناشرینکردنی سیاسەتە لە باشوور و دڵسۆزییەکە بۆ من!



حاجی تاهیر هەللاج



گوستان مامۆژنی نووسەر



حاجی سمایل سوراحی



شەهید یاسین حاجی تاهیر



شەهید ئیسماعیل



لە ڕاستەوە: هاوڕێ هەڵکەوت، سشێخ لەتیف و شەهید کەریم



شەهید مام کاوێس



شەهید کانەبی گچکە



دانیشتوەکان لە ڕاستەوە: عەلی چاوسۆر، شەهید هیوا.
وەستاوەکان لە ڕاستەوە: سادق، هەڵکەوت و حازم..



لە ڕاستەوە دایکی نووسەر لەگەڵ هاوسەرکەی..



هاوڕێ عەلی کوتك



نەورۆزی بارزان ١٩٨٤



شەهید عەلی حاجی نادر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەک



نەورۆزی بارزان ١٩٨٤



لە پێشەوە : حازم، کانەبی گەورە، هەڵکەوت تەنیا و چەند پێشمەرگەیەك.

١٩٨٣ زێوکە و ماشکانی رۆژهەڵات



نووسەر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ١٩٨٩



لە ڕاستەوە: هەردی، وریا، حازم و ناسۆ..



نووسەر و هاوسەری و دوو منداڵەکەی (١٩٨٤ بارزان)



فەهد پۆلا (کەرە)



لە ڕاستەوە: ئەبو ئەحرار و حاجی دەهام



لە ڕاستەوە: ئەردەلان و بوڕهان مەخموری



لەپێشەوە: حازم، کانەبی گەورە، ملازم ڕابەر و ئەبو سیروان
١٩٨٦هۆکێ و چواربۆت..



مژده جەنگی..



شوێنەواری قزقاپان چەمی ڕەزان

خاپەرۆک، پاشەرۆک و پاشەبەرە... هەموو ئەو ناوانە، دەکرێ بەکاربێنین بۆ باقیماندە، یان پاشماوەی بەرهەمێکی ساغکراوەی دانەوێڵەی وەک: گەنم، جۆ، برینج، قەزوان، ترش... بۆیە منیش هاتووم ئەو یادەوەریانەی وەک خاپەرۆک لە دوای چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێبی (٥٧ ساڵ خولانەوە لەژێر وەهمی شۆڕشدا ٢٠٢٠) لێم بەجێمابوون، کۆیان بکەمەوە و بە جۆرێک مێشکی خۆم بگووشم و ئەو ڕووداوانەی لە زەینمدا تۆمارن، بیانچۆڕێنمە سەر دووتوێی ئەو کتێبەی لەبەردستت دایە و چۆڕەبڕیان بکەم.

لە دوای ئەوەی دەستم لە بنی جێخونێ گێڕا و ئەسکوێم لە بنی مەنجەڵی زەینم وەردا، هەر ئەوەندەم لێ هەڵکڕاند و ئەو خاپەرۆکەم بە دەستەوە هات، کە بە چاکم زانی ئەویش وەک کتێبی یەکەمم (٥٧ ساڵ)ـەکە، مەجلیسی ئازیزانم ڕۆشن بکاتەوە.





خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا
سلێمانی سەرەتایی شەقامی مەولەوی
فەرعی سەعید تەها کۆیی
٠٧٥٠١١٢٨٣٨٨ - ٠٧٧٠١٥٧٥٠٦٧
Ktebxanai chwarchra


بەرگ: ئیبراهیم سالح